حوجەت مورتەجا

# باڵە سیاسیەکان لە ئێرانی ئەمڕۆدا



وەرگێڕانی : محەمەد کەریم

نووسینی:

**حوجەت مورتەجا**

وەرگێڕانی:

**محەمەد کەریم**

سلێمانی ٢٠٠١

❖ ناوی کتێب: باڵە سیاسیەکان لە ئێرانی ئەمڕۆدا

❖ بابەت: لێکۆڵینەوەی سیاسی

❖ نووسینی: حوجەت مورتەجا

❖ وەرگێڕانی: محەمەد کەریم

❖ چاپی کۆمپیوتەری: ئاسۆ سەعید

❖ هەڵەچنی چاپ: سازان قادر و هەوار شەریف

❖ تیراژ: ٦٠٠ دانە

❖ ژمارەی سپاردن: ٤٥٤ی ٢٠٠٠

❖ کۆمپیوتەرو ئۆفسێتی دەزگای سەردەم

زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم (١٢٣)

# سەرەتا

یەکێك لەو مەسەلە بنەڕەتیانەی کە لە ماوەی چەند ساڵی رابردوودا هەوڵم داوە باسی بکەم، دواکەوتنی ئێمەیە لە بواری زانستە مرۆییەکاندا، تا ئەو شوێنەی کە پەیوەندی بە بوارەکانی مێژوو و زانستی سیاسەتەوە هەیە، ئەم دواکەوتنە لە چەند لایەنێکەوە فراوانتریشە. دواکەوتنی ئێمە لە زانستی سیاسەتدا بەتایبەتی لەو بوارەدا کە پەیوەندی بە تێگەیشتن، شیکردنەوە، روونکردنەوە، دەرك کردن و شیکردنەوەی مەسەلەکانی ئێرانەوە هەیە بەشێوەیەکی دیار خۆی ئاشکرا دەکات. لە زانکۆکانی وڵاتانی خۆرئاوادا بەشێکی بەرچاو لە لێکۆڵینەوەکانیان دەربارەی گۆڕانە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگاکانی خۆیانە. لە ئێران بە پێچەوانەوە، ئێمە هەتا دەربارەی دیاردەیەکی مێژوویی وەکو شۆڕشی ئیسلامیش نەمانتوانیوە چەند لێکۆڵینەوەیەکی وردو بەرچاو بکەین و وەکو جاران، ئیشی خۆرئاواییەکان لەم ماوەیەشدا سەرنج رادەکێشن.

هۆیەکی ئەم دژوارییە ئەوەیە کە بەهۆی لاوازی بنچینەی زانستیەوە، ئێمە بە زۆری لە چوارچێوەی بیری سیاسی و قاڵبی تیوری و تیورکاریدا گیرمان خواردووەو نەمانتوانیوە لەو چوارچێوانە زیاتر بڕۆین. تیورکاریەکانمان وەکو "زانست" و چوارچێوەکانیشمان وەکو "مەنهەجی زانستی" بەڕەها وەرگرتووەو هەوڵمان داوە کە ئاڵ و گۆڕو گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگاکەمان "زانائاسا" شیبکەینەوەو ئاشکرای بکەین. دیارە ئەنجامیش تێکەڵێکی ناتەواو بووە کە نە حەقی بەو تیورەداوەو نە لێکۆڵەرەوەشی وا لێکردووە کە لەو ئاڵ و گۆڕو گۆڕانە مێژوویی یان سیاسی و کۆمەڵایەتیە تێ بگات.

بنچینەی ئیشکردنی ئەم کتێبە جۆرێکە لە هەڵسەنگاندنی سەرەتایی و ناساندنی رەوتە سیاسیەکانی ئێرانی ئەمڕۆ، دەتوانین بڵێین کە بۆ یەکەمجارە لێکۆڵینەوەیەکی ئاوا دەکرێت واتە رەسم کردنی هێزە سیاسیەکانی ئێستا لە مەیدانی سیاسی ئێراندا، گرنگی ئەم کارە کاتێك روونتر دەبێتەوە کە ئەوەمان لەبەرچاو بێ کە لە بنەڕەتدا ژمارەیەك نکوڵی لە دابەشکردنی نەبەردە سیاسیەکان دەکەن بۆ راست و

چەپ لە ئێراندا. لە روانگەی ئەوانەوە دابەشکردن و جیاکردنەوەی باڵەکان بەزۆری لەلایەن ئاژاوەگێڕەکانەوە سۆراخ دەکرێ تا بە دروست کردنی دوبەرەکی، گورز لە نیزام و شۆڕش بسرەوێنن.

یەکەمین پرسیارێ کە دەبێ لێی بکۆڵرێتەوە ئەوەیە کە ئایا دروستبوونی باڵی جیاجیاو سەرهەڵدانی رەوتی جیاواز، رکابەرو دژ بەیەك، مەسەلەیەکی مێژووکردە یان دەشێ گەشەکردنی سیاسی بەدی بێ بەبێ ئەوەی کە گروپی دژ بەیەك لە کۆمەڵدا بێتە ئاراوە. لە وەڵامدا دەبێ بگوترێ کە سەرهەڵدان و دروستبوونی باڵ و گروپە ناکۆك و دژ بەیەکەکان لە رەوتی گەشەکردنی سیاسی و ئابووری کۆمەڵگاکاندا بەشێوەیەکە کە ناتوانین خۆمانی لێ لابدەین و خۆمانی لێ بدزینەوە. ئەوەی کە تا ئێستا رەوتی لەو جۆرە مان نەدیوە، لەبەرئەوەیە کە رێگە نەدراوە سەرهەڵ بدەن. هۆیەکانی ئەم جڵەوگیرییە، یان بەشێوەیەکی وردتر لێکۆڵینەوەی ئەوەی کە بۆچی، حزب، باڵ و پێکهاتە سیاسیەکان هەتا ئێستا لە ئێراندا دروست نەبوون لە چوارچێوەی ئیش کردنی ئەم کتێبەدا نییە. تەنها بەم کورتیە دەبڕینەوە کە هاتنی بیروباوەڕی مۆدێرن بۆ ئێران لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا، زەمینەی بۆ گەشەکردنی سیاسی و ئاڵوگۆڕی باوەڕە سیاسییە کۆنەکان خۆش کرد. لەگەڵ ئەوەشدا بەتێپەڕبوونی زیاتر لەیەك سەدە هێشتا گەشەکردنێکی سیاسی هێندە بەرچاو لە ئێراندا بەدی نەهاتووە.

ئەو بەڵگەیەی کە لە ماوەی ئەو سەدەیەدا هێنراوەتەوە، ئەوەیە کە دیسپۆتیزم رێگری سەرەکی بووە لەبەردەم گەشەکردنی سیاسیدا. بەبێ دودڵی دەسەڵاتی دیسپۆتیزم کۆسپێکی گرنگی لەسەر رێگەی گەشەکردنی سیاسیدا دروست کردووە، بەڵام لە چەند بەشێکی مێژووی هاوچەرخدا کە ئامادەبوونی دیسپۆتیزم کاڵ بۆتەوەو یان لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامیش دیسان دەبینین کە لە بواری گەشەکردنی سیاسیدا دەسکەوتێکی هێندە بەرچاومان نییە. بۆ نموونە، ئەگەر حزبایەتی بەیەکێك لە سیفەتەکانی رەوتی گەشەکردنی سیاسی بزانین، پێشوازی خەڵك لە حزبایەتی و چالاکی رێك و پێك و رێکخراو لە ماوەی بیست ساڵی رابردوودا هێندە بەربڵاو نەبووە. لەبەرئەوە دەبێ ئەنجامگیری ئەوەش بکرێ کە بێجگە لە دیسپۆتیزم چەند هۆی دیکەش هەن کە لە بەردەم گەشەکردنی سیاسیدا بوون بە

کۆسپ. باس و لێکۆڵینەوەی وردی ئەم هۆیانە خۆی لە خۆیدا قەبارەیەکی گەورەکە کە لەم کتێبە گەورەترە. ئەوەی کە دەتوانرێ وەکو فەهرەست بخرێتە بەرچاو ئەوەیە کە دەتوانرێ ئەم هۆیانە بۆ دوو گرووپی مێژوویی و کۆمەڵناسی دابەش بکرێ.

کۆبوونەوەی دەسەلاتی سیاسی و ئابووری لە دەستی حکومەتدا کە لە رووی مێژوویی‌یەوە بووە بەهۆی درێژەکێشانی دەسەلات و فەرمانڕەوایی دیسپۆتیزم لە ئێراندا یان هەمان تیوری "ئیستیبدادی خۆرهەلات" (Oriental Despotim) کە لە لایەن کارل مارکس و ڤیتفوگل و کەسانی دیەوە باس کراوە، بەبێ دوودڵی دەبێ لە گرنگترین هۆکارە مێژووییەکان لە قەڵەم بدرێن. شۆڕشی مەشروتە لە ساڵی (١٢٨٤)ی هیجری هەتاوی (١٩٠٥) زایینی جوڵانەوەیەکی راستەقینە بوو بۆ لە قاڵبدانی دەسەلاتی رەهای حکومەت و پێکهێنانی حوکمی یاسا بەمەبەستی بەدەست هێنانی ئەم ئامانجە مێژوویی‌یە. بەڵام هەروەکو دەزانین مەشروتە بەکردەوە نەیتوانی ببێتە هۆی لە دایك بوونی سیستمێکی دیموکراتی و حوکمی خەڵك.

ئەگەرچی مەشروتە لە دروست کردنی پێکهاتەی مۆدێرنی سیاسی‌دا لە ئێران سەرکەوتوو نەبوو و زۆرداری وەکو خۆی بەردەوام بوو بەڵام ئەو ئاوات و ئارەزووە ئازادیخوازانەیەی کە مەشروتە لەگەڵ خۆیدا هێنای، نەك تەنها لەناو نەچوو بەڵکو پەرەشی سەند. لە رۆژگاری سەرکەوتنی شۆڕشی مەشروتەوە تا سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ساڵی ١٣٥٧-١٩٧٩دا، زۆرداری چەند جارێك ناچار بووە پاشەکشێ بکات. پاشەکشەی زۆرداری و کەمبوونەوەی فشاری سەرکەوت کردن هەر جارەی دەبووە هۆی دروست بوونی کەش و هەوایەکی کراوەی سیاسی. ئازادی قەڵەم و ئازادی چاپەمەنی لەسەر ئاستی کۆمەڵ سەری هەڵ دەداو بەدوای ئەوەشدا حزب و رێکخراوی سیاسی دەکەوتنە سەرپێ.

بەڵام هەم ژمارەی ئەم ماوانە کەم بوو هەم تەمەنیشیان زۆر کورت بوو. لە پاش ماوەیەك، کە قەیرانەکە کۆتایی دەهات حکومەت بەدەسەلاتێکی تەواوەوە تەواوی ئازادییە دەست کەوتووەکانی زەوت دەکردەوە و سەرلەنوێ زۆرداری و سەرکوت کردن دەستی پێ دەکردەوە.

به پێچەوانەی هۆیە مێژووییەکانەوە، زەمینەو هۆیەکانی کۆمەڵناسی، زۆر ئاڵۆز ترن. یەکەمین و گرنگترین هۆ بۆ پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان و پێکهاتەی ئابووری زاڵ بەسەر وڵاتدا دەگەڕێتەوە. لەبەر چەند هۆیەکی مێژوویی هەمیشە لە ئێراندا دەوڵەت سەرپەرشتیاری ئابووری بووە. لەلایەکەوە سەرچاوە سروشتیەکان و ئامێرەکانی بەرهەم هێنان لەژێر دەسەڵاتی حکومەتدا بوون و لەلایەکی دیکەشەوە دەوڵەت و دەزگاکانی سەر بە دەوڵەت گەورەترین خاوەن کار پێک دەهێنن. ئەم دیاردەیە بوو بەهۆی ئەوەی کە چین و توێژە بەرهەم هێنەرە سەربەخۆکان نەتوانن دروست ببن. لە ئەنجامدا، بواری چالاکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بۆ چین و توێژە جیاوازەکان لە چوارچێوەی حزب و ڕێکخراوی سیاسی‌دا نەڕەخسا.

لە ئێران ئەسناف و پیشەوەران، جوتیاران و بازاڕ، سەرەکی ترین چینی کۆمەلایەتی ئابووری سەربەخۆ بوون لە حکومەتدا. بەڵام ئەمانەش هەرگیز مۆڵەتیان پێ نەدرا بۆ ئەوەی سەربەخۆ لە حکومەت دەست بەخۆ ڕێکخستن و خۆسازدان بکەن.

جگە لەم چین و توێژانە، باقی هێزەکانی بەرهەم هێنان سەربەخۆ نەبوون و بەشێوەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ موچە خۆربوون و وابەستە بوون بە دەوڵەتەوە. پیشەسازیی گەورەو بنچینەیی وەکو نەوت و گاز، پترۆکیمیایی، پوڵا، وزە، ئاو، چیمەنتۆ، گواستنەوەو گەیاندن، ئامێر دروست کردن، کانزاکان، ئوتومبیل دروست کردن، بیمە، بانکداری و.. هەموویان موڵکی دەوڵەتن. ئەو پیشەسازییە کەمەش لەلایەن کەرتی تایبەتیەوە لەسەردەمی پەهلەوییەکاندا مۆڵەتی کارکردنی پەیداکرد سەربەخۆ نەبووەو بەکردەوە ملکەچی بڕیارو یاساکانی دەزگا جیاوازو جۆراوجۆرەکانی دەوڵەت بووە.

پێکهاتەی ئابووری و مێژوویی ئێران، بەنۆرەی خۆی بۆتە هۆی ڕەفتاری کۆمەلایەتی و سیفەتی تایبەتی کەلتوری سیاسی. گرنگترین ئەو سیفەتانە، بریتین لە پێشوازی نەکردن لە چالاکی دەستە جەمعی ڕێکخراو و ڕێکخراوەیی، بێ باوەڕی و گوێ نەدان بە حزب، بوونی ڕۆشنبیری سیاسی سەرکەش و خوازراو، حەزکردن بە جوڵانەوەی جەماوەری و ئامادە. ئەم خاڵانە هەندێکن لە هۆیەکانی کۆمەڵناسی پشت کردنە چالاکی ڕێکخراوەیی و بۆتە هۆی ئەوەی کە حزب و ڕێکخراوە سیاسیەکان لە ئێراندا هەمیشە ڕووبەڕووی چەند کێشەیەکی تایبەتی ببنەوە.

گرنگترینی ئەو کێشانە ئەوەیە کە حزب و ڕێکخراوە سیاسیەکان لە ئێراندا هەمیشە بەتاکە کەسەوە ماونەتەوە. لە جیاتی ئەوەی سەرکردایەتی حزب لە ئاستەکانی خوارەوەی حزب هەڵبژێردرێن، بە شێوەیەکی باو چەند کەسایەتیەکی بەدەسەڵات لە سەرەوە سەرکردایەتی حزب دەگرنە دەست. کێشەی ئەم جۆرە حزبانە ئەوەیە کە لە دوای وازهێنانی کەسێتی‌یەکە یان کەسایەتیە بەدەسەڵاتەکان، ئەو حزبە یان ئەو ڕێکخراوە ئیتر بەکردەوە توانای درێژەدانی بە ژیانی خۆی نی‌یەو بەخێرایی هەڵدەوەشێتەوە.

تایبەتمەندی گرنگی دیکەی کۆمەڵناسی ئێران ڕۆڵی سیاسی‌و روحانیەت بووە. ڕۆحانیەتی شیعە لەبەر ئەو سەربەخۆیی‌یە دارایی‌یەی کە هەیبووە، توانیوویەتی تا ئاستی پێویست سەنگەر لە حکومەت بگرێ. ئەمە بەو مەعنایە نی‌یە کە هەمیشە لە ئێراندا ڕۆحانیەت سەرقاڵی نەبەرد بووە لەگەڵ حکومەتدا، بەڵکو بە مەعنای ئەوەیە کە لەو کاتانەدا کە ڕۆحانیەت چۆتە مەیدانی نەبەردە سیاسیەکانەوە توانیوویەتی لەو خەباتەدا بەشێوەیەکی بەربڵاو خەڵك ڕابکێشێتە ئەم مەیدانەوە. بەدەربڕینێك لەم لایەنەوە ڕۆحانیەت دەوری حزب و ڕێکخراوە سیاسیەکانیشی لە ئەستۆدا بووە. دەتوانین لە ڕۆژانی شۆڕشی ئیسلامی‌دا بە باشترین شێوە ئەم تایبەتمەندییەی ڕۆحانیەت بەدی بکەین. دوای سەرکەوتنی شۆڕشیش ئەم تایبەتمەندی‌یە بەردەوام بوو روحانیەت توانی لە قالبی ڕیکخراوە نیمچە رەسمیەکاندا بەشیك لە نەبوون و بۆشایی حزبایەتی پڕ بکاتەوە.

ئەوەی کە وتمان وینەیەکی چروپری رابردوو بوو، زۆر لەو تایبەتمەندیانە لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامیەوە لە حالەتی گۆڕان و گەشەکردندان. شۆڕشی ئیسلامی بەریوە بوو بۆ ئەوەی زۆر لە بنەما کۆنەکان هەڵ بوەشینیتەوە، بەڵام بێ سەروسامانیەکانی دوای سەرکەوتنی شۆڕش، هەشت ساڵ شەر لەگەڵ عیراق و پیویستی دروست کردنەوەی کاول کارییەکانی جەنگ و بیناکردنەوەی ئابووری وڵات، ئەمانە لەو مەسەلانە بوون کە ڕەوتی گەشەکردنی سیاسی و کرانەوەی کەش و هەوای سیاسی وڵاتیان دواخست. هەڵبژاردنی (٢)ی خوردادی ١٣٧٦ (١٩٩٧/٥/٢٣) لە ڕاستی‌دا دەست پێکردنەوەی ڕەوتیك بوو کە (١٩) ساڵ بەر لەوە لە شۆڕشی

ئیسلامییەوە دەستی پێ کردبوو. پەیامی ئەو هەڵبژاردنەش لەوە ڕۆشنترە کە پێویستی بە شیکردنەوە بێ. پرسیاری سەرەکی ئەوەیە کە ئەو کۆمەڵە گۆڕانکارییەی دوای (٢ی خورداد) تا چ رادەیەك توانیوویەتی لە پێناوی بەدی هێنانی خواستەکانی ئەو هەڵبژاردنەدا، واتە چەند چەمکێکی وەکو کۆمەڵگای مەدەنی، دەسەڵاتی یاسا، ئازادی دەربڕین، ئازادی کۆبوونەوەو چاپەمەنی بچێتە پێشەوە. هەندێك بە سەرنجدان لەو کێشەو مەسەلانە کە حکومەتەکەی سەرۆك خاتەمی یان گەمارۆ داوەو ئەو کۆسپەی کە نەیارانی بەتوانای خاتەمی لەسەر ڕێگەی ئاماژە بۆ کراو دایان ناوە، نائومێدانە بە سلبی وەڵامی پرسیارەکەی سەرەوە دەدەنەوە. ژمارەیەکی تر، ئەم پرسیارە ئاراستە دەکەن کە بۆچی نەیارانی سەرۆك خاتەمی رای زۆربەی جەماوەر پەسەند ناکەن و ڕێگەی کارکردن بە خاتەمی نادەن؟ و لە کۆتاییدا، پرسیاری سەرەکی ئەوەیە کە چارەنووسی حکومەتەکەی خاتەمی هەڵبژاردنی (٢ی خورداد) لە ئەنجامدا چی دەبێت؟

بەر لە هەموو شتێ ئەو مەسەلەیەی کە پێویستە سەرنج بدرێ ئەوەیە کە بۆچوونی لایەنگرانی سەرۆك خاتەمی سەبارەت بەوەی کە نەیارانی دەبوایە ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی (٢ی خورداد)یان قبوڵ بکردایەو بچوونایەتە کەنارەوە، هەر لە سەرەتاوە بۆچوونێکی نابەجێ و ناڕاست بوو. چۆن و بەپێی چ بنەمایەك دەبوایە نەیارانی خاتەمی لە دوای (٢ی خورداد) دەست لە سیاسەت بشۆن و مەیدانە کە بۆ خاتەمی چۆڵ بکەن؟ ئایا مەعنای دیموکراسی و سیستەمی هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئەوەیە کە هێزە سیاسیەکان کە لە هەڵبژاردنێکدا سەرکەوتن بەدەست ناهێنن، دەبێ خۆیان خانەنشین بکەن و لە مەیدانی سیاسی بچنە دەرەوە؟ سێ هەفتە بەر لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئێران، لە هەڵبژاردنی گشتی بەریتانیادا، حزبی موحافیزەکار لە دوای نزیکەی (٢٠) ساڵ کە بەردەوام دەسەڵاتی بەدەستەوە بوو تووشی گەورەترین شکستی سیاسی بوو لە مێژووی ئەو وڵاتەدا. بەڵام ئەو شکستە قورسە نەبوو بەهۆی ئەوەی کە حزبی موحافیزەکار بەتەواوی خۆی لە سیاسەت بکێشێتەوەو هەموو شتێك بە حزبی کرێکاران بسپێرێ کە لە هەڵبژاردندا سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو. بە پێچەوانەوە، حزبی موحافیزەکار لەگەڵ کۆمەڵێ ئاڵ و گۆڕدا کە بەسەر خۆیدا هێنا، لەوانەش هەڵبژاردنی سەرکردایەتیەکی نوێ بۆ حزب، گۆڕینی هەندێ لە سیاسەتەکانی رابردوو و دەست نیشان کردنی بەرنامە و دروشمی نوێ،

بەتەواوی توانایەوە لە مەیدانی سیاسی بەریتانیادا مایەوەو بەربەرەکانی حکومەتی تازەی کرد. حزبی موحافیزەکار بە نیازی ئەوەیە کە بە ئاشکراکردنی ناڕەزایی راستەقینەو بەردەوام لەگەڵ حکومەتی تازەدا لە کۆتایی‌دا بتوانێ پیشوازی دەنگدەران بۆ حکومەت خاو بکاتەوەو زەمینەی سەرکەوتنی خۆی لە هەڵبژاردنی چوار ساڵ دوای ئەوەدا فەراهەم بکات. سەرکەوتن و شکست لە هەڵبژاردندا، بنەمای سیستەمە دیموکراتیەکان پێك دەهێنێ. نەك بەو پێیەیە کە رەوتێکی سیاسی سەرکەوتوو لە هەڵبژاردندا خۆی بەدەسەڵاتی رەها بزانێت و هیچ مافێك بە نەیارە سیاسیەکان رەوا نەبینێ، و نە لە بەرامبەریشدا رەوایە کە هێزە شکست خواردووەکان، بە تەواوی و بە رەهایی تەسلیمی حزب یان رەوتی سیاسی سەرکەوتووبن و لە مەیدانی سیاسی خۆیان بکێشنە کەنارەوە. ئەو بۆچوونە یان ئەو چاوەڕوانیەی کە باڵی شکست خواردوو لە هەڵبژاردنی (۲)ی خورداددا دەبێ بە تەواوی رێگە بۆ خاتەمی بەکراوەیی بهێڵنەوە، هەر لە سەرەتاوە چاوەڕوانیەکی مەعقول نەبوو. هیچ بنەمایەکی لۆجیکی نی‌یە بۆ ئەوەی کە بۆچی نەیارانی خاتەمی دەبێ بەشێوەیەك رەفتار بکەن کە بە قازانجی خاتەمی و حکومەتەکەی تەواوبێت و زەمینەی سەرلەنوێ سەرکەوتنەوەی خاتەمی لە هەڵبژاردنی چوار ساڵی دوای ئەوەدا فەراهەم بێت. ئەوەی کە وتمان یەکێکە لە مەرجە بنەڕەتیەکان کە بریتی‌یە لە چالاکی نەیارەکان لە چوارچێوەی یاسادا.

لێرەوە بەکردەوەش هێزە شکست خواردووەکانی هەڵبژاردنی (۲)ی خورداد بەرە بەرە لە واق ورمان و سەرسوڕمانی سەرەتا دەرچوون و دەستیان بە دژایەتی و رووبەڕووبوونەوەی حکومەتەکەی خاتەمی کرد، لە سەرەتادا وا دەهاتە بەرچاو کە نەیاران نیگەرانی خۆشەویستی خاتەمی بوون لەلایەن خەڵکەوە و نەیان دەویست لەلای خەڵك خۆیان بە دژی رەوتێك نیشان بدەن کە لەلایەن بیست ملیۆن دەنگدەرەوە پشتیوانی لێ دەکرێ. لەبەرئەوە لەجیاتی هێرشی راستەوخۆ بۆ سەر سەرکۆمار، دەوروبەرەکەی و ئەو رەوتانەیان دەدایە بەر هێرش کە پشتیوانیان لەسەر کۆمار دەکرد. لەم قۆناغەدا هەوڵ دەدرا بەرپێزگرتنی رووکەش لەسەرکۆمار، سەرکۆمار لە دەوروبەرەکەی جیابکەنەوەو ئەوان بدەنە بەرهێرش و رەخنە. جگە لە

دەوروبەرەکـەی‌و هاوکـارانی، وردە وردە رەخنـەو هـێرش بـۆ سـەر سیاسـەت و هەڵوێست‌و بۆچوونەکانی خاتەمیش دەستی پێ‌کرد. لە سەرەتادا زیاتر هێرشەکان ئاراستەی حیجەتول ئیسلام عەبدوڵای نوری وەزیـری نـاوخۆ، دکتـور عـەتا ئـەڵلای موهـاجرانی وەزیـری فەرهـەنگ و ئیرشـادی ئیسـلامی و غـولام حسـینی کەرباسـچی بەڕێوەبەری شارەوانی تاران دەکران. لە قۆنـاغی دوای ئـەوەدا سـەرەی سیاسـەت و هەڵوێستەکانی خاتەمی هات. چەمکەکانی وەکو کۆمەڵگای مەدەنی، سەروەری یاسا، گەشـەکردنی سیاسـی، حزبایـەتی، ئـازادی رادەربڕیـن، ئـازادی چاپەمـەنی، ئـازادی کۆمەڵەکان کە بە شێوەیەکی سـەرەکی لەلایـەن خاتـەمی و حکومەتەکەیـەوە لەسـەر ئاستی کۆمەڵ باس دەکران بەبێ ناوهێنانی سەرکۆمار دژایەتیان کرا.

دەشـێ کۆبوونـەوەی (٢)ی خـوردادی سـاڵی ١٣٧٧ (٩٨/٥/٢٣) بـە بۆنـەی بـەرز راگرتنی یەکەمین ساڵرۆژی سەرکەوتنی (٢)ی خورداوە لە زانکۆی تاران بە خاڵی وەرچـەرخان حسـاب بکرێـت لـە رووبەڕووبوونـەوەی باڵی راسـتدا لەگـەڵ خاتـەمی. کۆبوونەوەی هەزاران خوێندکاری کوڕو کچ لە زانکۆو پشتیوانی و دەربڕینی هەست‌و سۆزی گەرمیان کە بە شێوەی چەپڵەلێدانی دوورو درێژو فیکـەلێدان خـۆی نیشـان دەدا، دیاربوو کە کاسەی سەبرو وزەی نەیارانی خاتـەمی پڕکرد. بە بیانوی ئەوەی کـە چەپڵـەلێدان و فیکەلێدانەکـەو لـە بنـەڕەتدا خـودی کۆبوونەوەکـە لـە مـانگی موحەڕەمدا بووە، قۆناغێکی تازە لە هێرش بۆ سەر سەرۆك خاتـەمی دەستی پێ‌کرد. لەگەڵ ئەو جیاوازیەدا کە ئیتر باڵی راسـت هێنـدە لەسـەر ئـەوە سـوور نـەبوون کـە راستەوخۆ هێرش نەکەنە سەر خودی خاتەمی* .

قورس ترین بەشی هێرشـی باڵی راست ئاراسـتەی چاپەمەنی کـرا. سـەرانی باڵی راست لـە پەرلـەماندا یـەك لـەدوای یـەك، هێرشیان کردە سەر چاپەمـەنی سـەربەخۆو لایـەنگری خاتـەمی. چاپەمەنی‌یـە سـەربەخۆکان بـە پێشـێل کردنـی بنـەماکانی شـەریعەت، خـەتابارکردنی شـۆڕش و دژایـەتی بـەها پـیرۆزەو ئامانجـەکانی خـەڵك

---

* ئەم حاڵەتـە بەشـێوەیەکی ئاشـکراو راسـتەوخۆتر لـە دوای مەراسـیمی (١٩٩٨/١٢/٨) لـە زانکۆی سەنعەتی شەریفیش دووبارە بۆوە، چەند کەسێك لە باڵی راست بە راشکاوی لەسەر ئەو کۆبوونەوەیە سەرزەنشتی سەرکۆماریان کرد.

تاوانبارکران. هەروەها بەوەش تاوانبارکران کە لە "دەرەوە" فەرمانیان پێدراوە و خزمەتکارو بەکرێگیراوی ئیستکباری جیهانین. سەربەخۆیی چاپەمەنی لە حکومەت، ئازادی رادەربڕین کە لە راستیدا گەورەترین دەسکەوتی یەکسالەی حکومەتەکەی خاتەمی بوون، کەوتنە بەر زۆرترین و قورس ترین هێرش.

ئامانجی دوای چاپەمەنی، ئازادی بوو، بەجیاکردنەوەی ئازادی بۆ "ئازادی رەوا"و "ئازادی ناڕەوا"، باڵی راست دەستی کرد بە هێرشی راستەقینە بۆ سەر ئازادی.

سەرەتا بەوەی کە ئامانجی لایەنگرانی ئازادی هەمان ئەو "ئازادییە ناڕەوایە" کە لە خۆرئاوا زاڵە، ئازادیش هێرشی کرایە سەر. وتەبێژانی باڵی راست یەك لەدوای یەك "ئازادی خۆرئاوایی"یان بە ئازادی ناڕەوا" لە قەڵەم دا لایەنگرانی ئازادی خۆرئاواییان بە دژی ئاین و عیلمانی و دژی شۆڕش ناوبرد. کۆمەڵگای مەدەنی "بەجیاواز" لە کۆمەڵگا "ویلایەت" لە قەڵەم دراو دروشمی سەروەری یاسا و یاساگەری لەگەڵ بالادەست بوونی بێچەندو چۆنی "دەسەلاتی دادگا"دا رووی لە کزی کرد. لە کۆتاییدا "گەشەپێدانی سیاسی" سەرۆك خاتەمی بە بەرپرسی خراپیی ئابووری ولات لێك درایەوەو باڵی راست داوایان لە سەرکۆمار کرد لە جیاتی گەشەپێدانی سیاسی و سوور بوون لەسەرئەوە،، تەئکید لەسەر ئابووری و چاکردنی باری نالەباری ئابووری ولات بکاتەوە.

دژایەتیەکانی باڵی راست بەهیچ شێوەیەك لە چوارچێوەی ململانێی فیکریدا نەبوو. عەبدولای نوری وەزیری ناوخۆ، لەکاتی لابردنیدا نەیتوانی دەنگی متمانەی پێویست لە پەرلەمان بەدەست بێنێ و بەزۆر لە کابینەکەی دەرکرا، دکتور مهاجرانی هەتا نزیکی بەرکەناری رۆیشت، غولام حسینی کەرباسچی سەرۆکی سەرکەوتووی شارەوانی پایتەخت و یەکێك لە پشتیوانە گرنگەکانی خاتەمی راکێشرایە دادگا. رۆژنامەی توس (جامعە) داخراو دەستەی نووسەرانی گیران. گۆڤاری مانگانەی (جامعە سالم)یش داخراو هەفتەنامەی (راە نو)ش بۆ رێگرتن لە بڵاوبوونەوەی کەوتە ژێر فشارەوەو نوری و مهاجرانی لەکاتی نوێژی هەینیدا جوێنیان پێدراو لێدانیان خوارد، باڵی راست هەتا لە بواری سیاسەتی دەرەوەش خافڵ نەبوو. دروست کردنی وێنەیەکی میانەڕەو، بێ ئاژاوە، خوازیاری ئاشتی و پەیوەندی باش لەگەڵ تەواوی

نەتەوەو وڵاتەکان کە لە ژێر ناوی "دورکەوتنەوە لە گرژی"دا لەلایەن باڵی راستەوە هێندە بایەخی پێ نەدراو پێشوازی لێنەکرا.

کردنەوەی گرێ کوێرەی مەسەلەی سەلمان روشدی لە رێگای پەیوەندییە دیپلۆماسیەکانی ئێرانیشدا لەگەڵ یەکێتی ئەوروپاو بە تایبەتی لەگەڵ بەریتانیا لەلایەن باڵی راستەوە پێشوازی لێ نەکرا. لە دوای هەڵوێستی رەسمی وەزارەتی دەرەوەی ئێران لە نیویورك، سەبارەت بەوەی کە حکومەتەکەی خاتەمی هیچ هەنگاوێك بۆ جێبەجێکردنی فەتوای کوشتنی سەلمان روشدی ناگرێتەبەر، بەردەوام چەند بەشێك لە باڵی راست لەگەڵ زیادکردنی پاداشتی کوشتنی سەلمان روشدی و زیادکردنی ژمارەی داواکارانی جێبەجێکردنی فەتواکەدا هەوڵیان دا لەم ئاراستەیەدا سیاسەتەکانی حکومەت پوچەڵ بکەنەوە، رووبەڕووبوونەوەی هەوڵەکانی حکومەتی خاتەمی سەبارەت بە نەهێشتنی گرژی لەگەڵ ئەمریکاو روخاندنی دیواری بێ متمانەییش لەوە ئاشکراترە کە پێویستی بە ئاشکراکردن هەبێ. ماوەتەوە، یاسا شکێنییەکان، بەکارهێنانی توندوتیژی و سەرەڕۆییە وردو درشتەکانی گروپەکانی فشار کە کەمترین کاریگەرییان بریتی بوو لە کەش و هەوایەکی نائارام، ناجێگیرو بەیەك قسە بێ دەسەڵات نیشاندانی حکومەت لە ئیدارەی وڵاتدا. بەرەیەکی دیکە کە باڵی راست لە ناوەڕاستی ١٣٧٧ (مانگی (٩)ی ١٩٩٨)دا بە رووی حکومەتی خاتەمیدا کردیانەوە، بریتییە لە کەمتەرخەم نیشاندانی خاتەمی سەبارەت بە وەزعی ناڵەباری ئابووری وڵات، نەیارانی خاتەمی ئومێدەوارن کە بە تاوانبارکردنی حکومەت سەبارەت بە وەزعی خراپی ئابووری وڵات، گەشەنەکردن، گرانی و بێکاری لە جەماوەرێتی خاتەمی کەم بێتەوە شان بە شانی نیشاندانی سەرنەکەوتنی حکومەت لە بواری سیاسی، کۆمەڵایەتی و بەرقەرارکردنی ئارامی و ئاسایش و حکومی یاسادا، لە بەرەی ئابووریشدا خاتەمی بەسەرنەکەوتوو و شکست خواردوو نیشان بدەن.

پرسیاری بنچینەیی ئەوەیە کە ستراتیژی کۆتایی نەیارانی خاتەمی چییەو سەرئەنجام کاردانەوەی ئەوان چی دەبێ؟ لە وەڵامدا دەبێ بگوترێ کە رەنگە خودی نەیارانیش نەتوانن وەڵامێکی دیارو دیاریکراو بدەنەوە کە بەلای هەموانەوە پەسەندبێ. چونکە ناتوانین نەیارانی خاتەمی بە گروپ یان رەوتێکی دیاریکراو

دابنێین. ڕاستە کە دژایەتی سەرەکی خاتەمی لەلایەن باڵی ڕاستەوە ئەنجام دەدرێ، بەڵام ناتوانین ئەم باڵە بەهێزێکی پێکەوەگونجاو، هاوئاهەنگ و هاودەنگ دابنێین. هەروەکو چۆن لایەنگرانی خاتەمیش ڕەوتێکی دیاریی کراونین. دەشێ زیاتر باڵی ڕاست وەکو یەك تەوژمی خەیاڵی پێناسە بکرێ کە مەیل و دیدگای جیاواز لەخۆی دەگرێ. لە سەرێکی ئەم تەوژمە (طیف) هێزە میانڕەو و واقیعییەکان هەن کە باوەڕیان بە یاسا هەیە. هەندێ لەمانە هەتا بە ریفۆرمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئازادیش ڕازین، ئەگەرچی بەشێوەیەکی سنورداریش بێ. هەندێکی تریان ئەگەرچی باوەڕێکی ئەوتۆیان بە ریفۆرمی کۆمەڵایەتی مافی خەڵك لە دیاری کردنی چارەنووسی خۆیان و ئازادی ڕادەربڕین و قەڵەم نییە، بەڵام بەهەر حاڵ تاڕادەیەك ئەم گوتانەیان پەسەندەو پێیان وایە کە ناکرێ خۆی لێ لابدرێ. لە سەرێکی دیکەی تارماییەکەوە، کۆمەڵێ ئەندام و ڕەوتی خەیاڵی خاوەن ئامانج دەمارگیر ڕەها بین، هەستیار و لایەنگری توندوتیژی هەن. ئەو ڕەوتانەی کەدەمارگیری، باوەڕ بەخۆبوون و خۆبەشت زانینی لەرادەبەدەریان بووە بەرێگر لەوەی کەبتوانن تێگەیشتنێکی واقیع بینانەیان هەبێ سەبارەت بەئێران و بەوجیهانەی کەتیایدا دەژین.

ئەم تەوژمە فراوانە سەرەڕای جیاوازییەکانیان سەبارەت بە یەك خاڵی سەرەکی بۆچوونی هاوبەشیان هەیە ئەویش بریتییە لە دژایەتی و ڕووبەڕووبوونەوەی حکومەتی خاتەمی. بەڵام لەوەدا کە شێوەی ئەم دژایەتیەو ڕادەی هەتا کوێ بێ و لە کۆتاییدا لەسەر ئەوەی کە (مامەڵەیان) لەگەڵ خاتەمیدا چۆن بێت یەك دەنگ نین. ڕەوت و کەسێتی میانڕەوی باڵی ڕاست لەگەڵ دژایەتی کردنی حکومەتی خاتەمیدا خوازیاری ئیفلیج کردن و لە کۆتاییدا ڕوخاندنی خاتەمی نین. لە چوارچێوەی یاسادا دژایەتی خاتەمیان کردووەو ئامادە نین دوراییەکانی ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیە بگاتە ئەو ئاستەی کە وڵات تووشی گرژی، نائارامی و پاشاگەردانی بێت. ئەمانە ئومێدەوارن بە سەرنەکەوتنی سیاسی، کۆمەڵایەتی و لە هەمووشی گرنگتر سەرنەکەوتنی ئابووری، لایەنگرانی خاتەمی بەرەبەرە لێی نائۆمێد بن و بگەنە ئەو باوەڕەی کە "ئەگەرچی خاتەمی مرۆڤێکی ڕاستگۆیە و خاوەنی بیری کراوەیە، بەڵام بەداخەوە خاوەنی توانای پێویست نییە بۆ بەڕێوەبردنی وڵات" بێگومان کاتێك

خەڵك بگەنە ئەو باوەڕەی کە خاتەمی لە مەسەلەی باشکردنی باری وڵاتدا سەرکەوتنی ئەوتۆ بەدەست ناهێنێ. زۆربەیان ئامادە نابن سەرلەنوێ دەنگی بۆ بدەن. جگە لەوەی کە شکستی خاتەمی دەبێتە هۆی زیادبوونی چانسی باڵی ڕاست بۆ بەدەست هێنانی کورسی زیاتر لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی ساڵی ١٣٧٩ (٢٠٠٠)دا.

بە پێچەوانەی ئەم بەشەی باڵی ڕاستەوە، بەشە توندڕەوەکانی دیکە لە دژایەتی و ململانێ لەگەڵ حکومەتی خاتەمی‌دا هێندە خۆیان بە پابەندی یاسا نابینن و ئەمەش بە ئەرکی سەرشانی خۆیان نازانن. بە کردەوەش پابەند نەبوونی ئەمانە بە یاساوە لە دژایەتی حکومەتی خاتەمی‌دا چەند جارێ بەدی کراوە. سەرەڕای ئەوەش ئەم بەشەی باڵی ڕاست، لە بەکارهێنانی توندوتیژی، دروست کردنی پێکادان و بەرێ کردنی کەش و هەوای کۆمەڵگا بەرەو نائارامی و پاشاگەردانی ئاسڵەمنەوە. بەڕای هەندێکیان، لەگەڵ هەموو ئەنجامە زۆر خراپەکاندا کە دەتوانێ لەسەر ئاستی کۆمەڵگا ئاراستەکردنی بیرێکی وای بۆ خاتەمی لەگەڵدابێ. کە ناجێگیری و نەبوونی ئاسایش دەبێتە هۆی ئەوەی کە حکومەت لە مێشکی خەڵکی‌دا لاوازو بێ توانا بێتە بەرچاو.

جیاوازی ڕەوتە جیاوازەکانی دیکەی ناوباڵی ڕاست؛ لە شێوەی تێڕوانینیاندایە بۆ دیاردەی (٢)ی خورداد. ئەو بەشانەی کە میانڕەوترن ئەگەرچی بەتاڵیش بێ بەلام بەهەرحاڵ ڕای (دەنگی) خەڵك قبوڵ دەکەن. ئەمانە بەلای کەمەوە ڕای خەڵکیان وەکو بەشێك لە پاڵپشتی ڕەوایی سیستم قبوڵە. بەڵام بەشەکانی تری ئەم باڵە بە قبوڵ نەکردنی و ڕازی نەبوون بە مافی (مەشروعیەتی روحانی) بۆ ڕای خەڵك، "هەڵبژاردنەکانی خەڵك" و "مافی خەڵك لە دیاری کردنی چارەنووسی خۆی‌دا" لە (٢)ی خوردادەوە بەرەبەرە ڕەت دەکەنەوەو بەربەرەکانی دەکەن. ڕەنگە بەرێکەوت نەبووبێ کە یەکێ لە (گفتوگۆ) جدیيەکانی کە لە دوای (٢) خورداد لەسەر ئاستی کۆمەڵگا خرایە ڕوو، بریتی بوو لە شەرعیەتی سیستم و پایەگای خەڵك تیایدا" چەند بەشێك لە باڵی ڕاست بە خوێندنەوەی تایبەتی خۆیان بۆ (سیستمی ویلایەت) و دەورو شوێنی ڕابەری لەم سیستمەدا، بەرەبەرە گرنگی خەڵکیان فەرامۆش کردو لە بنچینەدا ڕەوایی سستمیان بەوە پێناسەکرد کە پەیوەندی بە (وەلی فەقێ)وە هەیە.

گرنگی ئەم لێکۆڵینەوانە بە تەنها لەبەر ڕەهەندی فەلسەفەی سیاسیان نی‌یە. بەڵکو لە لایەنە فەلسەفیەکانی گرنگتر، ئەو ئەنجامە عەمەلیانەیە کە لەم لێکۆڵینەوانەوە

بەدەست دیت. بێگومان بێبایەخ بوونی رای (دەنگ)ی خەلك لە دیاری کردنی چارەنووسی خۆیان و هەلبژاردنی حکومەتدا، ئەرکی سەرشانی (٢٠) ملیۆن دەنگی خاتەمیش روون دەکاتەوە. بەو مەعنایەی کە رەوتە زۆر توندرەوەکانی بالی راست، بەلای کەمەوە لە رووی شەرعی یان تیوریی‌یەوە گرنگی‌یەکی ئەوتۆ بۆ رای خەلك دانانین و ئەوە بە ئەرکی سەرشانیان دانانین کە رای خەلك و داوەری خەلك لە (٢)ی خورداددا قبول بکەن. بەم پیودانگەش، ئەوان خۆیان بە ناچار نابینن کە مل بۆ حکومەتێ کەچ بکەن کە بنەماکەی لەسەر دەنگی خەلك بنیات نرابێ. بەم پێیە، هەولدان بە ئاراستەی رووبەرووبوونەوەی ئەو حکومەتە و هەتا پەك خستنی بەر لە تەواوکردنی ماوەی یاسایی چوار سالەی خۆی "بە لادان لە شەرع" لە قەلەم نادرێ. لیرەوە دەتوانین لەوە تێبگەین کە بۆچی ئەم بەشەی بالی راست، لە رووبەرووبوونەوە لەگەل خاتەمیدا هێندە خۆیان بە پابەند بە چاودێری کردنی چوارچێوەی یاسایی‌یەوە نابینن، جگە لە باسە تیورییەکان سەبارەت بە شەرعیەت، دەربارەی خودی دیاردەی (٢)ی خورداد و هۆیەکانی سەرهەلدانیشی بالی راست خاوەنی یەك خویندنەوەو تەفسیر نی‌یە. رەوتە میانرەوەکانی بالی راست، بە لای کەمەوە لە سەرەتای سەرکەوتنی سەرسورهێنەری خاتەمی‌دا، بەجۆریك لە چاوخشاندنەوە بە رەفتارو هەلویستی سیاسی و کۆمەلایەتی خۆیاندا قایل بوون. شکستی چاوەروان نەکراو و لەهەمان کاتدا قورسی بالی راست لە (٢)ی خورداددا بەلای ژمارەیەك لەوانەوە ئەو باوەرەی هینابووە پیشەوە کە خەلك بەهەرحال لە کردەوەی ئەوان نارازی بووەو بۆ بەدەست هینانەوەی پشتیوانی و متمانەی خەلك، ئەم بالە ناچارە کە هەندێ گۆران لە بۆچوون و کردەوەکانی‌دا بکات. بەلام رەوتە توندرەوەکانی بالی راست لەبەرئەوەی بەتایبەتی بایەخیك بۆ رای خەلك دانانین، بایەخیکی ئەوتۆش بە پشت تێکردنی خەلك نادەن، لە روانگەی خۆیانەوە، ئەوان بەپێی ئەو ئەرك و بەرپرسیاری‌یە رەفتارییان کردووە کە خوداو شەرع داوای لێ کردوون. کەواتە نەك (٢٠) ملیون هەتا ئەگەر هەموو دانیشتوانی گۆی زەویش پێی بگوتنایە و (پێیان بلێ) "نا" شتیك لە مەسەلەکە نەدەگۆرا. ئەوان خۆیان سەنگی مەحەکن بۆ دیاری کردنی راست و ناراست و بۆچوون و دەنگی خەلك بەلگەیەکی ئەوتۆ نی‌یە. ئەمان بە ئەرکی سەرشانیان هەستاون و بۆ لەمەو دواش دریژە بەهەمان شیوازو رەوت دەدەن.

پێویست بە باسکردن ناکات. کە ئەم بەشەی باڵی ڕاست بە بۆچوونێکی لەم جۆرە نە ڕەخنە لێ گرتن و لێکۆڵینەوەی ڕەفتارەکانی بە پێویست دەزانێ و نە گۆڕان و ئاڵوگۆڕ لە مامەڵەو کردارو گوفتارو سیاسەت و هەڵوێستەکانی‌دا بە ڕێگایەکی شایستە دەزانێ. بێ ئەوەی بگوترێ دیارە کە هیچ پێویستی یان هۆیەك نابینێ کە بۆچی لە گەورەکردنی هەر جۆرە ناڕەزایی و ڕووبەڕووبوونەوەیەك لەگەڵ حکومەتی خاتەمی‌دا بەشداری نەکەن.

"دەبێ چی بکرێ؟" ڕووبەڕووبوونەوەی باڵی ڕاست لەگەڵ حکومەتەکەی خاتەمی‌دا تەنها سەر بە بیرکردنەوەی سیاسی ئەو باڵە نی‌یە، بەڵکو بەشەکەی دیکەی ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیە، پەیوەستە بە کردەوەو بارودۆخی حکومەتەکەی خاتەمیەوە بێگومان هەرچەندە حکومەتەکەی خاتەمی لە بواری سیاسی، کۆمەلایەتی و ئابووری سەرکەوتنی زیاتر بەدەست بێنێ، ئەگەری ئەوەی کە خولێکی دیکەش هەڵبژێردرێتەوە زیاتر دەبێ (بەو گریمانەی کە خاتەمی لە خولی دووەمدا مەیلی خۆ کاندید کردنی هەبێ" ئەگەر خۆشەویستی خەڵك بۆ خاتەمی بەردەوام بێ بێگومان بە ئاسانی جارێکی دیکە هەڵدەبژێردرێتەوە بەم پێیە کێشەی سەرەکی باڵی ڕاست خۆشەویستی خەڵکە بۆ خاتەمی و ئاساییشە کە بەشی سەرەکی هەوڵی باڵی ڕاست بۆ کەم کردنەوەی ئەو خۆشەویستی‌یە دەبێ. هەتا ئێستا (مانگی (١) ١٩٩٩) خاتەمی زیاتر لە سێیەکی چوار ساڵەکەی تەی کردووەو ئەگەرچی هێشتا (٣|٢) ماوەکەی ماوە، بەڵام بەپێی ئەو ماوەیە سەبارەت بە ڕادەی خۆشەویستی خاتەمی دەتوانرێ چ حوکمێك بدرێ؟ ئایا خۆشەویستی خاتەمی بەپێی خوردادی (١٣٧٦- مانگی (٥) ١٩٩٧) زیادی کردووە، کەمی کردووە یان ڕوو لە کەم بوونەوەیە یان لە بنەڕەتدا گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە؟ لە بنچینەدا دەربارەی ئەنجامی کاری خاتەمی هەتا ئێستا چۆن دەتوانرێ حوکم بدرێ و تاوتوێ بکرێ؟

یەکەمین مەسەلەیەك کە دێتە بەرچاو ئەوەیە کە خۆش ویستنی خاتەمی هێندە کەمی نەکردووە ئەگەرچی هەندێك کەس هەست بە سەرگەردانی و نائومێدی دەکەن. لە بواری سیاسی و کۆمەڵایەتی‌دا بە گشتی کارنامەی خاتەمی درەخشان بووە. کەش و هەوای سیاسی وڵات بەشێوەیەکی هەست پێکراو زیاتر کراوەتەوە. چاپەمەنیەکان بە بەراورد لەگەڵ ڕابردوودا زیاتر ئازادن. (لەگەڵ ئەوەشدا کە

ژمارەشیان زیادبوونێکی بەرچاوی بەخۆیەوە دیوە)، حزب و ڕێکخراوی سیاسی جیاواز سەریان هەڵداوە و کۆبوونەوە سیاسی‌یەکان کەم و زۆر ئازادانە بەڕێوە دەچن. هەڵبەتە لە بواری سەروەری یاسادا، سەرکۆمار دەسکەوتێکی ئەوتۆی نەبووە کە بێگومان ناتوانرێ بە تەواوی ئەمە بخرێتە ئەستۆی خاتەمی. ڕەنگە بەرزترین پلەیەك کە لەم بوارەدا پێویستە بە حکومەتەکەی خاتەمی بدرێ، بۆ بەردەوامبوونی بێت لە داکۆکی لەو پرانسیپ و ئامانج و بەڵێنانەی کە لەکاتی هەڵبژاردندا بە دەنگدەرانی دا. ڕەنگە خاتەمی نەیتوانیبێ هەندێ لەو بەڵێنانە بەدی بێنێ، بەڵام ئەوەی کە مایەی ئومێدەواری‌یە، پابەندیی خاتەمی‌یە بەو بەڵێنانەو فەرامۆش نەکردنیانە. خاتەمی لەهەر دەرفەتێکدا کە هاتبێتە پێشەوە تەئکیدی لە باوەڕی تۆکمەی خۆی بە ئازادی؛ سەروەری یاساو مافی خەڵك لە دیاری کردنی چارەنووسی خۆیاندا کردۆتەوە. ئەم سووربوون و دووپات کردنەوەیە بە مەعنای ئەوەیە کە خاتەمی لە ناخەوە باوەڕی بەم چەمکانە هەیەو تەنها لەبەر بەدەست هێنانی رای دەنگدەران باسی نەکردوون. لەبەرئەوە کارنامەی خاتەمی سەبارەت بە "کۆمەڵگای مەدەنی" بەگشتی زۆر ئیجابی‌یە. بەڵام ئەنجامی کاری خاتەمی لە بواری ئابووری‌دا ناتوانرێ لە هیچ ڕوویەکەوە بەباش هەڵبسەنگێنرێ. لە ڕاستی‌دا دەبێ ڕاستگۆیانە دان بەوەدا بنرێ کە باری ئابووری لە ماوەی (١٨) مانگی ڕابردوودا خراپتر بووە. گەشە نەکردن، بێکاری، گرانی، کەم بوونەوەی سەرمایەگوزاری، هەڵئاوسان، تەنگی بە ژیانی چین و توێژێکی فراوانی کۆمەڵ هەڵ چنیووە. لەبەرئەوەی لێرەدا بواری ئەوە نی‌یە کە بچینە ناو ئەو باسەوە کە کێشە ئابوورییەکانی ئێستا لە سیاسەتەکانی خاتەمیەوە سەریان هەڵداوە یان خاتەمی میراتگری ئابوورییەکی بێ سەرو بەر بووە؟ ئەوەی کە کلێشەکانی ئابووری ئێران بنچینەیی بووەو پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە سیاسەتەکانی خاتەمی‌یەوە نی‌یە، لەوە ڕۆشنترە کە پێویستی بە شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی ئاڵۆزو گەورەی ئابووری بێت. ڕەنگە کەم و کورتی و ڕەخنەی بنچینەیی لە حکومەتەکەی خاتەمی ئەوەبێ کە بۆچی گۆڕانی بنچینەیی و ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی لەم ئابوورییەدا ناکات؟ یەکەمین و گرنگترین دژواری بنەڕەتی ئابووری ئێران، وابەستەیی بنەڕەتیەتی بە دەوڵەتەوە. ئابووری ئێران ئابوورییەکی دەوڵەتی‌یە بەهەموو ئەو زیانانەوە کە ئابوورییەکی لەو جۆرە لەگەڵیدایە. دوو سەد ساڵ بەر لە ئێستا "ئادەم سمیس"

وتویەتی "دەوڵەت بازرگانێکی باش نییە" و ئێمە ئێستاش دان بەو راستیەدا نانێین. دەتوانرێ راستی قسەکەی ئادەم سمیس بە باشترین شێوە لە پیشەسازییەکانی وابەستە بە دەوڵەتی ئێرانەوە بەدی بکرێ. چەند پیشەسازییەکی بێتوانا (کە زیاتر لە پێویست هێزی کاری مرۆییان هەیە بەپێی پیشەسازی دیکە)، بەرهەمی چۆنیەتی خراپ و نرخی تێچوونی کە زۆرجار لەهی نرخە جیهانیەکان زیاترەو لە مەیدانی جیهانیدا هیچ چانسێکی رکابەرییان نییە. باری قازانج گەیاندنی پیشەسازییە دەوڵەتیەکانی ئێمە، باشترین گەواهی بۆ راستی بۆچوونەکەی ئادەم سمیس دەدات. پوختەی قازانجی (٤٠٠) هەزار ملیار ریالی سەرمایەی دەوڵەتی (کۆمەڵەی پیشەسازی، کارخانەیی‌و یەکەکانی بەرهەم هێنان کە هی دەوڵەتن) لە ساڵی١٣٧٥ (١٩٩٦) نزیکەی (٣٧٠٠) ملیار ریال بوو واتە کەمتر لە (١٪). کام سەرمایەداری بە قازانجی کەمتر لە (١٪) دەتوانێ لەسەر پێی خۆی بوەستێ؟ ئەوەی کە پیشەسازییە دەوڵەتیەکانی ئێمەی بەسەر پێوە راگرتووە، (باربووی گەورەو دانی قەرزو تەواوی ئاسانکارییە بانکییەکان و هتد. درێژەدان بەم پیشەسازیانە بارگرانییە بۆ سەرشانی دەوڵەت کە بەهاکەی باج دەران دەیدەن. نەبوونی ئاسایش و کاڵ بوونەوەی حوکمی یاسا، دژوارییەکی بنەڕەتی ئابووری ئێرانە. نەك تەنها هیچ سەرمایەگوزارێکی دەرەکی ئامادە نییە خۆی بخاتە مەترسیەوەو لە ئێراندا سەرمایەگوزاری بکات، بەڵکو سەرمایەگوزارانی ناوخۆش کەمتر ئامادە دەبن سەرمایەکانیان لە بەرهەم هێناندا بخەنەگەڕ. ئیشی رۆژانەو ئەمرۆ بە سبەی گەیاندن، کێشەی سێیەمی ئابووری ئێرانە. ئەم تایبەتمەندییە خۆی لە قاڵبی بڕیاردانی جۆراوجۆر و هەندێك دژوناکۆك، سەرچاوەی بڕیاردانی دەوڵەتی جۆراوجۆر (کە هەریەکەیان سیاسەتێك پەیرەو دەکەن و دیدگای تایبەت بە خۆیان هەیە) و گۆڕینی سیاسەت و بڕیارەکان نیشان دەدات. ئەمرۆ بڕیارێك دەدرێ و بەپێی ئەوە، ناردنە دەرەوەی هێلکە ئازاد دەبێ. ژمارەیەك کۆدەبنەوە بە هەوڵ و کۆشش سەرمایەگوزارییان کردووە، لە دەرەوەی وڵات بازاڕیان پەیداکردووەو دەست بە هەناردە دەکەن، بەڵام ماوەیەك دوای ئەوە خستنەڕووی هێلکە لەناو وڵاتدا کەم دەبێتەوە. دەوڵەت لەجیاتی بەردەوامی و لەبەرچاوگرتنی قازانج و خێری درێژخایەنی ئابووری وڵات بەرژەوەندی و قازانجی کاتی لەبەرچاو دەگرێ و بەنیگەرانی لە سەرهەڵدانی ناڕەزایی، ناردنە دەرەوەی هێلکە قەدەغە دەکات. ئەوە

گرنگ نی‌یه که بەرهەم هێنەران و ئەوانەی هێلکە کە دەنێرنە دەرەوە چیان بەسەر دێت. گرنگ ئەوەیە کە خەڵك لە دەوڵەت ناڕازی نەبن و هات و هاوار روونەدات.

تراژیدیای ترسناك و غەمباری زیان و قورسی سێبەری وێرانکەری بەسەر ئابووریمانەوە دژوارییەکی بنەڕەتی دیکەی ئابووری ئێمەیە. لەبەر بەکارهێنانی بێ بەرنامەی بەنزین لە وڵاتدا (بەهۆی نرخی زۆر نزمیەوە)، دەوڵەت رۆژانە نزیکەی (٦) ملیۆن لیتر بەنزین لە دەرەوە دێنێ بە بەهای لیتری ١٢٥ تومان و لیتری بە (٢٠) تومان دەفرۆشێتەوە[1]) تەنها بۆ ئەو بەنزینەی کە لە دەرەوە دێت، دەوڵەت ساڵانە نزیکەی (٢٢٠) ملیار تومان زەرەر دەدات. بەنزینی بەرهەم هێنراوی ناو وڵاتیش هەمان حیکایەتی ترسناکی هەیە. رۆژانە نزیکەی (٣٥) ملیۆن لیتر بەنزین لە وڵاتدا وەبەر دێت و بەکاردێت. خەرجی بەرهەم هێنانی بەنزین لەناوخۆدا، لیتری ٧٠ تومانە. لێرەشدا دەوڵەت نزیکەی ٦٣٠ ملیار تومان یارمەتی دەدات. بەتەنها بۆ بەنزین دەوڵەت لە ساڵێکدا ٨٥٠ ملیار تومان یارمەتی دەدات بێجگە لەو بڕە زۆرەی دیکە کە بۆ گازۆیل و نەوت و تەواوی بەرهەمە نەوتیەکانی دیکە بۆ ئەم بەشە بەتەنها دەوڵەت لە ساڵێکدا (١٠٠٠) ملیار تومان یارمەتی دەدات[2]. هەر جارەی کە یەك ئوتومبیل ٣٠ لیتر بەنزین تێ دەکات، دەوڵەت بەلای کەمەوە (١٥٠٠) تومان یارمەتی دەدات بە بەکاربەر. رەنگە بەکاربەر لە مانگێکدا ٢٠٠-٣٠٠ هەزار تومان دەرامەتی بێ. رەنگە نیو ملیۆن تومان دەرامەتی بێ، رەنگە ٣٠، ٤٠ هەزار تومان دەرامەتی بێ، لە هەموو حاڵەتەکاندا فەرق ناکات و دەوڵەت "عادیلانە" و بە (یەکسانی) بۆ هەموان هەر جارەی کە تەنکی ئوتومبیلەکەی خۆیان پڕدەکەن بەلای کەمەوە (١٥٠٠) تومان یارمەتیان دەدات بەبێ بەرامبەر. پاشانیش سکاڵا دەکەین کە بەکاربردنی بەنزین و بەرهەمە نەوتیەکانی دیکە لە ئێراندا بێ بەرنامەیە، شارەکان پیس بوون، ژینگە خراپ بووەو هەتا دوایی. لە وڵاتە دراوسێکانی ئێمەدا کەمترین نرخ هی پاکستانە کە نرخی بەنزین لیتری ٢٠٠ تومانە. هەمان بار سەبارەت بە نانیش هەیە. دەوڵەت لە ساڵێکدا (٥٠٠) ملیار تومان زیانی نان دەدات. یەعنی لە ساڵێکدا بۆ هەرکەسێك نزیکەی (٨٥٠٠) تومان دەدات. خێزانێکی (٥) کەسی لە ساڵێکدا ٤٢ هەزار تومان بۆ زەرەری نان لە دەوڵەت وەردەگرن. ئەم مەبلەغەش هەروەکو زەرەری بەنزین "عادیلانە" و بەچاوپۆشی لە دەرامەتی خێزانەکان بۆ هەموان خەرج دەکرێ.

خێزانێکی (٥) کەسی بە (٣٠٠) هەزار تومان دەرامەتی مانگانەوە هەمان مەبلەغ وەردەگرن کە خێزانێکی (٥) نەفەری دیکە بە دەرامەتی (٥٠) هەزار تومانەوە لە مانگێکدا وەری دەگرن. شتەکانی دیکەش بەهەمان شێوە: کارەبا ٩٦٠ ملیار تومان، چا، شیر، ئاو، گۆشت و هەتا دوایی* بۆ پەی بردن بەوەی کە ئەمانە چ کارەساتێکن بۆ ئابووری وڵات خراپ نییە کە بزانین خەرجی گشتی وڵات لە ساڵی ١٣٧٨-(١٩٩٩)دا، نزیکەی (٩٠٠٠) ملیار تومان کە لەم بودجەیە (٣٠٠٠) ملیار تومانی بۆ خەرجی گشتی ئاوەدان کردنەوەیە. (باقیەکەی بۆ خەرجی وەکو موچەو هەموو خەرجیەکانی دیکەیە) زەرەری نەوت، بەنزین و گازۆیل بەتەنها بەرامبەر سێیەکی هەموو بودجەی ئاوەدانکردنەوەی وڵاتە، باری ئابووری لەمجۆرە لە کەم وڵاتی جیهاندا هەیە. لە وڵاتەکانی دیکە دەوڵەت بەهای بەرهەم هێنان و سەرەڕای ئەویش کەمێك قازانجی کاڵاکانیش وەردەگرێ و لە بەرامبەریشدا راستەوخۆ یارمەتی چین و توێژە کەم دەرامەتەکان دەدات. بەڵام لە ئابووری ئێمەدا، بەرژەوەندی و قازانجی درێژخایەن دەبن بە قوربانی و بەلاگەردانی بەرژەوەندی و قازانجی کورت خایەن.

ئەو لێکۆڵینەوانەی کە هەندێ لە باڵەکان دەربارەی پێشنیازی زیادکردنی نرخی بەنزین خستیانە روو ئەوە نیشان دەدەن کە ئەولەویەتەکانی ئێمە کامانەن. یەکێ لە رۆژنامەکان لە دژی ئەم پێشنیازە نووسیوویەتی: بۆچی دەوڵەت لە جیاتی زیادکردنی نرخی بەنزین، باج لە خاوەن خانوو ڤیلاکانی باکووری شاری تاران وەرناگرێ[٣]. حسابکردن بۆ گشت و گشت گەری لە کێشەکانی دیکەی ئابووری ئێمەن. لەجیاتی دۆزینەوەی رەگ و ریشەی هۆ واقیعیەکانی کێشە ئابوورییەکان، بەردەوام هەوڵمان داوە بە دروشمی وەکو مەحکوم کردنی "خۆشگوزەرانانی بێ دەرد" و (بێ دەردانی خۆشگوزەران) و "خۆپەرستەکان"، "زالوسیفەتان"، "تیرۆریستانی ئابووری"، "قۆرغکەران"، "ئابووری پێنج"، "بەکرێگیراوە نادیارەکانی دوژمن" "باکوری شارنشینەکان"، "زۆرداران" و سازکردنی شەپۆلی ئاژاوەگێرانەی بەربەرەکانی قازانج خوازان و هەل پەرستان، کێشە ئابوورییەکانمان

* کۆی ئەو یارمەتیەی کە دەوڵەت لە بودجەی ساڵی ١٣٧٨-١٩٩٩دا پێش بینی کردوە جگە لە یارمەتی وزە (کارەبا و سوتەمەنی یان وزە) ٧٠٠ ملیار تومانە (واتە نزیکەی ١|٤) بودجە گشتی ئاوەدانکردنەوەی وڵات)

چارەسەر بکەین. ئەو شێوازانەی کە بۆ ماوەیەك سەرگەرمی هات و هاوارو هەڵچوون دەخولقێنن، چەند کەسێکیش دەبن بە قوربانی شەپۆلی "بگیر، بگیر" بەلام کەڵکی ئەم شێوازانە تەنها کزبوونی زیاتری ئاسایش، هەلاتنی زیاتری سەرمایەکان، و دابەزینی پارەو دارایی زیاترە بەرەو کاری واستەگەری و بازرگانی لەجیاتی کاری بەرهەم هێنان و بەیەك قسە، دروست بوونی نائارامی و پاشاگەردانی زیاتر بووە. بەردەوامیش بە بیانووی پشتیوانی لە چەوساوەکان ئەم شێوازانە بەکارهاتوون. لە مەسەلەی دژایەتی زیادکردنی نرخی بەنزیندا، زۆر کەس هۆی دژایەتیەکەیان بە پشتیوانی لە چەوساوەکان (موستەزعەفین) و توێژە بێبەشەکان راگەیاند. بەلام واقیعی تاڵ ئەوەیە کە ئەوانەی بەشێوەیەکی سەرەکی خێر لە یارمەتی نزیکەی هەزار ملیار تومانی بەنزین دەکەن، لە راستیدا چین و توێژە خۆشگوزەرانەکانن. بەپێی ئامار، نزیکەی نیوەی یارمەتی بەنزین دەچێتە گیرفانی (١٠٪)ی خۆشگوزەرانترین توێژی کۆمەڵگا وە (بەرزترین رێژەی دەرامەت) و لە بەرامبەردا (١٠٪)ی خوارەوەی کۆمەڵ (نزمترین رێژەی دەرامەت تەنها (١٪)ی پێدەگات بە واتایەکی دیکە، دەوڵەت ساڵانە نزیکەی (٤٠٠) ملیار تومان یارمەتی بەنزین بە (١٠٪)ی خۆشگوزەرانترین توێژی کۆمەڵ دەدات. ئەمەش بێجگە لەو یارمەتیانەی کە بۆ نان، کارەبا، ئاو، گۆشت، رۆن، شیر، شەکری کەللەو وردەو.. بەو خەڵکانە دەدات کە بە هیچ جۆرێ پێویستیان پێی نییە. بە چ لۆجیکێك دەتوانرێ ئەم شێوەیە بە پشتیوانی لە چەوساوەکان ناوبرێ؟

ئەمانە کەم و کورتی و کێشە بنچینەکانی ئابووری ئێمەیە کە نە خاتەمی دروستی کردون و نە بەتەنها حکومەتەکەی ئەو توانای رووبەڕووبوونەوەی ئەو کێشانەی هەیە. دژوارییە بنەڕەتیەکانی ئابووری ئێمە لەگەڵ، کەم بوونەوەی نرخی نەوت لە بازاڕەکانی جیهان و ئەو کەش و هەوا سیاسی و کۆمەلایەتیە تاڕادەیەك گرژەی کە لە (٢)ی خوردادی ٧٦((٥)ی ٩٧) بەدواوە بەسەر ولاتدا زاڵ بووەو باری ئابووری ولاتی لە جاران خراپتر کردووە. گومان لەوەدانییە کە باری خراپی ئابووری هیچ یارمەتیەکی خاتەمی نادات و بێگومان لە جەماوەرێتی کەم دەکاتەوە. بەلام وادیارە کە خراپی ئابووری هەتا ئێستا هێندە ئەنجامی خراپی بۆ خاتەمی نەبووبێ. هۆی ئەمەش لەوەدایە کە زۆربەی خەڵك لەو باوەڕەدان کە (لێناگەڕێن خاتەمی ئیش بکات"

بە چاوپۆشی لەوەی کە ئەم بۆچوونە تا چ رادەیەك راستەو ئایا جوڵەنەکردنی راستەقینە بەرەو ریفورمی بنچینەیی ئابووری لەلایەن حکومەتەکەی خاتەمیەوە بەهۆی رێگەنەدانی باڵی راستەوەیە یان لە کرداری لاوازانەی بەرپرسانی حکومەتەکەی خاتەمیەوە سەرچاوەی گرتووە، بە کردەوە زۆربەی خەڵك بەلای بەشی یەکەمی پرسیارەکەدا دایانشکاند. هێشتا خەڵك ئامادە نین لەبەر باری خراپی ئابووری خاتەمی بە کەمتەرخەم بزانن. بەڵام پرسیاری بنەڕەتی ئەوەیە کە ئەم باوەڕە تا چ کاتێ بەردەوام دەبێ. ئایا ساڵی داهاتووش خەڵك خاتەمی بە بەرپرسی باری خراپی ئابووری نازانن؟ رەنگە هێشتا ئاوابێ، بەڵام رەنگە بەرەبەرە ئەم باوەڕە کاڵ بێتەوە. نەك ئەوەی کە خەڵك باری خراپی ئابووری بەزۆر بخەنە ئەستۆی خاتەمی بەڵکو سەبارەت بە توانای خاتەمی لە چارەسەرکردنی کێشە ئابوورییەکان هیوا بڕاو بن. رەنگە چەند بەشێکی فراوان لەو کەسانەی کە لە (٢) خورداددا دەنگیان بۆ خاتەمی دا بەرەبەرە بگەنە ئەو باوەڕەی کە خاتەمی نەیتوانیوەو ناتوانێ کارێك بۆ ئابووری بکات. ئەوسا چاوپۆشی لەوەی کە "نەیان هێشت" یان خۆی "نەیتوانیوە" ئیتر بەلایانەوە زۆر گرنگ نابێ کە کەمتەرخەم کێیەو کام باڵەیە. لە روانگەی ئەوانەوە خاتەمی بەراستی نەیتوانیوە کێشە ئابوورییەکان چارەسەر بکات و ئومێدێکیش بە چارەسەرکردنیان لەلایەن ئەوەوە لە ئایندەدا نییە. لەبەر ئەوە چیتر حەز بە پشتیوانی لە خاتەمی ناکەن.

باڵی راست حسابێکی زۆر لەسەر ئەم ئەگەرە دەکات و بەشێك لە ستراتیژی خۆی لەم پێناوەدا تەییار کردووە بۆ ئەوەی ئەوە بخاتە مێشکی خەڵکەوە کە کەمتەرخەمی سەرەکی باری خراپی ئابووری وڵات سیاسەت و کردەوەکانی حکومەتەکەی خاتەمییە. لەوانەش جەختی خاتەمی لەسەر گەشەکردنی سیاسی و کۆمەڵگای مەدەنی، لەجیاتی گەشەکردنی ئابووری، وڵاتی دوچاری ئەو وەزعە کردووە. نەیارانی خاتەمی هەرکاتێ کە رووبەڕووی جوڵانەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی خاتەمی دەبنەوەو کەیفیان پێی نایە، یەکسەر بە گلەیی و رەخنەوە ئەوەی بە بیر دێننەوە کەوا باشترە لەجیاتی بایەخدان بە مەسەلە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان دەست بە چارەسەری کێشەو مەسەلە ئابوورییەکان بکات. باڵی راست ئومێدەوارە تا لەم رێگایەوە یەکەم سیاسەتی کرانەوەی خاتەمی بێبایەخ بکات، دووەم چەمکەکانی

وەکو "کۆمەڵگای مەدەنی" و "گەشەکردنی سیاسی" بە هاوتای نائارامی و پاشاگەردانی سیاسی و خراپ بوونی ئابووری بناسێنێ. ئەوەی کە راستیە ئەوەیە، چەند بەشێکی بەرچاو لە ژنان، لاوان، رۆشنبیران، زانکۆییەکان، خوێندکاران، خوێندکارانی زانکۆو توێژی خوێندەواران. وەکو جاران و سەرەڕای خراپتر بوونی باری ئابووری هێشتا بە دڵسۆزی خاتەمی دەمێننەوە؛ بەڵام عەقڵی ساغڵەم حوکمی ئەوە دەکات. کە دەبێ لەو خاڵەش خافڵ نەبین کە ئابووری دەتوانێت وەکو "پاژنەی ئاشیل" بۆ حکومەتەکەی خاتەمی رەفتار بکات و گرفتاری بکات.

ئەوەی کە هاوکێشەی باڵی راست و خاتەمی ئاڵۆزتر دەکات، ئەگەری هاتنە مەیدانی هاشمی رەفسنجانی‌یە وەکو کاندیدی سەرکۆماریی باڵی راست، بەتایبەتی رەوتە توندڕەوەکانی هەروەکو دەزانین دژایەتی هاشمی رەفسنجانی نیشان دەکرد. بەڵام ئەزموونی هاشمی هەندێ لەوانەی وریا کردۆتەوە و بێگومان لەنێوان هاشمی و خاتەمی دا یەکەمیان هەڵ دەبژێرن. جگە لەوەش، بەشێك لەوانەی هاودەنگی هاشمین واتە باڵی "کارگوزارانی سازندەگی"یش بێگومان بەهاتنە مەیدانی هاشمی بۆ ململانێی هەڵبژاردنی سەرکۆمار پشتیوانی لێ‌دەکەن. هەرچۆنێك کارگوزاران پێناسە بکەین ناکرێ خۆمان لەو راستیە بدزینەوە کە رابەری فیکری و سیاسیان هاشمی رەفسنجانی‌یە.

هەموو ئەم سەرنجانە پێویستیان بە گریمانەیەکی بنچینەیی هەیە. ئایا باڵی راست، بە تایبەتی بەشە توندڕەوەکانی، ئامادە دەبن کە بنەماکانی ململانێی دیموکراسی رەچاو بکەن، رێز لە رای خەڵك بگرن و هەتا خوردادی ١٣٨٠ (مانگی (٥) ٢٠٠١) لەگەڵ خاتەمی‌دا هەڵ بکەن؟ یان ئەوەی دنیای لێ دەکەن بە چەرمە چۆلەکە بۆ ئەوەی نەتوانێ درێژە بەکارەکانی بداو دەست لەکار بکێشێتەوە. یان ئەوەی خراپتربوونی باری سیاسی، زیادبوونی نائارامی و زاڵبوونی نائەمنی، ئاخری زەمینە بۆ وازهێنانی خۆش دەکا و بەسەرنجدان لە زۆرینەی باڵی راست لە پەرلەماندا دەنگی متمانەی پێ نادەن و زەمینەی روخانی حکومەتەکەی خاتەمی فەراهەم دەکەن.

هەندێ لە لایەنگرانی خاتەمی بەحسابکردن بۆ رادەی خۆشەویستی لەلایەن خەڵکەوە پێیان وایە کە باڵی راست بە سەختی دەتوانێ حکومەتەکەی خاتەمی

بڕوخێنێ. بەڵام ئەم بۆچوونە ڕاست نی‌یە. خاتەمی تا ڕادەیەکی زۆر لای خەڵك خۆشەویستە، بەڵام ئامرازەکانی دەسەڵات لە دەستی نەیارانی‌دایەو لەکاتی پێویستدا بە بەکارهێنانی کەمێك فشار یان توندوتیژی بە ئاسانی ئەگەری بەربەرەکانی لایەنگرانی خاتەمی تێك دەشکێ. باڵی ڕاست بە پشتیوانی (٣|١)ی دانیشتوانی وڵات بەلای کەمەوە ئامرازەکانی دەسەڵات و پشتیوانی (ئەنجومەنی خیرگان)، ئەنجومەنی شورای ئیسلامی (پەرلەمان) و داوەری بە ئاسانی دەتوانێ بە تەواوی فەرمان ڕەوایی وڵات بگرێتە دەست و بەبێ دودڵی لە ماوەیەکی کورتداو بە پێچەوانەی بۆچوونی هەندێ لە لایەنگران و یاریدەدەرانی خاتەمی‌یەوە، باڵی ڕاست زۆر ئاسانتر لەوەی کە نەیارانی ئەم باڵە وێنای دەکەن دەتوانێ "بەڕەی (٢) خورداد" بپێچێتەوە. هەم بەڵگەی شەرعیان هەیەو هەم "بۆ ڕزگارکردنی ئیسلام و شۆڕش" ئەو پێچانەوەیە (لوول کردنە) بە پێوست نیشان دەدەن، هەم بۆ ئەنجامدانی کارێکی لەو جۆرە هەست بە "ئەرکی" سەرشانیان دەکەن، هەم بۆ پووچەڵ کردنەوەی پیلانە بەربلاوەکانی ئیستکبار لە دژی ئیسلام و شۆڕشی ئیسلامی ئەو جولانەوەیە بە پێویست دەزانن، و هەم ئەوەی کە "خێزانی شەهیدان، گیانبازان، دیلەکان، ئەوانەی چوونەتە بەرەی جەنگ، حزبوڵلایی‌یەکان و لایەنگرانی ڕاستەقینەی ئیسلام و شۆڕش" ئەوەیان خواستووە. بەم نزیکانە هیچ کێشەیەك ڕوونادات. بەڵام پرسیاری سەرەکی ئەوەیە کە لەماوەی درێژخایەندا بۆچوونی باڵی ڕاست لە بەرامبەر حکومەت و شێوەی بەڕێوەبردنی وڵات و بەشداری خەڵك و ئازادی‌دا چی دەبێت؟ ئایا پێویستی بە پشتیوانی و هاوکاری چین و توێژە خوێندەوارەکان و دەستە بژێرە سیاسیەکان دەبێت، یان بەبێ پشتیوانیەکی لەو جۆرەش دەڵێت کە دەتوانرێ لە ماوەیەکی درێژدا، سیستمێکی کارامەو گۆڕاو و هاوچەرخ دابمەزرێنرێ. ئایا بەبێ پشتیوانی چەند توێژێکی فراوان لە (طلاب) و ڕوحانیەکان، خوێندکاران، نووسەران، زانکۆییەکان، خوێندەواران و پسپۆڕان، ژنان و لاوانی کۆمەڵ، دەتوانرێ بۆ ماوەیەکی درێژ سیستمێکی ئیسلامی خەڵك سالار دابمەزرێنرێ و وڵات بەڕێوە ببرێ؟

مەسەلەیەکی دیکە بریتی‌یە لە ڕەهەندی دەرەکی و پەیوەندی نێودەوڵەتی. بۆ سەپاندنی بۆچوونی خۆی بەسەر زۆرینەی کۆمەڵدا، باڵی ڕاست ناچار دەبێ کە پەنا بۆ بەکارهێنانی زۆر بەرێ. ڕاستی ئەوەیە کە لەمڕۆ لە ساڵەکانی کۆتایی سەدەی

بیستدا، هەر ڕۆژەی لە ڕابردوو زیاتر لە ژمارەی سیستەمە دەسەڵاتخوازەکان کەم دەبێتەوە. لە ناوچەکەو جیرانێتی خۆمان ئەگەر بەسەر عیراق و ئەفغانستان دا بازبدەین کە هەردووکیان حاڵەتی تایبەتیان هەیە، لە باقی وڵاتەکان لای کەمی دیموکراسی بەدی هاتووە. سەرەڕای کۆنترۆڵکردنی (٩٠٪)ی خاکی ئەفغانستان لەلایەن تالیبانەوە هەتا یەك وڵاتیش لە جیهاندا ئامادە نەبوو بە ڕەسمی دانیان پێدابنێ. (بێجگە لە پاکستان و ئیماراتی و عەرەبی و عەرەبستان کە هەڵبەتە بەرلەوە بەرەسمی دانیان بە تالیباندا نابوو) پێشێل کردنی مافە سەرەتاییەکانی مرۆڤ لەلایەن تالیبانەوە بە شێوەیەك بوو کە رای گشتی لەسەر ئاستی دنیا ڕێگە نەدات هەتا ئەو وڵاتانەش کە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ یارمەتیان دابوون، بە ڕەسمی دان بە تالیباندا بنێن. لە تورکیا عەسکەرییەکان هەتا کەناری کودەتا ملیان نا بەڵام یەکێ لەو هۆ سەرەکیانەی کە عەسکەرییەکانی لە چرکاندنی پەلەپیتکە پەشیمان کردەوە نارەزایی رای گشتی نێودەوڵەتی بوو بە کودەتای سەربازی. یەکێتی ئەوروپا بەیەك دەنگ و بە توندی عەسکەرییەکانی تورکیان لە دەستدان لە کودەتاو دروست کردنی حکومەتێکی سەربازی وریاکردەوە. ئەمریکاییەکانیش بە هیچ شێوەیەك عەسکەرییەکانیان هان نەداو کودەتایان بە ڕێگەچارەیەکی عەمەلی نەزانی بۆ چارەسەرکردنی کێشە سیاسیەکانی ئەو وڵاتە. لە تاجیکستان حکومەت ئاخری ناچاربوو مل بە جۆرێ سازش بدات لەگەڵ نەیارە ئیسلامیەکانی خۆیدا. کاربەدەستانی سعودیە ناچار بەرەو کۆمەڵێ ریفورمی سیاسی و کۆمەڵایەتی ملیاننا.
هەڵبەتە هێشتا ڕژێمە ئیستبدادیەکان لە سوریا، کۆریای باکوور، بۆرما، جەزایر، عێراق و ژمارەیەکی دیکە لە وڵاتان لەسەر کارن؛ بەڵام بە نیسبەت بیست، سی ساڵی پێش ئێستاوە کە فەرمانڕەوایی ڕژێمی لەو جۆرە لە ئەمریکای لاتین، ئاسیا، ئەفریقاو ئەوروپای خۆرهەڵات ستەمی دەکرد، جیهان تەواو لەو ڕژێمانە دوورکەوتۆتەوە. ڕژێمە سەربازییە ڕاست ڕەو و سەرکوت کەرەکان لە بەرازیل، ئەرجەنتین، چیلی، مەکسیك، کولومبیاو نیکاراگوا، جێگای خۆیان بە چەند سیستمێ داوە کە تیایاندا بەهەرحاڵ پلەیەك لە مافی مرۆڤ و ئازادی ڕێزی لێ دەگیرێ.

"کۆمەڵگای مەدەنی"، "سەروەری یاسا"، "حزبایەتی"، "بەشداری سیاسی" بەیەك وتە، گەشەکردنی سیاسی، چەند مەفهومێك نین کە بە ئارەزووی خۆت هەڵیان

بژێری. لە جیهانی ئەمڕۆدا ئەم چەمکانە وەکو واقیعێکیان لێ هاتووە کە قابیلی خۆلێلادان نین. دەتوانرێ بە باشترین شێوە ئەم پێویستیانە لە وڵاتەکانی باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا وەکو کۆریای باشوور، مالیزیاو ئەندۆنیزیا بەدی بکرێ کە سەرەڕای پێشکەوتنی سەرسوڕهێنەرانەی ئابووری لەبەر کەمتەرخەمی لە ریفۆرمی سیاسی و کۆمەڵایەتی دوچاری قەیرانێکی قووڵی دارایی بوون.

سەرەڕای قبوڵ نەکردنی کێشەکان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، لە ناوخۆشدا بەکارهێنانی دەسەڵاتی رەهاو زۆردارانە بۆ ماوەیەکی درێژ رووبەڕووی کێشەی دیکە دەبێتەوە. هەرچۆنێك لە شۆڕشی ئیسلامی بڕوانین و پێناسەی بکەین، بواری هەڵاتن لەو راستیە نی‌یە کە بەهەرحاڵ بەشێك لە ئاوات و ئارەزووەکانی یان ئامانج و مەبەستەکانی ئەو شۆڕشە، لە بنەڕەتدا دژایەتی بووە لەگەڵ رژێمی شادا بە مەبەست بەدەست هێنانی ئازادی و خەبات لە دژی زۆرداری و خەفەکردن و دیکتاتۆری. هەروەکو پێشان ئاماژەمان بۆ کرد، ململانێکانی دوای شۆڕش، شەڕ لەگەڵ عێراق پێویستی بیناکردنەوەی وڵات لە دوای شەڕ بێگومان ریفۆرمە سیاسیەکانیان خستە ژێر کاریگەری خۆیانەوە. بەڵام بەبێ هیچ دوودڵیەك شۆڕشی ئیسلامی کەش و هەوایەکی نوێی لەگەڵ خۆیدا هێنا. ئەوەی کە لە (٢)ی خورداددا روویدا، نە دیاردەیەکی تازە بوو نە شتێکی زیادەتر بوو لە خواست و ئاواتەکانی شۆڕشی ئیسلامی. ئەوەی کە لە (٢) خورداد بە دواوە هاتۆتە پێشەوە لە راستی‌دا درێژەی بەدی‌هاتنی داخوازییەکانی شۆڕشی ئیسلامی‌یە کە لەبەر کێشەو مەسەلەکانی ئەم (٢٠) ساڵەی دوایی دواکەوتبوو.

لەلایەکی دیکەوە، ئەو گۆڕان و ئاڵوگۆڕانەی کە لە ماوەی (٢٠) ساڵی رابردوودا لە ئێران روویدا کاریگەری راستەوخۆی لەو داخوازیانە کردووەو بەنۆرەی خۆی ئەو داخوازییانەی فراوانتر و قوڵتر کردووە. لەوانەش گۆڕانی پێکهاتەی دانیشتوانی ئێرانە لە ماوەی (٢٠) ساڵی رابردوودا. گەشەکردنی خێرا و بێ بەرنامەی دانیشتوان بۆتە هۆی ئەوەی کە بەشێکی بەرچاو لە دانیشتوانی ئێران لاوان پێکی بێنن. لە ماوەی یەك ساڵی رابردوودا چەند جارێك لاوان لە مەیدانی سیاسی و کۆمەڵایەتی‌دا ئامادە بوونی خۆیان نیشان داوە. چۆن دەتوانرێ چاوەڕوانی ئەوە بکرێ کە

سیستمێکی سیاسی بەبێ لەبەرچاوگرتنی داخوازیو پێویستیەکانی ئەم نەوەیە بتوانێ بەبێ کێشە فەرمان رەوایی بکات. پەرەسەندنی خوێندنی بالاّو زانکۆکان گۆڕانێکی گرنگی دیکە بووە. لە ساڵی ١٣٥٧ (١٩٧٩)دا کە شۆڕشی ئیسلامی هەڵگیرسا ژمارەی گشتی خوێندکاران لەسەر ئاستی ولاّت (١٠٠) هەزار بوو. بەلاّم لە ماوەی (٢٠) ساڵی رابردوودا ئەم ژمارەیە بوو بە (١) ملیۆن و (٣٠٠) هەزار. پێویست بە قسە لەسەرکردن ناکات کە زیادبوونی خوێندکاران لەسەر ئاستی ولاّت بۆ (١٣) ئەوەندە، بەتایبەتی لە بواری مەسەلە سیاسیەکاندا ئەنجامی گرنگی دەبێ. وا دیارە یەکێ لە هۆیەکانی سەرکەوتنی خاتەمی لە هەڵبژاردنی (٢) خورداددا بەند بوە بە بەشداری کاریگەرانەی ژمارەیەکی زۆر لە خوێندکارانەوە بە قازانجی خاتەمی. لە زۆربەی ناوچەکاندا بەتایبەتی لە شارۆچکە بچووکەکاندا هەندێ لە کەس و کاری خوێندکاران بە کاریگەری خوێندکاران دەنگیان بۆ خاتەمی دا*

سەرەڕای ئەمە هەروەکو دەبینین جەماوەری خوێندکاران بوون بە یەکێ لە هێزە سیاسیە کاریگەرەکان لە ولاّتدا. ژنان و دەوری کۆمەلاّیەتی ژنان رەگەزێکی دیکەیە کە لە ماوەی (٢٠) ساڵی رابردوودا هاتوونەتە ناو هاوکێشەی سیاسی کۆمەڵگاوە. بەر لە شۆڕش، ژمارەی کچانی خوێندکار نەدەگەیشتە کەمتر لە سێیەکی کۆی گشتی خوێندکارانیش. بەلاّم ئەمڕۆ ئەم ژمارەیە بەگشتی (٤٥٪) زیاترە لە هەندێ لە بەشەکاندا ژمارەی خوێندکارە کچەکان هەتا لەهی خوێندکارە کوڕەکانیش زیاترە. بێگومان زیادبوونی بەرچاوی کچانی خوێندکار کاری لە پشکیان کردووە لە بازاڕی کاریشداو دەبێ هەموو ئەنجامەکانی ئەم گۆڕانکارییە لەبەرچاو بگیرێ کە ناکرێ خۆی لێ لابدرێ.

کرانەوەی کەش و هەوای سیاسی ولاّت کە ئەنجامی حەتمی شۆڕشی ئیسلامی بووە گۆڕانێکی گرنگی دیکەی کۆمەڵگای ئێران. ئەگەرچی هێشتا حزبایەتی بە مەعنای وشەکە نەچۆتە پێکهاتەی سیاسی ئێرانەوە. بەلاّم لە ماوەی (٢٠) ساڵی

---

* بۆ نموونە لە پارێزگای کرمان، خوێندکاران و نەوەی نوێ کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو لەسەر شێوەی دەنگدانی پیرەکان.

رابردوودا ڕێكخراوی سیاسی ڕەسمی و ناڕەسمی سەریان هەڵداوەو لەگەڵ یەكتردا چوونەتە ناو مەیدانی نەبەردە سیاسی و كۆمەڵایەتیەكانەوە. "ڕۆحانیەتی خەباتگێڕ"، "كۆمەڵەی ڕوحانیە خەباتگێڕەكان"، "گروپەكانی هاوپەیمانی ئیسلامی"، "مەكتەبی سەقامگیركردنی یەكێتی"، "ڕێكخراوی مجاهدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێران"، "كۆمەڵەی مامۆستایانی حەوزەی عیلمیەی قوم"، "كارگوزارانی سازندگی"، "كۆمەڵەی مامۆستایانی توێژەرانی حەوزەی عیلمیەی قوم" بەهەرحاڵ ئەو ڕێكخراوانەی كە لە ماوەی یەك ساڵ و نیوی ڕابردوودا دروست بوون. تۆوی سەرەتایی حزبایەتیان لە كۆمەڵگای ئێرانیدا چاندو لەوە ناچێ هەوڵدان بۆ داخستن یان بێ دەنگ كردنی ئەم ڕەوتانە بۆ ماوەیەكی زۆر كارێكی هێندە ئاسان بێ.

سەرئەنجام دەگەینە ئەو كەش و هەوایەی كە لە دوای (٢)ی خورداد لە وڵاتدا سەری‌هەڵداوە. شیكردنەوەو لێكۆڵینەوەی وردی ئەوەی كە ئەم كەش و هەوا تازەیە لەگەڵ خۆیدا هێناویێتی یەكەم لە دەرەوەی سنووری كارەكەی ئێمەیە، دووەم خۆی، شیكردنەوەو توێژینەوەیەكی زیاتری دەوێ و سێیەم ئەم گۆڕانە هێشتا لە سەرەتای خەملێن دایە. گەشەكردنی چەندایەتی‌و چۆنایەتی چاپەمەنی، ئازادی چاپەمەنی، سازدانی كۆبوونەوەو میستنگی سیاسی لە زانكۆكان و لەسەر ئاستی وڵات. دەربڕینی باسی سیاسی و كۆمەڵایەتی لە دەزگاكانی ڕاگەیاندنی وڵاتدا، باسكردنی گوتەی لە بابەتی كۆمەڵگای مەدەنی، سەروەری یاسا، ئازادی چاپەمەنی، ئازادی ڕادەربڕین، حزبایەتی، بەشداری سیاسی، گەشەكردنی سیاسی، و لەم بابەتە بەبێ دودڵی ئاستی هوشیاری سیاسی و كۆمەڵایەتی لەسەر ئاستی وڵات زۆر فراوانتر كردووە. زۆر لە لاوان و نەوجەوانان لە ماوەی یەك ساڵ و نیوی ڕابردوودا بە ئەندازەی چەند ساڵێك سەبارەت بە مەسەلە سیاسی و كۆمەڵایەتیەكان وریا بوونەتەوەو ڕوویان تێ كردووە بە نیسبەت ڕابردووەوە هوشیار تر بوون. ئەو باسانەی كە بە تایبەتی هەندێ لە چاپەمەنی و كەسایەتیە مەزهەبی و سیاسیەكان وروژاندنیان، ئەو مەیدانانەی كە هەندێ لە چاپەمەنی و كەسایەتیە مەزهەبی و سیاسیەكان خۆیان پێداكرد، ئەو بۆچوون و ئەگەرانەی كە (٢)ی خورداد لەگەڵ خۆیدا هێنای بەبێ دوودڵی چەند ئاسۆیەكی تازەی لە مێشك و بیری زۆربەی خەڵك و بەتایبەتی لای گەنجان و زانكۆییەكان هێناوەتە ئاراوە.

باڵی ڕاست بە ئاسانی چەند بەشێکی سەرەکی لەوەی کە لە ماوەی (٢٠) ساڵی ڕابردوو و بەتایبەتی لە دوای (٢)ی خوردادەوە ڕوویداوە تەفروتونا بکات، بەڵام چۆن ئاسۆکان، چاوەڕوانیەکان و لەوەش باڵاتر هوشیاری وریابوونەوە بە دەست هاتووەکانی ئەو ماوەیە لەناو دەبات؟ باڵی ڕاست دەتوانێ بە ئاسانی ڕۆژنامەکان دابخات حکومەتەکەی خاتەمی ئیفلیج بکات، نووسەران و ڕۆشنبیران بێ دەنگ بکات، بەڵام ئایا هەتا سەر دەتوانێ میلی کات بەرەو دواوە بەرێ و بیباتەوە بۆ پێش خوردادی ١٣٧٦ و ٢٢ بەهمەنی ١٣٥٧ (١٩٧٩/٢/١١)؟

**سادقی زیبا کەلام**
**مانگی (دی) ١٣٧٧**
**مانگی (١) ١٩٩٩**

## پەراوێزەکان

*١-بە وەرگرتن لە ئاغای ئاغایی، جێگری وەزیری نەوت ڕۆژنامەی جمهوری اسلامی، ١٩٩٩/١/١٥.*

*٢-بە وەرگرتن لە ئاغای مهندس بیژن زنگنە، وەزیری نەوت ڕۆژنامەی زن ١٩٩٨/١٢/٣*

*٣-کیهان ١٩٩٨/١٢/٢.*

*٤-همشهری ١٩٩٨/١٢/١٠.*

# پێشەکی

لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی‌یەوە، لەناو دەستەی فەرمان ڕەوایی سیستمی کۆماری ئیسلامی ئێراندا فۆرمەڵە بوونی دیاردەی (باڵکاری) بەدی دەکەین. مەبەست لە باڵکاری ئەوەیە کە دەربارەی مەسەلە بنچینەییە سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیەکان لەناو دەستەی فەرمان ڕەوایی ئێراندا جیاوازی بیروبۆچوون هەیە کە بۆتە هۆی ئەوەی کە لە ماوەیەکی درێژدا بۆچوونە نزیکەکان لە دەوری یەک میحوەر کۆببنەوە.

باڵە سیاسیەکان تایبەتمەندی حزبێکی سیاسیان نی‌یە. چونکە حزبەکان پەیڕەو پرۆگرامیان هەیە. لە کاتێکدا کە باڵەکان پەیڕەوو پرۆگرامیان نی‌یە. ئەگەرچی هەندێ لەو گروپ و حزبانەی کە لە چوارچێوەی ئەم باڵانەدان خاوەنی پەیڕەو پرۆگرامیشن.

حزبەکان بەرنامەی کارکردنی نووسراویان هەیەو کادر ئامادە دەکەن، لە کاتێکدا کە باڵەکان بەرنامەی کارکردنی نووسراویان نی‌یەو کادر ئامادە ناکەن و دەتوانین لە ماوەی درێژدا هەڵوێستی جیاجیایان لێببینین؛ بەپێی ئەزموون و هەڵەکردن هەڵوێستیان دەگۆڕێ. حزبەکان لە سەرانسەری وڵاتدا تۆڕی فراوانیان هەیە کە بە ڕێکخراوە مەرکەزییەکانی خۆیانەوە گرێ دراون. بەڵام باڵەکان تۆڕی لەو جۆرەیان نی‌یەو بە کۆمەڵ کاردەکەن. هەندێ لەوانە وایان پێ باشە کە پەیوەندییان لەگەڵ خەڵکدا ئاسایی بێ، نەك لە چوارچێوەی حزبایەتی‌دا. حزبەکان بۆ چالاکی سیاسی و دەسەڵات گرتنە دەست دادەمەزرێن. بەڵام هەندێ لە باڵەکان لەبەر نەبوونی کادری پێویست و بەرنامە بۆ بەڕێوەبردنی وڵات، زیاتر لەوەی بە شوێن بەدەست هێنانی دەسەڵاتەوە بن، سەرقاڵی ئەوەن کە کاریگەری لەسەر هەندێ لە سیاسەتەکان بەجێ‌بهێڵن. حزبەکان پەیڕەوی چەند سیاسەتێکی دیاری کراو دەکەن بەڵام باڵەکان زیاتر بەشێوەی یەك تەوژمی فکری کار دەکەن؛ واتە دەتوانرێ لە ناویاندا مەیلی

جیاواز بەدی بکرێ و خاوەنی یەك هەڵوێستی یەکگرتوو نین. حزبەکان بەشێك لەکۆمەڵ رادەکێشن و بۆچوونی رەهایانەیان نییە. هەندێ لە باڵەکان خۆیان لەسەروو حزبەوە دەبینن و بۆچوونی رەهایانەیان هەیەو بۆچوونەکانی دیکە بە بەتاڵ دەزانن. بەڵام تێڕوانینی لەو جۆرە لەناو چوارچێوەی چالاکی حزبیدا جێگای نابێتەوە. رێکخراو، پێکهاتەیەکە کە لەلایەن کۆمەڵێك کەسی خاوەن ئامانج و رێبازی سیاسی دیاری کراوەوە دامەزراوە. رێکخراوەکان بە بەراورد لەگەڵ باڵەکاندا لە پێکهاتەی حزبی نزیك ترن. رێکخراوەکان پەیوەندی رێکخراوەییان هەیە. لە کاتێکدا کە باڵەکان خاوەنی پێکهاتەی لەو جۆرە نین. رێکخراوەکان ئۆرگانی تایبەتی خۆیان هەیە. و لە بۆنە جیاوازەکاندا بەیاننامە دەردەکەن و هەڵوێست وەردەگرن و هەڵوێستیان بە بەراورد لەگەڵ باڵەکاندا جێگیری زیاتری تیایە. لەو لێکۆڵینەوانەدا کە لە بواری زانستە سیاسیەکاندا دەربارەی مەسەلەکانی ئێران کراون. لەبەر چەند هۆیەکی جیاجیا، لێکۆڵینەوەی گۆڕانە سیاسیەکانی کۆماری ئیسلامی کەمتر بایەخی پێدراوە. چەند بابەتێك هەن کە سەرەڕای گرنگیان، لێکۆڵینەوەیەکی نووسراویان لەسەر نەکراوە، کە باڵکاری لە سیستمی کۆماری ئیسلامیدا لەو بابەتانەیە. ناسینی وردی باڵە سیاسیەکان لە سیستمی کۆماری ئیسلامیداو هەڵوێستەکانیان رۆڵێکی چارەنووس ساز لە پێش بینی کردەوەکانیاندا دەبینێ و توانای شیکردنەوە سەبارەت بە کردەوەی باڵەکان لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی و سەرۆکایەتیدا زیاد دەکات. ئەو خوێندنەوانەی کە تا ئێستا لە بواری باڵکاریدا لە سیستمی کۆماری ئیسلامیدا کراون، لە سنووری چەند وتارێکی رۆژنامەنووسی هەندێ لە بڵاوکراوەکان تێپەڕ نەبوون(١). لەم وتارانەدا، نووسەران بۆچوونی خۆیان سەبارەت بە روانگەی باڵەکان باس کردووەو کەمتر هەوڵ دراوە بە پشت بەستن بە بەڵگەو سەرچاوەکانی ئەو باڵانە بۆچوونەکانیان لێك بدرێتەوە.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا بۆ پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییەو بە پشت بەستن بە بەیاننامەو بڵاوکراوەو لێدوانی کەسانی سەر بە باڵەکان و هەڵوێستیان لە ماوەی ساڵانی (١٣٧٤-١٩٩٥) تا خوردادی (١٣٧٦-١٩٩٧) مەسەلەکان بێئەوەی حوکمیان لەسەر بدرێت، باسکراون. ئەم ماوەیە لە چەند روویەکەوە گرنگی هەیەو دەتوانرێ وەکو

بەشێکی سەربەخۆ لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی چالاکی باڵەکان لە سیستمی کۆماری ئیسلامی‌دا ببێتە مایەی سەرنج و لێکۆڵینەوە.. لەم ماوەیەدا هەردوو (حزبی) کارگوزاران و کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی لەدایك بوون. هەروەها دوو هەڵبژاردن لە ئێراندا بەڕێوە چووە. هەڵبژاردنی خولی پێنجەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی لە ئەسفەندی ١٣٧٤ (مانگی (٣) ١٩٩٥) و هەڵبژاردنی سەرکۆمار لە خوردادی ١٣٧٦ (مانگی (٥) ١٩٩٧). ئەم گۆڕانکاریانە یارمەتی زیاتر (روون بوونەوەی) هەڵوێستی باڵەکانی‌داو چالاکی باڵ و باڵکاری بردە قۆناغێکی تازەوە لە کۆماری ئیسلامی ئێران. دەتوانین دیارترین تایبەتمەندی ئەم قۆناغە بە رووبەڕووبوونەوەی باڵەکان لە جیاتی کەسەکان دەستنیشان بکەین پرسیاری سەرەکی لێکۆڵینەوەکە ئەوەیە کە ئایا هەڵوێستی سیاسی و ئابووری و فەرهەنگی باڵەکان لە سیستمی کۆماری ئیسلامی ئێراندا لە رەوتی چالاکی سیاسی و سەبارەت بە رادەی کارتێکردنی بۆ سەر گۆڕانە سیاسیەکان پەیڕەوی یەك هەڵوێست دەکات؟ گریمانەی سەرەکی ئەوەیە کە دیدگا سیاسی و ئابووری و فەرهەنگیەکانی هەریەکە لە پێکهاتە سیاسیەکان لە سیستمی کۆماری ئیسلامی ئێراندا لە رەوەندی چالاکی سیاسی و سەبارەت بە کارتێکردن لە گۆڕانکاریە سیاسیەکان پەیڕەوی یەك هەڵوێست ناکەن.

میتۆدی لێکۆڵینەوە لەم توێژینەوەیەدا کتێبخانەیی‌یەو لەو شوێنانەدا کە زانیاری بەردەست بەس نی‌یە سود لە چاوپێکەوتنیش وەرگیراوە لە بەشی یەکەمدا لە بۆچوونە جیاوازەکان دەربارەی باڵکاری لە سیستمی کۆماری ئیسلامی‌دا کۆڵراوەتەوە. لە بەشی دووەمدا هەڵوێستی سیاسی و ئابووری و فەرهەنگی باڵەکان لە سیستمی کۆماری ئیسلامی ئێراندا لە ماوەی سالانی ١٣٧٤-١٣٧٦ (٩٥-٩٧) باسکراوە. لەم بەشەدا هەڵوێستەکانی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێرو رێکخراوە هاو ئاراستەکانی، کۆمەڵەی روحانیە خەباتگێڕەکان و گروپە نزیکەکان لەوەوە، کارگوزاران، کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی، لایەنگرانی حزبوڵلاو یەکێتی ئەنجومەنە ئیسلامیەکانی خوێندکاران و خوێندکارانی زانکۆکان و مەڵبەندەکانی خوێندنی بالا (پەیامی خوێندکار( لە بواری مەسەلە سیاسی و ئابووری‌و فەرهەنگی‌یەکاندا باس کراوە. لەم بەشەدا بەکەڵك وەرگرتن لە تەوژمی

شوێنی هەریەکێ لە باڵەکان و دووری و نزیکی هەڵوێستیان لە مەسەلە سیاسی و ئابووری و فەرهەنگی‌یەکاندا نیشان دراوە. لە بەشی سێ‌یەمدا بۆچوونی سیاسی و ئابووری و فەرهەنگی باڵەکان لەگەڵ یەکتری‌دا بەراورد کراوە.

لەم بەشەدا لە بواری مەسەلە سیاسیەکاندا لە (١٦) تەوەرو لە بواری مەسەلە ئابووری و فەرهەنگی‌یەکاندا هەریەکەیان لە (٧) تەوەردا هەڵوێستی باڵەکان بەراورد کراوە. هەروەها هەڵوێستی باڵەکان لە بواری مەسەلە سیاسی و ئابووری و فەرهەنگیەکاندا بەکەڵك وەرگرتن لە هێڵی بەیانی و هیستوگرام بەراورد کراوە.

شایانی باسە لە هەندێ جێگەدا بە حسابکردن بۆ پێویستی نەقڵ کردنی راستەوخۆ لە قسە یا سەرچاوەی باڵەکان، رستەکان بەبێ دەسکاری نووسراونەتەوە. تەنها لەو شوێنانەدا کە رستەکە مەفهوم نەبووە چەند وشەیەك زیاد کراوە کە لە ناو کەوانەدا دانراوە.

**١-بڕوانە ئەم سەرچاوانەی خوارەوە:**

*ئەلف. دوو هەفتە نامەی (عصرما) ژمارەکانی ٦ تا ١٢.*

*بێ. جناح بندی سیاسی درنظام جمهوری اسلامی، ایران فردا ژماره ١٧، اردیبهشت ١٣٧٤ (١٩٩٥/٥)*

# بەشی یەکەم

## پێشەکیەك لەسەر ناساندنی باڵكاری 'دەستەگەری' سیاسی لە كۆماری ئیسلامی ئێراندا

### ١-١- بۆچوونە جیاوازەكان دەربارەی دەستگەری لە سیستمی كۆماری ئیسلامی‌دا:

سەبارەت بە باڵە سیاسیەكان لە سیستمی كۆماری ئیسلامی‌دا چەند بۆچونێكی جیاواز لەنێو كەس و گروپەكانی ناوەوەو دەرەوەی سیستمدا هەیە.

دەتوانین ئەم بۆچوونانە لەم تەوەرانەی خوارەوەدا دەستەبەندی بكەین[1].

**ئەلف/ دەستەگەری وجودی نی‌یە:**

بەرای لایەنگرانی ئەم بۆچوونە، لە سیستمی كۆماری ئیسلامی‌دا دەستەگەری بوونی نی‌یە. ئەگەر چەند جیاوازییەكیش هەبێ، گرنگ و سەرەكی نین. بەرای ئەمانە باس و خواس دەربارەی دەستەگەری دەسكردی "بیانیەكانە". پەیرەوانی ئەم بۆچوونە زیاتر لەناو رژێم دان و لە رووی مەیلی سیاسی‌یەوە سەر بە باڵی (كۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێری تاران و رێكخراوە هاوئاراستەكانن). بۆ نموونە سەید رەزای ئەكرەمی كە یەكێكە لە ئەندامانی (كۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێری تاران) دەڵێت: "من ئەو پێناسانەم قبوڵ نی‌یە كە لە قاڵبی دەستەی وەكو چەپ، راست، كۆن و نوێ‌دا هەن بەلای منەوە خەتی ئیمام، پەیرەوی ئیمام، موسوڵمانی پەیرەوی ئیمام، پەیرەوی خەتی ویلایەتی فەقێ، پارێزەری سەربەخۆیی و یەكپارچەیی خاك مەعنای هەیە.. دوو پێناسە زیاتر وجودی نی‌یە پەیرەوی لە خەتی ئیمام سازان لەگەڵیداو خاڵی بەرامبەری"[2]

---

[1] بروانە: جناح بندی سیاسی در نظام جمهوری اسلامی ایران، سعید برزین، ایران خردا، شماره ١٧، ص ٣٦.

[2] روزنامەهای ٧٤/١٢/٦ (١٩٩٥/٢/٢٦).

**ب-دەستەگەری دەسکردی حکومەتە:**

ئەوانەی پەیڕەوی ئەم بۆچوونە دەکەن، باڵەکان بەدەسکردی سیستمی کۆماری ئیسلامی دەزانن. ئەمانە دەڵێن سیستم ئەم مامەڵەکردنەی هێناوەتە ئاراوە کە لەناو حکومەتدا، باڵی جیاوازو هەتا نەیار هەن کە لە نێوانیاندا باس و گفتوگۆی واقیعی سیاسی لە ئارادایە. لەگەڵ ئەوەشدا کە جیاوازی بیروبۆچوون لە نێوانیاندا هەیە پێکەوە دەژین. دەڵێن پیاوانی دەوڵەت ئەم خەیاڵەیان هێناوەتە ئاراوە بۆ ئەوەی خەڵك وا هەست بکەن کە تاڕادەیەك ئازادی لە کۆمەڵدا هەیەو دەتوانین ئومێدمان بەگۆڕینی هەل و مەرجەکان هەبێ لە رێگەی گفتوگۆو شێوازی ئاشتیخوازانەوە. ئەم بۆچوونە لەلایەن هەندێ لە گروپەکانی دژی سیستمی کۆماری ئیسلامی و بەتایبەتی لەلایەن لایەنگرانی پاشایەتیەوە دەخرێتە روو.

**ج-دەستەگەری واقیعی سیاسی نیزامە:**

پەیڕەوانی ئەم بۆچوونە، دەستەگەری ناو کۆماری ئیسلامی بە واقیعی سیاسی نیزام دەزانین و لەو باوەڕەدان بۆ ناسینی پێکهاتەی سیاسی سیستمی کۆماری ئیسلامی، شارەزایی لە هەڵوێست و بۆچوونەکانی ئەم باڵانە لە بواری مەسەلە سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی یەکاندا شتێکی پێویستە. ئێمەش باوەڕمان بەم بۆچوونە هەیەو ئەمەمان کردووە بە بنەمای لێکۆڵینەوەو خوێندنەوەی خۆمان.

لە ناخی نیزامدا باڵی "کۆمەڵەی روحانیە شۆڕشگێڕەکان" و گروپە نزیکەکان لەوەوە باوەڕیان بەم بۆچوونە هەیە. لەم بارەیەوە سازمانی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێران، باڵە سیاسیەکان دابەش دەکات بۆ "راستی کۆن"، "راستی مۆدێرن"، "چەپ" و "چەپی نوێ"[٣]. عەباس عەبدیش، کە یەکێکە لە ئەندامە سەرەکیەکانی دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی (سلام) باڵە سیاسیەکان بۆ "راستی کۆن"، "راستی مۆدێرن"، "راستی توندڕەو" و "چەپ" دابەش دەکات[٤]. عەلی رەزا عەلەوی تەبار سەرنووسەری هەفتەنامەی بەهمەن دەڵێت (لەناو فەرمانڕەوایی کۆماری ئیسلامی ئێراندا دەتوانین ئەو هێزانەی کە باوەڕیان بەم نیزامە هەیە بەپێی سێ پێوەر دابەش بکەین بۆ ئەم گروپە جیاوازانە:

---

[٣] دو هفتەنامە عصرما شمارەهای ٦ تا ١٣.

[٤] روزنامە سلام، ٧٤/٨/١٠ ص٨.

١-گروپی نوێخواز یان کۆنەپەرست.

٢-گروپی لایەنگرانی حکومەتی ئامر یان حکومەتی خەڵك.

٣-گروپی چەپ یان ڕاست. بەپێی ئەم سێ پێوەرە دەتوانین. لەناو نیزامی کۆماری ئیسلامیدا بەش و جۆری ڕەوتەکان لەیەك جیابکەینەوە"[٥] محەممەد جەواد مجتی کرمانی نووسەرو توێژەرەوەش باڵە سیاسیەکان دابەش دەکات بۆ دوو گروپ و دەڵێت (فیکری سیاسی- مەزهەبی ئێمە.. بەشێوەیەکی گشتی بۆ دوو بەشی سەرەکی کۆنەپەرستان و نوێخوازان دابەش دەکرێت کە هەریەکە لەم دوو گروپە بۆ توندڕەو و میانڕەو دابەش دەکرێت کە بە گشتی بەم شێوە ریزدەکەین.

١-کۆنەپەرستانی توندڕەو

٢-کۆنەپەرستانی میانڕەو.

٣-نوێخوازانی توندڕەو.

٤-نوێخوازانی میانڕەو"[٦]

هەروەها لە دەرەوەی وڵاتیش هەندێ لەو شارەزایانەی کە بە دوای گۆڕانکارییەکانی ئێراندا دەچن، باوەڕیان بەم دیدگایە هەیە.

(سەعید برزین) مامۆستای زانستە سیاسیەکانی زانکۆی ئەکستەدی بەریتانیا، لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران باڵە سیاسیەکان بۆ (لیبراڵ)، (حزبوڵڵا)، (میانڕەوی ڕاست)، (چەپ) و (ڕاست) دابەش دەکات[٧] بەڕای ئەو حاڵی حازر لەناو نیزامدا (٤) باڵ چالاکن کە بریتین لە باڵەکانی (ڕاست)، (ناوەند)، (چەپ)و (حزبوڵڵا)[٨].

(ژان پیرپرن)یش لە وتارێکدا لە ڕۆژنامەی لیبراسیونی چاپی پاریسدا لەناو نیزامی کۆماری ئیسلامیدا چوار باڵی سیاسی دەست نیشان کردووە کە ئەمانەن: "چەپی ئیسلامی"، "تەکنوکرات" "رسالەتیەکان" و "سەرو پارێزگاران"[٩].

---

[٥] روزنامه سلام، ٧٥/١٢/١٩ ص٩.

[٦] روزنامه اطلاعات ٧٦/٢/٢٠ ص٢.

[٧] ماهنامه ایران فردا، شماره ١٧، ص ٣٧ و ٣٨،

[٨] رادیو بی، بی، سی ٧٦/٢/٢٠ برنامه شاسگاهی.

[٩] روزنامه لیبراسیون ٧٤/٨/٦ (ایران اصلاحات را متوقف کرده است).

### ٢-١-باڵە سیاسیەکان لە کۆماری ئیسلامیدا:

هەتا پێش لەسەر کارلاچوونی (ئەبو حەسەنی بەنی سەدر) لەسەر کۆماریی ئێران لە (١٩٨١/٦/٢٢)دا، باڵە سیاسیەکانی لە نیزامی کۆماری ئیسلامیدا بۆ رەوتی (ئیسلامی) و (میللی) دابەش دەبوون. لە دوای لەسەرکارلاچوونی (بەنی سەدر) دوو باڵی تازە بەناوی (چەپ) و (راست) لەناو رەوتە ئیسلامیەکەدا فۆرمەڵە بوون و دەرکەوتن. لە سەرەتای ١٩٨٢دا ئەم باڵانە لەناو حکومەت و پاشان لەناو پەرلەمانیشدا تەنینەوە کە بە شێوەیەکی سەرەکی ناکۆکیان لەسەر مەسەلە ئابوورییەکان بوو. ناکۆکی لەسەر کۆنترۆڵی دەوڵەت بەسەر دابەشکردن و ئابووریدا، دەربڕین و شیکردنەوەی ماوەی (٤٤) ی دەستوور، شەرعی یان ناشەرعی بوونی کۆمەڵە هەرەوەزیەکان، سنووری چالاکی کەرتی تایبەتی، بەدەوڵەتی کردنی بازرگانی دەرەکی، شەرعی یان ناشەرعی بوونی یاسا خۆماڵی کردنی پیشەسازییەکان و.. ئەمانە لەو خاڵانە بوون کە مایەی ناکۆکی دوو باڵەکە بوون. کۆمەڵەی روحانیە شۆڕشگێڕەکان کە لە ساڵی ١٩٨٨دا لە سەرەتای هەڵبژاردنەکانی خولی سێیەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی (پەرلەمان)دا لە کۆمەڵەی روحانیەتی شۆڕشگێڕی تاران جیابۆوە. بوونی دوو باڵی بە رەسمی راگەیاند. قەیرانی ئابووری ساڵانی ١٩٨٧-١٩٨٨، کۆتایی جەنگ، پلانی ئاوەدان کردنەوەو بۆچوونی ئابووری نوێی وەکو تایبەتی کردن و قەرزکردن و پلانی مەسەلە تازەکانی فەرهەنگی و سیاسی شان بە شانی مەسەلە ئابوورییەکان، لەو فاکتەرانە بوون کە زەمینەیان بۆ فۆرمەڵەبوونی باڵە تازەکان لە کۆمەڵدا خۆشکرد. چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو قەیرانەدا کە لە کەمبوونەوەی نرخی نەوت و بڕی ناردنە دەرەوەی نەوتی ساڵانی (١٩٨٧-١٩٨٨)ەوە سەرچاوەی گرتبوو جیاوازی بیروبۆچوونەکانی ناو باڵی ناسراو بە چەپی هێنایە جۆش و خرۆش. ژمارەیەك لایەنگری زیادکردنی هەناردە نانەوتیەکان بوون و دەستەیەك دژی بوون. کۆمەڵێك باوەڕیان بە دابین کردنی متمانەی دەرەکی هەبوو بۆ سەرمایەگوزاری بەرهەم هێنان و بنچینەیی و کۆمەڵێك دژی ئەوە بوون. کۆمەڵێك باوەڕیان بەتایبەتی کردن هەبوو و هەندێك دژی بوون. سەرەڕای ئەمانەش چەند مەقولەیەکی وەکو ئازادی، هێرشی رۆشنبیری و چۆنیەتی رووبەڕووبوونەوەی،

چاپەمەنی و شێوەی مامەڵەکردن لەگەڵیدا (واتە لەگەڵ چاپەمەنیدا) بوون بە زەمینەی دیکە بۆ (سەرهەڵدانی) جیاوازی بیروبۆچوون و فۆرمەڵەبوونی باڵی نوێ. کۆی ئەم فاکتەرانە بوون بەهۆی فۆرمەڵەبوونی لایەنگرانی حزبوڵلا و کارگوزاران هەتا هەڵبژاردنی خولی چوارەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی. هەرچەندە حزبی کارگوزاران لەم ماوەیەدا بەو ناوەوە نەدەناسرا. لە ماوەی نێوان هەڵبژاردنی خولی چوارەم هەتا خولی پێنجەمی ئەنجومەنی شورا (پەرلەمان) هەڵوێستی باڵەکان روونتر و ناکۆکیەکانیان ئاشکراتر بوو. بەم شێوەیە بەر لە هەڵبژاردنی خولی پێنجەم (کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی) بە رەسمی دروست بوو. باڵی کارگوزارانیش کە بە رەسمی کاری نەدەکرد، بە رەسمی بوونی خۆی راگەیاند. هەتا ئەم قۆناغە هێشتا ئەگەری هاوکاری نێوان باڵی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تاران و کارگوزاران هەبوو، تەنانەت ناوی (١٠) کەس لە کاندیداکانی نوێنەرایەتی (پەرلەمان)ی کۆمەڵەی رۆحانیەتی شۆڕشگێڕی تاران لە لیستی باڵی کارگوزارانیشدا هەبوو. بەڵام رەخنەی توندی ئەم باڵە لە کارگوزاران، بە تەواوی ئەم باڵەی لە کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تاران جیاکردەوە بەشێوەیەك کە لە خولی حەوتەمی هەڵبژاردنی سەرکۆماردا پشتیوانیان لە کاندیدی رکابەری کۆمەڵەی رۆحانیەتی خەباتگێڕی تاران کرد. (لە دوایی‌دا بە شێوەیەکی سەربەخۆ باسی هەریەکە لەم باڵانە دەکەین).

## ٣-١- کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تاران و رێکخراوە هاوئاراستەکان:

کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تاران لە سەرەتای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی‌دا دروست بوو. بەڵام هەتا کاتێ کە (حزبی کۆماری ئیسلامی) کاری دەکرد، چالاکی سیاسی ئەم کۆمەڵە لەژێر چاودێری ئەو حزبەدا بوو.

لە هەڵبژاردنی خولی یەکەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی‌دا کە لە مانگی (٢) ١٩٨٠دا بەڕێوە چوو، کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ لە چوارچێوەی هاوپەیمانیەکدا بەسەرکردایەتی حزبی کۆماری ئیسلامی لە بەرامبەر هەموو گروپەکانی وەکو (سازمانی مجاهدینی خەڵقی ئێران)، (راپەڕینی ئازادی ئێران) و گروپەکانی چەپ بۆوە. لەدوای بەرکەناری (ئەبولحەسەنی بەنی سەدر) لە سەرکۆماریی لە

(١٩٨١/٦/٢٢) و بە تايبەتی لە ساڵی (١٩٨٢)ەوە گروپەكانی ناو نیزام دابەش بوون بۆ دوو دەستەی لایەنگری ئابووری دەوڵەتی و ئابووری بازاڕی ئازاد کە لە حزبی کۆماری ئیسلامیشدا ئەم دوو دەستەیی‌یە سەری هەڵدا. ئەم وەزعە تاڕادەیەك بوو بەهۆی لاوازی پێگەی سیاسی حزبی کۆماری ئیسلامی و بوو بە هۆی ئەوەی کە گروپی لایەنگری ئابووری بازاڕی ئازاد چالاکی سیاسی خۆیان لە چوارچێوەی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕدا رێك بخەن. بەتایبەتی لەدوای داخرانی حزبی کۆماری ئیسلامی، هەندێ لە سیاسەتمەدارانی حزب کە لایەنگری ئابووری بازاڕی ئازاد بوون، چالاکی سیاسی خۆیان لەو کۆمەڵەدا چڕ کردەوە. ئەم وەزعە بوو بەهۆی ئەوەی کە جیاوازی بیروبۆچوونی ئەو گروپە لە روحانیەکانی ناو کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ کە ئەم سیاسەتەیان قبوڵ نەبوو رەهەندێکی تازە پەیدا بکات، کە لە کۆتایی‌دا بوو بە هۆی جیابوونەوەیان لە کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ لە سەرەتایی بەهاری ١٩٨٨داو لە دوای ئەمەش کۆمەڵەی روحانیە خەباتگێڕەکان دروست بوو. هەروەها بەشێك لەو باڵەی کە لە هەڵبژاردنی خولی چوارەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی‌دا پشتیوانیان لە کاندیداکانی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ دەکرد، بۆ هەڵبژاردنی خولی پێنجەم چەند داخوازییەکیان خستەڕوو. ئەم گروپەی کە پاشان بە (کۆمەڵێ لە کارگوزارانی سازندەگی ئێران) ناسران، بە قسەی هاشمی رەفسنجانی سەرکۆماری ئەوکاتە لە رێگای ئەوەوە پێشنیازی ئەوەیان بۆ کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ کرد کە ناوی (٥) کەس لەوانەی پێشنیازیان کردبوو بۆ هەڵبژاردنی خولی پێنجەمی پەرلەمان، بخەنە ناو لیستی کاندیداکانی خۆیانەوە پاش چەند رۆژێ سەرکۆماری ئەوکاتە (رەفسنجانی) ئاگادار دەکرێتەوە کە دۆستان لە دەرەوەی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ واتە (رێکخراوە هاوئاراستەکان) دژی ئەوەن کە ناوی ئەو کەسانە بخرێتە لیستی کۆمەڵەی روحانیەتەوە؛ ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی کە ئەم گروپە لە هەڵبژاردنی خولی پێنجەمدا بە لیستێکی تایبەتی بەشداری بکات، هەرچەندە کە (١٠) کەس لە کاندیداکانیان لە لیستی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕیشدا هەبوون[١٠].

---

[١٠] هفتەنامە بهار شمارە ٢،٩/١٢/٧٤، ص٩

له لایەکی دیکەوە بەر لە هەڵبژاردنی خولی پێنجەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕدا دەربارەی پەیامەکەیان بوون و دەستێوەردانی غەیری روحانیەتەکان جیاوازی بیروڕا لەم کۆمەڵەیەدا سەری هەڵدا. ژمارەیەك لە ئەندامانی کۆمەڵە، خۆیان لەسەرو حزبەوە دەبینی و حەزیان بەدەستوەردانی ئەندامانی غەیری رۆحانی رێکخراوە هاو ئاراستەکان نەدەکرد لە کاروباری رێکخراوەیی و جێبەجێ کردنی خۆیاندا. بەڵام هەندێ لە ئەندامان پشتیوانیان لەوە دەکرد کە کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ بەرەو حزبایەتی بڕوات. رێکخراوە هاوئاراستەکان زیاتر پشتیوانیان لەم دەستەیە دەکردو بێگومان ئەم دەستەیەش حەزیان بەبوونی کاریگەرانەی ئەندامانی ئەو رێکخراوانە دەکرد لەناو رێکخستنەکانی کۆمەڵەدا بۆ ئەوەی باڵەکەی ئەوان لەناو کۆمەڵەکەدا بەهێز بکەن.

ئاستی ناکۆکیەکان تا ئەو رادەیە پەرەی سەند کە (محەممەد رەزا مەهدەوی کنی) سەرۆکی ئەوکاتەی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ کە لە لایەنگرانی بۆچوونی یەکەم بوو. دەستی لەکار کێشایەوە. سەرەتا هۆی دەست لەکارکێشانەوەکەی بە نەخۆشی لە قەڵەم درا کە سەرۆك بە درۆی خستەوەو لە ئەنجامدا (عەلی ئەکبەر ناتقی نوری) کە پێدەچوو لە پێشی پێشەوەی باڵی لایەنگری بە حزبی بوونی روحانیەتی خەباتگێڕەوە بێ[11] بەم شێوەیە هۆی دەست لەکارکێشانەوەی (مەهدەوی کنی) باس کرد (بەو پێیە کە کۆمەڵەی روحانیەت رێکخراوەیی‌یەو بەرەو حزبایەتی و بەڕێوەبردنی رێکخراوەیی دەچێت. ئاغای مەهدەوی کنی ئەم مەسەلەیەی قبوڵ نەدەکرد.. لە ماوەیەکی زۆر بەر لە ئێستاوە ئاغای کنی ئەوەی خستە روو کە وەکو سەرۆکی کۆمەڵەی روحانیەت ئاگای لە وردو درشتی مەسەلەکان بێت و کەمتر ئەرکەکانی بەکەسانی دی دەسپاردو سەبارەت بە مەسەلەکان ناسك بوو)[12]

کۆمەڵەی رۆحانیەتی خەباتگێڕی تاران بەر لە هەڵبژاردنی خولی پێنجەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی لەسەر ئاستی وڵات دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی

---

[11] بڕوانە لێدوانەکەی ناتقی نوری لە رۆژنامەی (رسالت ٧٥/٤/٩) کە تیایدا چالاکی رێکخراوەیی لە کۆمەڵدا دوپات کردەوە و گوتی (لە حاڵی حازردا زەمینەی گونجاو فەراهەم بوە بۆ ئەوەی رێکخراوە هاوئاراستەکان لەگەڵ کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تاران- یەك بەرە پێك بێنن".

[12] رۆژنامە اخبار، ١٣٧٤/٤/٢٩.

لیستی ئەو کاندیدایانەی کە لەلایەن کۆمەڵەوە پشتیوانیان لێ دەکرا کە هەنگاوێك بوو لە ڕێگەی بیروڕای بە حزبی بوونی ئەم کۆمەڵەیەدا[13].

لەکاتی دامەزراندنی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تاراندا کەسانی وەکو (مرتەزا متەهەری، سەید محەممەد حسێنی بەهەشتی، محەممەد جەواد باهونەر و مفتح) ئەندامی ئەنجومەنی مەرکەزی کۆمەڵە بوون. و لە حاڵی حازردا (محەممەد رەزا مەهدەوی کنی، ئەکبەر هاشمی رەفسنجانی، محەممەدی یەزدی، عەلی ئەکبەر ناتقی نوری، خەسرەو شاهی، غەییوری، محیدین ئەنواری، محەممەد عەلی موەحەدی کرمانی، محسن موجتەهید شبستری، محەممەد ئیمامی کاشانی، حەسەن روحانی، عەباس عەلی عەمید زەنجانی، هەزاوەیی هەمەدانی، رەزای تەقوا، عەبدولحسین مەعزی، عەبدوس و مەتلەبی ئەندامانی ئەنجومەنی مەرکەزی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تارانن.

## کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ

### گروپە وابەستەکانی

١-کۆمەڵەی هاوپەیمانی ئیسلامی کە عەسکەر ئەولادی و بادامچیان لە کەسە دیارەکانین.

٢-کۆمەڵەی ئەندازیارانی ئیسلامی کە مرتەزا نەبەوی، با هونەر و غەفوری فەرد لە کەسە دیارەکانین

٣-کۆمەڵەی زەینەب بە سەرکردایەتی مەریەمی بەهرۆزی.

٤-ئەنجومەنی پزیشکانی ئیسلامی.

٥-کۆمەڵەی کارگەرانی ئیسلامی.

٦-ئەنجومەنە ئیسلامیەکانی ئەسنافی بازاڕی تاران کە حاجی سەعیدی ئەمانی و عەسگەر ئەولادی لە کەسە دیارەکانین.

٧-کۆمەڵەی ئیسلامی زانکۆییەکان کە عەباسپور، جاسبی و هاشمی گوڵپایەگانی لە کەسە دیارەکانین.

---

[13] دو هفته نامه عصرما شماره ٥٠، ص٤.

٨-کۆمەڵەی خوێندکارانی ئیسلامی.

٩-کۆمەڵەی رۆشنبیرانی ئیسلامی.

١٠-کۆمەڵەی واعیزەکانی تاران.

١١-مەڵبەندی ئیسلامی خاوەن بڕوانامەکانی نیمچە کیشوەری هند.

لە نێوان رێکخراوەکانی دەوری کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێری تاراندا، (کۆمەڵەی هاوپەیمانی ئیسلامی) بەهێزترین و کۆنترین یانە کە لە خوارەوە چۆنیەتی دروست بوونی و ئەندامە دیارەکانی ئاماژەیان بۆ دەکرێ:

کۆمەڵەی هاوپەیمانی ئیسلامی لە ساڵی ١٩٨٣دا دامەزراو بەشی سەرەکی ئەم کۆمەڵەیە لە ئەهلی بازاڕی تاران پێك دێت. ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە لە ساڵانی بەر لە شۆڕشی ئیسلامیدا لە دژی رژێمی شا خەباتیان کردووە و چەند چالاکیەکیان لە دژی ئەنجام داوە لەوانەش تیرۆری حسین عەلی مەنسور سەرۆك وەزیری شا. ئەم گروپە لە دوای شۆڕشیش، رێکخراوەکەی خۆیان پاراستووەو هەوڵیان داوە پەرە بە نفوزو دەسەڵاتی خۆیان بدەن.

دوای هەڵبژاردنی خولی چوارەمی پەرلەمان، کۆمەڵەی هاوپەیمانی نفوزێکی زۆرتری بەدەست هێناو کەسانی تازەتریشی راکێشا. ناوە ئاشکراکانی کۆمەڵەی هاوپەیمان بریتی یە لە حەبیبوڵڵای عەسگەر ئەولادی سکرتێری گشتی کۆمەڵەو ئەسەدوڵڵای بادامچیان سکرتێری دەستەی جێبەجێکردنی کۆمەڵەیە. ناوی ئەندامانی دیکەی ئەم رێکخراوە بە شێوەیەکی رەسمی ئاشکرا نەکراوەو لەبەرئەوەی سەبارەت بە ئەندامێتی رەسمی ٣ کەس سەرەڕای پەیوەندی پتەوو بەردەوامیان لەگەڵ کۆمەڵەکەدا هەندێ دودڵی هەیە ئەستێرە لەسەر ناوەکانیان دانراوە: مەقسودی، سەعیدی محەممەدی، رەحمانی و ساڵحی لە دەستەی نوێژی هەینی تاران و قەدیری لە رێکخراوی زیندانەکاندا کاردەکەن. عەسگەر ئەولادی، نیری و رەفیق دروست لە کۆمیتەی فریاکەوتنی ئیمام خومەینی، زوارەیی لە شورای نگهبان و خامۆشی لە ژووری بازرگانی هەن. لە دادگا بادامچیان، شەفیق و

زوارەیی و لە رۆژنامەی (رسالت) مرتەزا نەبەوی، عەسگەر ئەولادی و محەممەد جەواد لاریجانی چالاکن.

لە وەزارەتی بازرگانی (کابینەی هاشمی رەفسنجانی): ئال ئیسحاق نقرەکار شیرازی* و لە وەزارەتی فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی (کابینەی هاشمی رەفسنجانی): میر سەلیم، عەبدوڵلاهیان، عەسگەر ئەولادی و بادامچیان هەبوون.

عەبدوڵلا جاسبیش سەرۆکی زانکۆی ئازادی ئیسلامییە[14]! باقی رێکخراوەکانی ئەم باڵە لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی دامەزراون.

رۆژنامەی (رسالت) ئەگەرچی بە رەسمی ئۆرگانی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ نییە، بەڵام وابەستەیە بەم باڵەوە. هەفتەنامەی "شما" ئۆرگانی کۆمەڵەی هاوپەیمانی ئیسلامی و بڵاوکراوەی (جام) ئۆرگانی کۆمەڵەی ئەندازیارانی ئیسلامی لە بڵاوکراوەکانی دیکەی وابەستەی ئەم باڵەن.

## ٤-١- ئەنجومەنی رۆحانیە خەباتگێڕەکان و گروپە نزیکەکانی:

"مجمع روحانیون مبارز و گروه های نزدیك به آن"

کۆمەڵەی روحانیە خەباتگێڕەکان لەسەرەتای بەهاری ١٩٨٨دا لە بەرایی خولی سێیەمی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی شورای ئیسلامیدا لە ئەنجامی لەت بوونی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تاراندا دروست بوو. ئەم کۆمەڵەیە لە نامەیەکدا بۆ ئیمام خومەینی رابەری شۆڕش لە مانگی (٤) ١٩٨٨ رەوتی جیابوونەوەکەی روون کردەوە. لەو نامەیەدا هاتووە (بەر لەهەر هەنگاوێك لەم بارەیەوە (واتە ئینشیقاق) هەوڵێکی زۆر لەلایەن برادەرانی ئێمەوە بە مەبەستی نزیك خستنەوەی بیروبۆچوونەکان لە چوارچێوەی پرانسیپ و پێوەرە پەسەندەکاندا درا لەگەڵ ئەو روحانیە بەرێزانەی کە ساڵەهایە چالاکی هاوبەشمان هەیە بەڵام بەداخەوە لەبەر پێداگرتنی ئەو بەرێزانە لەسەر کۆمەڵێ مەسەلە کە ئێمە بە پێچەوانەی بەرژەوەندی و پێوەرەکانمان دەزانین بە ئەنجام نەگەیشت. بۆیە وادیار بووکە کۆمەڵەکە لە

[14] نگاه کنید به: هفتەنامه بهار، شماره ۲، ۷۴/۱۲/۹ ص ۹-۱٤.

ڕێکخراوێکی تازەدا دەتوانێ باشترو زیاتر خزمەتگوزاری شۆڕشی ئیسلامی بێ"[15]

یەکێك لە ئەندامانی ئەنجومەنی مەرکەزی کۆمەڵەی ڕوحانیە خەباتگێڕەکان دەربارەی سەرەتای دروست بوونی ئەم کۆمەڵەیە دەڵێت: "سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەی ڕوحانیە خەباتگێڕەکان بۆ کۆتایی زستانی ١٩٨٨ دەگەڕێتەوە بەر لە پێکهێنانی خولی سێیەمی پەرلەمان و هەتا بەر لە هەڵبژاردنی خولی سێیەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی (پەرلەمان)، جیاوازی بیروبۆچون لەسەر ئاستە جیاوازەکانی کۆمەڵ و بەتایبەتی لەنێو ئەو ڕوحانیانەدا کە لە وڵاتدا چەند بەرپرسیاریەکیان لە ئەستۆدا بوو، بەتایبەتی دەربارەی پەرلەمانی ئایندە سەری هەڵدابوو، کە بە شێوەیەکی ئاسایی ئەم جیاوازی بیروبۆچوونانە لەنێو ئەندامانی کۆمەڵەی ڕوحانیەتی خەباتگێڕیشدا هەبوو لە چۆنیەتی ناساندنی کاندیداکان و ئەو مەرجانەی کە دەبوایە تیایاندا بوایە. هەندێ لە ئەندامە فیعلیەکانی کۆمەڵەی ڕوحانیە خەباتگێڕەکان کە لەو ڕۆژەدا ئەندامی کۆمەڵەی ڕوحانیەت بوون، سەبارەت بە ناساندنی چەند کەسێك ناڕازی بوون کە بەڕای ئەوان چەند کێشەیەك لە شێوەی بیرکردنەوەو ڕەفتارو پێشینەی سیاسیاندا هەبوو، لە لایەکی دیکەوە، ئەو نامیهرەبانیانەی کە بەرامبەر بە هەندێ لە کەسایەتیە شۆڕشگێڕو خاوەن پێشینەو دڵسۆزو کارامەکان دەکرا، ئەوانەیان نیگەران کردبوو. لەو ڕۆژانەدا ئەو باسە لەلایەن ئەم گروپەی ناو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵەی ڕوحانیەتەوە ڕەواجی هەبوو کە نابێ بە تەنها لەبەر خاتری پەیوەندی تایبەتی و سەلیقەی تاکە کەسەکان خەڵك دەست نیشان بکەین. دەبێ ئەو کەسانە بێنە مەیدانەوە بۆ شۆڕش و کۆمەڵ بە کەڵکن هەتا ئەگەر هەندێ سەلیقەیان لەگەڵ سەلیقەی ئێمەشدا نەگونجێ، و نابێ لە ڕادەی.. زیاتر بوار بەو کەسانە بدەین کە کارامەییان کەمترە یان ڕابردوو و پێشینەیەکی ڕۆشنبیان لە شۆڕشدا نی‌یە. ئەم کێشمەکێش و جیاوازی سەلیقەیە بوو بەهۆی ئەوەی کە بەرەبەرە شەفافیەتی زیاتر بەو جیاوازی بیرورایە ببەخشێ کە لە ناو کۆمەڵدا هەبوو، لە کۆتایی‌دا ئەندامانی فیعلی ئەنجومەنی مەرکەزی کۆمەڵەی ڕوحانیە خەباتگێڕەکان بڕیاریان دا کە ڕێکخراوێکی تازە دابمەزرێنن بەناوی (کۆمەڵەی ڕوحانیە شۆڕشگێڕەکان"ەوە. ئەم کۆمەڵەیە بەر لە جێبەجێکردنی بڕیارەکە، بە ئەرکی سەرشانی خۆیان زانی کە

---

[15] روزنامه سلام، ٧٥/٧/٢٩، مصاحبه با عبدالواحد موسوی لاری.

مەسەلەکە لەگەڵ ئیمام خومەینیدا (ر.خ) باس بکەن، چونکە رەنگ بوو ئەم رەفتارە بەمەعنای ئینشیقاق لەناو رێکخراوە روحانیەکاندا لێك بدرێتەوە. دوکەس لە ئەندامانی کۆمەڵە بە خزمەتی حەزرەتی ئیمام (ر. خ) گەیشتن. سەرەتا ئیمام بەدەمی ی رەزامەندی خۆی دەربڕی، لە هەمان کاتدا لەدوای گەیاندنی رەزامەندی حەزرەتی ئیمام (ر. خ) لەسەر دامەزراندنی کۆمەڵەکە. نامەیەك بە ئیمزای ئەنجومەنی مەرکەزی نێردرایە خزمەتی حەزرەتی ئیمام (ر.خ) و ئەویش بە شێوەی نووسراو رێکخراوە تازەکەی نەك تەنها بە مایەی جیاوازی نەزانی بەڵکو ئەم رێکخراوەی بەهۆی شەفاف تر بوونی بۆچوونەکان لێك دایەوەو وای بۆچوو کە هەموو ئەو بۆچوونانەی کە لەناو کۆمەڵدا هەن، دەبێ بەشێوەیەك زەمینەی سەرهەڵدان و دەرکەوتنیان هەبێ"[16] کۆمەڵەی روحانیە خەباتگێرەکان لە ساڵی ١٩٩١دا دوای هەڵبژاردنی خولی چوارەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی بۆ ماوەی (٥) ساڵ چالاکی خۆیان راگرت. یەکێك لە ئەندامانی ئەنجومەنی مەرکەزی دەربارەی هۆیەکانی ئەو هەنگاوە دەڵێت: "ئەو کەش و هەوایەی کە لە پێش و لە دوای هەڵبژاردنەکانی خولی چوارەمی پەرلەمان دروست کرابوو هەل و مەرجی تانە لێدانی زۆر خراپ، تۆمەت و مامەڵەی نامەبدەئی نائەخلاقی کە سەبارەت بە کۆمەڵەکەو کاندیداکانی هاتنە ئاراوە بەهۆی سەرەکی راگرتنی چالاکیەکانی کۆمەڵەی روحانیە خەباتگێرەکان بوو. رەنگە ئەو رۆژانە ئەو خڵتەیە لە مێشکدا بووبێ کە ئەو ململانێ و مامەڵانەی کە هەڵبەتە تاڕادەیەك مامەڵەی فکری بوون لە نێوان کۆمەڵەو هەندێ کەس و رەوت دا کە لە خولی چوارەمی پەرلەمان و هەتا لە خولی پێنجەمیشدا زۆرینە بوون و زۆرینەن. جۆرێکە لە کێشمەکێش (لەسەر) دەسەڵات. ئەو خەیاڵە لە ئارادابوو کە ئەندامانی کۆمەڵە بەنیازن کە لە پۆست و بەرپرسیارێتی یە سیاسیەکاندا وجودیان هەبێ و بمێننەوەو بنەمای راستەقینەی جیاوازیٚ بیروبۆچوونەکان دەسەڵاتخوازی ئەوانە. ئێمە لە هەمان کاتدا ئەو داوایەمان هەبوو کە دەربڕینی بیروبۆچوونەکانی کۆمەڵەو ئەو رەخنانەی کە ناوەناوە هەندێ لە ئەندامانی کۆمەڵە سەبارەت بە بەرنامە یان شێوەی رەفتاری هەندێ لە کارگوزارانی ئەم نیزامە هەیان لە دڵسۆزیانەوە بۆ دەوڵەت و کۆمەڵگای

---

[16] هەمان.

ئیسلامی سەرچاوە دەگرێ. بێدەنگی پێنج ساڵە جگە لە روون کردنەوەی هەڵوێستەکانی کۆمەڵە لەگەڵ رۆژگاردا بۆ کۆمەلانی خەڵك ئامانجێکی دیکەی نەبوو" یەکێکی دیکە لە ئەندامانی کۆمەڵەی روحانیە خەباتگێرەکان لەم بارەیەوە دەڵێت:

"لەدوای هەڵبژاردنی خولی چوارەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی و کەمێ بەرلەوەش ئەو کەش و هەوا سیاسیەی کە لە ململانێی هەڵبژاردنەوە دروست ببوو بە جۆرێکی لێهات کە درێژەدان بە چالاکی سیاسی خاوێنی کرد بە شتێکی مەحاڵ، هێرشی راگەیاندن بە جۆرێکی لێهات کە بەداخەوە لەجیاتی ئەوەی کە ململانێی سیاسی و هەڵبژاردنی روحانیەکان وەکو ئەرکێکی ئیسلامی -نیشتمانی بناسرێ، ئەم ململانێیانە وەکو هەوڵ بۆ بەدەست هێنانی دەسەلات بۆ بەرژەوەندی تاکەکەس و گروپ لە مێشکی کۆمەڵدا کاریگەری خراپی بەجێهێشت. مەسەلەیەکی دیکە کە بوو بەهۆی ئەوەی کۆمەڵەی روحانیەکان بێ دەنگ بێ، ئەوە بوو کە بەر لە هەڵبژاردن کەش و هەوایەك پێك هات کە دەسەلاتی نزیکەی (٨٠) کەس لە کەسانی دیاری ئەم باڵە کە کاندیدی نوێنەرایەتی خولی چوارەمی پەرلەمان بوون، رەت کرایەوە. باڵی رکابەر وا بانگەشەی دەکرد کە گوایە گرنگترین کۆسپی بەردەمی ریفۆرمەکان و بیناکردنەوەی ولات و فەراهەم کردنی خۆشگوزەرانی بۆ خەڵك، باڵی خەتی ئیمام (ر.خ)ە کە کۆمەڵەی روحانیە خەباتگێرەکان بە میحوەری ئەم باڵە دەناسرا. بە گشتی ئەو کەش و هەوا و هەل و مەرجە نالەبارەی کە پێش و دوای هەڵبژاردنی خولی چوارەمی پەرلەمان هاتبووە ئاراوە بوو بەهۆی ئەوەی کە کۆمەڵەی روحانیە خەباتگێرەکان، هەتا دروست بوونی هەل و مەرجی لەبار راگرتنی چالاکی سیاسی خۆی رابگەیەنێ"[١٧] کۆمەڵەی روحانیە خەباتگێرەکان لە مانگی (١٠) ١٩٩٥دا چەند مانگێ بەر لە دەست پێکردنی هەڵبژاردنی خولی پێنجەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی لەدوای نزیکەی (٥) ساڵ وەستان، چالاکی خۆی دەست پێکردەوە. یەکێك لە ئەندامانی ئەنجومەنی مەرکەزی کۆمەڵە لەم بارەیەوە دەڵێت:

"بە حسابکردن بۆ هەل و مەرجی خوڵقاو و ئاشکرابوونی ناڕاستی تۆمەتەکان و هێرشەکانی راگەیاندن و روون بوونەوەی ئەو راستیەی، کە هاتنە مەیدانی سیاسی

---

[١٧] روزنامه اطلاعات ٧٥/٧/٢٥.

کۆمەڵە دەسەڵاتخوازی نەبوو، بەڵکو تەنها جێبەجێکردنی ئەرکێکە لە بەرامبەر شۆڕشی ئیسلامی و ئامانجەکانی حەزرەتی ئیمامدا، کۆمەڵەی روحانیە خەباتگێڕەکان ئامادەبوونی سەرلەنوێی خۆی لە مەیدانی چالاکی سیاسیدا، بەیارمەتییەك بۆ چالاکی سیاسی کۆمەڵ دەزانێ".

ئەنجومەنی روحانیە خەباتگێڕەکان و ئەو گروپانەی کە لە رووی هەڵوێستەوە بۆچوونیان لەوانەوە نزیکە، لە خوارەوە نیشان دراوە.

## کۆمەڵەی روحانیە خەباتگێڕەکان

## گروپە نزیکەکانی

١-رێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێران، بەهزادی نەبەوی و محەممەدی سەلامەتی لە کەسایەتیە ناسراوەکانین.

٢-یەکێتی ئەنجومەنە ئیسلامیەکان خوێندکارانی سەرانسەری وڵات (مەکتەبی سەقامگیرکردنی یەکێتی)

٣-ئەنجومەنی ئیسلامی مامۆستایان.

٤-ئەنجومەنی ئیسلامی مامۆستایانیَ زانکۆکانی سەرانسەری وڵات.

٥-ئەنجومەنی ئیسلامی کۆمەڵەی پزیشکی ئێران.

٦-ئەنجومەنی ئیسلامی ئەندازیارانی ئێران.

مەهدی کەڕوبی سەرۆکی ئەنجومەنی کۆمەڵەی رۆحانیە خەباتگێڕەکانەو ئەندامانی ئەنجومەنی مەرکەزیان بریتین لە: محەممەد موسەوی خوئینی ها، ئەسەدوڵڵای بەیات، رەحیمیان، ئیمام جەمارانی، رەحمانی، عەلی ئەکبەر محتەشەمی، لەنێو گروپەکانی سەر بە کۆمەڵەی روحانیە خەباتگێڕەکاندا، رێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێران، باشترین و چالاکترین یانە کە لە خوارەوە چۆنیەتی دامەزراندنی ئەم رێکخراوە ئاماژەی بۆ دەکرێ.

رێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی لە (١٩٩١/١٠/٢) مۆڵەتی یاسایی چالاکی سیاسی لە سەرانسەری وڵاتدا وەرگرت. دامەزرێنەران و ئەندامانی دەستەی

مەرکەزی ئەم ڕێکخراوە بەزۆری کەسانێك بوون کە لە ساڵی ١٩٨٢ لەبەر جیاوازی بۆچوون و مامەڵەکانی وازیان لە ڕێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی هێنا.

ئەم کەسانە لەدوای وازهێنان لە ڕێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی لەبەرئەوەی باوەڕیان بە پێویستی بوونی ڕێکخراو هەبوو لە پێش خستنی ئامانجە فیکری و سیاسیەکاندا، بەشێوەیەکی هەمەلایەنە دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوەو تاوتوێ کردنی چالاکی نوێ و لەکۆتاییدا بەچەند گۆڕانکارییەك لە پەیڕەوو پرۆگرامو ناو و دەستەی دامەزرێنەردا، جارێکی تر دەستیان بەکار کردەوە، ڕێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی لە یەکگرتنی حەوت گروپی سیاسی پێك هات کە باوەڕیان بە ڕابەری ئیمام خومەینی هەبوو لە ساڵانی پێش سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامیشدا، باوەڕیان بە خەباتی چەکداری هەبوو لە دژی ڕژێمی شا. ئەم حەوت گروپە بریتی بوون لە: (امت واحده، توحیدی بدر، توحیدی صف، فلاح، فلق، منصورون، موحدین).

ئەم گروپانە لە دوای سەرکەوتنی شۆڕش بەپێی ڕینمایی ڕابەری شۆڕش و تەئکید کردنەوەکانی ئوستاد متەهری شەهید لەدوای چەند کۆبوونەوەیەکی جیاجیا، سەرئەنجام لەژێر ناوی ڕێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامیدا یەکیان گرت و لە ڕۆژی (١٩٧٩/٤/٦) دروست بوونی خۆیان ڕاگەیاند. دەتوانین ژیانی ئەم ڕێکخراوە بەسەر دوو قۆناغدا دابەش بکەین: لەساڵی ١٩٧٩ تا ١٩٨٢ و لە ١٩٨٢ تا ١٩٨٦. لە بەهاری ١٩٧٩ ڕێکخراوەکە داوای لە ئیمام خومەینی کرد بۆ ئەوەی لەلایەنی خۆیەوە نوێنەرێك یان وەکیلێك دیاری بکات بۆ چاودێری ڕێکخراوەکە لە بواری مەسەلەکانی باوەڕو ئایدیولوجی، فیقهی، حوکمە عەمەلیەکان و هەڵوێستە سیاسیەکاندا. ئیمامیش حیجەتول ئیسلام ڕاستی کاشانی دیاری کرد. بە سەرنجدان لەوەی کە یەکێ لە بەرنامە داڕێژەران و جێبەجێکەرانی سەرەکی ئابووری سەردەمی جەنگ لە ئەندامانی ڕێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی بوو، و هەروەها بە سەرنجدان لەوەی کە باڵی کۆنەپەرست و موحافیزەکار دژی کۆنترۆڵی ئابووری بوون ململانێو ناکۆکی لەناو ڕێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامیدا لەنێوان بەشێك لە دەستەی مەرکەزی و حیجەتول ئیسلام ڕاستی و لایەنگرانیدا پەرەی سەند، بەشێوەیەك کە لەناو ڕێکخراوەکەدا ٣ باڵی جیاواز دروست بوو.

١-باڵێك كه به تەواوی ملكەچی حیجەتول ئیسلام راستی بوون و باوەڕیان به پاشكۆیەتی تەواوی راست هەبوو ئەم گروپە مەیلی كۆنەپەرستانەو موحافیزكارانەی كۆمەڵایە تی - ئابووری‌یان هەبوو.

٢-باڵێك كه پەیڕەوی كردنی بیروبۆچوونە تایبەتیەكانی حیجەتول ئیسلام راستی‌یان بە ئەركی سەرشانی خۆیان نەدەزانی و تەنها بە كەناڵێكیان دەزانی بۆ گەیاندنی بیروبۆچوونەكانی ئیمام خومەینی بە رێكخراوەكەو نەك زیاتر. ئەم باڵە زیاتر پەیڕەوی‌یان لە بۆچوونی رادیكاڵانە دەكرد لە مەسەلە ئابوورییەكاندا.

٣-باڵی سێیەم لەو باوەڕەدا بوون كه مامەڵەی دو باڵەكەی دیكە، لە رادە بەدەر دوژمنانەیەو هیچ سەرچاوەیەكی بنەڕەتی بۆ تێگەیشتن و قبوڵ كردنی ناكۆكی سەلیقەكان و بەردەوام بوونی چالاكی لە ئارادا نی‌یە.

گفتوگۆكانی ناو رێكخراوەكە نەك تەنها نەبوونە هۆی چارەسەركردنی ناكۆكیەكان، بەڵكو ناكۆكیەكانی توندتر كرد. هەرسێ باڵەكە لەبەردەم ئایەتوڵڵا موسەوی ئەردەبیلی‌دا بیرو بۆچوونەكانی خۆیان باسكردو ئەویش گفتوگۆكانی‌بە ئیمام (ر. خ) گەیاند. لە (١٩٨٢/٤/١٤) حیجەتول ئیسلام راستی ئەنجومەنەكانی رێكخراوەكەی هەڵوەشاندەوەو لە (١٩٨٢/٤/٢٠) چەند شورایەكی كاتی بۆ بەڕێوەبردنی رێكخراوەكە دەستنیشان كرد. سەرئەنجام لەدوای گەیاندنی مەسەلەكان بە ئیمام (ر. خ) ئەویش فەرمووی: ئاغای راستی و ئەو كەسانەی كه دەتوانێ لەگەڵ ئەودا هاوبیر بن لە رێكخراوەكەدا بمێننەوە و هەركەسێ حەزناكات لەگەڵ راستی‌دا كاربكات دەتوانێ واز لە رێكخراوەكە بێنێ. لەم ماوەیەدا (مانگی (١٢) ١٩٨٢) ٣٧ كەس لە ئەندامانی رێكخراوەكە دەستیان لەكار كێشایەوە. لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٨٢-١٩٨٦دا چالاكی رێكخراوەكە بەتەواوی كپ بۆوە، تا ئاخری لە مانگی (١٠ی ١٩٨٦) حیجەتول ئیسلام راستی كاشانی لە نامەیەكدا بۆ ئیمام داوای رەزامەندی لەسەر دەست لەكاركێشانەوەی خۆی و هەڵوەشانەوەی رێكخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی كرد داواكەش لەلایەن (ئیمام)ەوە پەسەند كرا"[18] هەندێ لەو ئەندامانەی كه وازیان لە رێكخراوەكە هێنا بوو بەهۆی نزیكی فیكری و

[18] نگاه كنید به: هفته‌نامه بهمن، شماره ١٦/ ٧٥/٢/١ ص ٧-١٠.

پراكتیكی‌یانەوە لەگەڵ یەكتری و لەولایەنەوە كە باوەریان بەوە هەبوو كە بۆ پێشخستنی ئامانجی فیكری و سیاسی، دروست كردنی ریكخراو گرنگ و پێویستە. لەدوای دوركەوتنەوەیان لە ریكخراوەكە، پەیوەندییان لەگەڵ یەكتری‌دا هیشتبۆوەو لە دوای ئاڵ و گۆركردنی بیرورا لەگەڵ ئامادەكردنی پەیرەو و پرۆگرامی دیاری كراودا، داوای مۆلەتی كاركردنیان كرد لەژیر ناوی ریكخراوی مجاهیدینی شۆرشی ئیسلامی ئیراندا. وەزارەتی ناوخۆش لە (١٩٩١/١٠/٢) رەزامەندی خۆی لەسەر داواكەیان دەربری سەرۆكی ئەم ریكخراوە محەممەدی سەلامەتی‌یە)[١٩]. لە بواری چاپەمەنی‌دا رۆژنامەی (سلام)، دوو هەفتەنامەی (عصرما) ئۆرگانی ریكخراوی مجاهیدینی شۆرشی ئیسلامی ئیرانەو هەروەها هەفتەنامەی (مبین) لە چاپەمەنیەكانی سەر بە باڵی كۆمەڵەی روحانیە خەباتگیرەكان و گروپە نزیكەكانیتی.

### ٥-١- كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكانی شۆرشی ئیسلامی:
### "جمعیت دفاع از ارزشهای انقلاب اسلامی"

كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكانی شۆرشی ئیسلامی لە (١٩٩٥/٦/٥) بە رەسمی چالاكی سیاسی خۆی دەست پێكرد، بەڵام چەند مانگێ بەر لە هەڵبژاردنی خولی پینجەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی بوونی خۆی راگەیاند. یەكەم بەیاننامەی ئەم كۆمەڵەیە لە (١٩٩٦/٢/١٣) بە ئیمزای محەممەد محەممەدی نیك ناسراو بە (ری شهری) سەرۆكی كۆمەڵەو بەبێ ئاگاداری تەواوی ئەندامان بڵاوكرایەوە. ری شهری دەربارەی هۆیەكانی دامەزراندنی ئەم كۆمەڵەیە دەڵیت: "ئیمە بەر لە هەڵبژاردنی خولی پینجەمی پەرلەمان گەیشتینە ئەو ئەنجامەی كە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو بۆشاییە سیاسیەی كە لە كۆمەڵدا هەبوو دەبێ بەشیوەیەكی كاریگەر بچینە مەیدانەوە.. لەدوای هەڵبژاردنی خولی پینجەمی پەرلەمان، ئاماری هەڵبژاردنەكان، بەتەواوی بۆشایی وجودی یەك رەوتی سیاسی نیشان دا كە لەلایەن زۆربەی خەلكەوە پەسەند بێ و ئەم مەسەلەیەش لیكۆڵینەوەكانی كرد بە مەسەلەیەكی بێ چەندو چون. لەبەرئەوە لەدوای هەڵبژاردن گەیشتینە ئەو ئەنجامەی كە پێویستە ریكخراوەكەی ئیمە بەردەوام بێ"[٢٠]

---

[١٩] هفتەنامە بهمن، شمارە ١٧، ٧٥/٢/٨ ص٧.

[٢٠] روزنامە سلام، ٣٠، ٧٦/٢، ص٩.

سـەرۆکی ئـەم کۆمەڵەیـە ڕووبەڕووبوونـەوەی بـیری فەرامۆشـکردنی بـەها ئیسـلامیەکانیش بـە هۆیـەکی دیکـە دەزانێـت کـە لـە دامـەزراندنی ئـەم کۆمەڵەیـەدا کاریگـەر بووە. بە باوەڕی ئـەو کۆمەڵـەی بـەرگری لـە بـەهاکانی شۆڕشـی ئیسـلامی بەپێی بنـەمای یـەك فیکـرو بـۆ پڕکردنـەوەی بۆشـایی فـەرامۆش کردنـی هـەندێ لـە بەهاکان دامـەزرا[21]. ئـەو ڕەخنانـەی کـە ئـەم باڵـە سـەبارەت بـە وەزعـی کۆمەڵـە یـان باڵەکانی دیکە هەیەتی هۆیـەکانی دەسـت بـەکاربوونی کۆمەڵەکـە ئاشـکراتر دەکـات دەتوانین ئەم ڕەخنانە لەژێر ئەم ناونیشانانەی خوارەوەدا ڕیزبەندی بکەین:

## ١-جیاکردنەوەی دین لە سیاسەت.

ری شـهری دەڵێـت "یـەکێ لـە ڕەهـەندە ترسـناکەکانی هێرشـی فەرهـەنگی لـە بوارەکـانی فیکـری- زانکۆیـیدا، باسـکردنی مەسـەلەی جیاکردنـەوەی ئاینـە لـە سیاسەت و وەڵام نەدانەوەی حکومەتی دینیـیە کە بەداخەوە ئەمڕۆ ئەم پیلانە شوم و ناپیرۆزە لە مەڵبەندە زانستیەکانی ئێمەدا بەرەبەرە خۆی دەنوێنێ"[22]

## ٢-ڕەخنەگرتن لە هەردوو باڵەکە:

هەفتەنامـەی بڵاوکـراوەی "ارز شـها" ئۆرگـانی کۆمەڵـەی بـەرگری لـە بـەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی بە ڕەخنـەگرتن لـە هـەردوو باڵی کۆمەڵـەی ڕوحانیـەتی خـەباتگێڕو کۆمەڵەی ڕوحانیە خەباتگێڕەکان دەنووسێت: "مەبەستی (سیاسـەتی خودمیحـوەر)ی دووچاری خەوشـی خـۆ بـە ڕەها بینـی لـە ڕووبەڕووبوونـەوەی بیرکردنـەوەو ڕەفتـارێك لەگەڵ باڵ و ڕەوتـەکانی دیکـەدا کـە لـە قاڵبی قۆرخ خوازیدا دەردەکـەوێ.. سـیفەتی دیکەی ئەم مەبەستە دەسەڵاتخوازییەیە..

ئەم مەبەستە حاڵی حازر لە هەردوو بەرەی چەپ و ڕاستی کۆمەڵدا هەیە"[23]

---

[21] روزنامه اطلاعات، ٧٥/٧/١٧، ص٨.

[22] روزنامه اطلاعات، ٧٥/١٢/٢٣، ص٢.

[23] هفتەنامه ارزشها شماره ١، ص ١٨.

**٣-گەندەڵی، هەلپەرستی، سیاسەت بازی لەکۆمەڵدا و کەم بوونەوەی رادەی قبوڵ کردنی رەخنە.**

هەفتەنامەی (ارزشها) لە بەیاننامەی هۆیەکانی سەرهەڵدانی کۆمەڵەکەدا "سەبارەت بەوەی کە لە حاڵەتی حازردا وەکو فاکتەرو زەمینەی وەستان یان جیابوونەوەی سیاسی و دەست بەردار بوونی چالاکی رێکخراوی سیاسی بەپێی بنەماو ئامانجەکانی شۆڕش لەبەرچاو بوو" ئاماژە بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە دەکات:

ئەلف- بوونی رەفتاری سیاسەت بازی لە دارشتنی سیاسەتەکان و بەرنامەکاندا، بەتایبەتی لە مەیدانە چالاکەکانی سیاسەتی کۆمەڵدا وەکو زانکۆکان.

ب-کەم بوونەوەی قبوڵ کردنی رەخنە لە هەندێ بەشی نیزامدا.

ج-سیاسەت بازی و هەلپەرستی هەندێ لە باڵەکان و باندە سیاسیەکان.

د-دنیاپەرستی و بەرەبەرە ئالودەبوونی بەشێك لە سیاسەتمەدارە چالاکەکان بەکاروباری ئابووری‌یەوە"[٢٤].

هـ-پاوانخوازی لە دەسەڵات و ساماندا کە ترسناکترین ئافاتە کە هەڕەشە لە گەوهەری شۆڕش دەکات.

**٤- پراکتیکی ( عەمەلی ) - ( عمل گرایی ).**

"روح لَلای حسێنیان" جێگری سەرۆکی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان دەڵێت: "کۆمەڵەی بەرگری واتە ئەو کەسانەی کە ئەم کۆمەڵەیەیان دامەزراند، لە هەڵبژاردنی خولی پێنجەمی پەرلەماندا هەندێ دروشمیان لە کۆمەڵدا دەبینی کە هەست دەکرا ناوەرۆکی ئەو دروشمانە ئەوەیە کە چیتر سەردەمی شۆڕش تەواو بووەو رۆژانێکە کە بە پێچەوانەی ئامانج گەراییەوە پێویستمان بە شتی عەمەلی هەیە، ئاشکرایە کە ئەم دروشمانە بۆ ئێمە قسەو پەیامی هوشیار کەرەوە بوون. چونکە ئێمە شۆڕشی ئیسلامیمان بۆ هەمان ئامانج گەری کرد.. لەبەرئەوە ئێمە (کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی) بۆ بەرگری لەو ئامانج گەری‌یە چووینە مەیدانەوە"[٢٥] هەروەها بڵاوکراوەی (ارزشها) نووسیویەتی "لە روانگەی ئێمەوە مەسەلە

---

[٢٤] هەمان.

[٢٥] روزنامه اطلاعات، ٧٦/١/١٨ ص ١٢ اظهارات ری شهری.

فەرهەنگیـەکان گرنگـترین مـەیدانی مەسـەلەکانی نیزامـەو دەبـێ لـە پێشـەوەی ئەولەویەتەکانی نیزامەوە بێت"[26].

**٥-سیاسەتی ئابووری هەڵە:**

"روح ڵلای حسێنیان" وتی ( بەهۆی سیاسەتی ئابووری هەڵەوە چینێکی (نوێ) دروست بووە. ئێمە دەبێ بەشێوەیەك بەرنامەرێژی بکەین بۆ ئەوەی لەم حاڵەتی پاوانکارییە دەربازبین کە ئەمڕۆ لە ئابووری پیشەسازی و بازرگانی ئێمەدا لەسەر بنەمای پەیوەندی و نزیکی و نزیکی شەخسی راوەستاوە"[27].

هەروەها حسێنیان وتی: "یەکێك لە کێشە ئابوورییەکانی ئەمڕۆی ئێمە ئەوەیە کە بەرنامەکان خاوەنی زەمان بەندی تایبەتی نین"[28] لەم بارەیەوە لە بەیاننامەیەکی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامیدا هاتووە "سیاسەتە ناپایەدارەکان لە بەرنامەرێژی ئابووری ئێمەدا تەئکیدی بێ بیرکردنەوە لەسەر ئابووری ئازادو دانانی خۆش ژیان لەجیاتی دادپەروەری کۆمەڵایەتی، چەند جێگایەکی هەڵ خلیسکانن، کە پەرلەمانی پێنجەم دەبێ بەشێوەیەکی راستەقینە لێیان دورکەوێتەوە)[29]

ری شهری یش لە چاوپێکەوتنێکدا رەخنەی لە سیاسەتە ئابوورییەکانی دەوڵەت گرتووە، دەڵێت "بەداخەوە بەرنامە داڕێژەرانی وڵات هێشتا نەیان توانیووە ستراتیجێکی دیاری کراو بخەنە روو، ئێمە هێشتا لەبەرنامەیەکی جێگیرو دیارو ماوە درێژ بێبەشین لە بواری جێگیرکردن و چاکردنی ئابووریدا.. لە سپاردنی کۆمپانیاکانی دەوڵەتدا بەخەڵك، خەڵك بەگشتی بەشدار نەبوون و هەندێ لە کارخانە

---

[26] هفتەنامە ارزشها شمارە ٦، ١٥ /٧٥/١٠، ص ٤.

[27] روزنامە اطلاعات، ٧٥/١٠/١٦، ص ١٢.

[28] روزنامە اطلاعات ٧٥/١٠/١٦ ص ١٢.

[29] بیانیە شمارە ١ جمعیت دفاع از ارزشهای انقلاب اسلامی.

پر دەرامەتەکان بە پەیوەنداران یان کاربەدەستانی ئەوان سپێردراوە"[30] هەفتەنامەی "ارزشها" لەم بارەیەوە دەنووسێ: "رەوتی دادپەروەری کۆمەلایەتی لە نیزامی ئێمەدا.. گیرۆدەی ئافاتێکی ترسناك بووە. ئەم ئافاتە لە ژێر ناونیشانی دەرکەوتنی چینێکی نوێدا خۆی دەنوێنێ کە نەك تەنها بە سیفەتی دەسەلاتی ئابووری بەلکو بە سیفەتەکانی دەسەلاتی سیاسی و کۆمەلایەتیش قابیلی ناسینەوەیە. ئەم چینە تازەیە کۆمەلەیەکی ناهوموجینن بەلام هاوئاراستە و هاوچارەنووسن و لەو دەستەو رەوتانەن کە یان لە خێزانی شۆرش بوون و هەن یان ئەگەر لەو کۆمەلە نەبوون بەشێوەیەك لە شێوەکان بەوانەوە گرێدراون و ئەم پەیوەندیەش ئەو هەلەی بۆ رەخساندون کە هەل و مەرجێکی زۆر یارمەتیدەرتر بۆ بەهرەمەندی و دەولەمەندی بەدەست بێنن"[31] رێشەهری کەلەکەبوونی پارەی بەلاش لەدەستی توێژێکی تایبەتیدا بە یەکێك لە فاکتەرە کاریگەرەکانی گرانی و هەلئاوسان لە قەلەم دەدات و دەلێت: "ئەو کەسانەی کە لە بەرهەم هێنان و بیناکردنەوەی ولاتدا دووریکیان نییە بە واستەو دەلال بازی گرانی و هەلئاوسان زیاد دەکەن"[32] (روح للای حسینیان)یش دەلێ: "بەپێی ئەو ئامارانەی کە بانکەکان سەبارەت بە رادەی پاشەکەوتەکان دەیدەن، نزیکەی سێیەکی پاشەکەوتەکان هی ژمارەیەك خێزانەو لە راستیدا ئەمەش مەسەلەیەکی ترسناکە بۆ کۆماری ئیسلامی کە بەم شێوەیە لەدەستی کۆمەلی کەسی تایبەتیدا بخولێتەوە"[33].

٦-بەهەدەردان، بەرتیل خۆری و واستە لە حکومەتدا:

رێ شەهری بە دەربرینی نیگەرانی لە بەرتیل خۆری و واستە لە هەندێ لە دائیرەکاندا دەلێت: "بەرپرسە گرنگەکانی دائیرەکان لە بەشە جیاوازەکاندا دەبێ دوور لە دەستەگەری و لەنێوان خەلکانی چاك، دادپەروەر، شایستەو کارامەدا دەست نیشان بکرێن"[34].

---

[30] روزنامه کاروکارگر ٧٥/١١/٨، ص ٤.

[31] هفتەنامه ارزشها، شماره ٧٥/١١/٨ ص٤.

[32] روزنامه اطلاعات ٧٥/١٢/٤، ص٢.

[33] ماهنامه صبح شماره ٦٦، بهمن ٧٥، ص ١٧.

[34] رزنامه اطلاعات ٧٥/١٢/٨، ص٢.

هـــەروەها دەڵێـــت: "ســـیمینارگرتنی زیـــادو پرخـــەرجی، ســـەفەری دەرەوەی ناپێویســـت و خـــەرجی پێشـــوازی و روالـــەتکاری لـــە ئورگانـــە دەوڵەتیـــەکاندا لـــەو مەســـەلانەن کـــە کاریگـــەری خۆیـــان لەســـەر کـــاول کردنـــی بنـــەمای ئـــابووری ولات.. بەجێ دەهلێن"[35].

روح ئـلای حسـێنیان یـش لـەم بارەیـەوە دەڵێـت: "ئەوانـەی کـە کـار بەدەسـتی فرۆشـتنی پیشەسازییەکان و یان وردتر بە ئەهلی کردنـی ئابووری دەولـەتی بـوون، زۆربەی پیشەسازییەکانیان بە بنەماڵەو کەسانی نزیکی خۆیان سپارد"[36].

## ٧-مەحاڵی شۆرِش و مەترسی گەرِانەوەی وابەستەیی:

کۆمەڵـەی بـەرگری لـە بـەهاکانی شۆرِشـی ئیسـلامی لـە بەیاننامەیـەکدا دوپـاتی کـردەوە: "ورتـەورتی جیـایی ئـاین لـە سیاسـەت، لیـبرالیزم، بـەرەلایی فەرهـەنگی، خۆشگوزەرانی بە بەهای وابەسـتەیی ئابووری، سـازش و نەرم و نیانی لەگـەڵ دنیـا خۆران و مامەڵەکردن لەگەڵیاندا لەسەر حسابی چەوساوەکان بەتایبەتی لە مەسـەلەی فەلەستیندا و بەیـەك قسـە دورخسـتنەوەی بیری شۆرِشـگێرانەو ئەندێشـەی جۆشـدان لەژێر ناونیشانی هەڵخەڵەتێنەری هاوژیانی نێودەوڵـەتی یـان نـەرم و نیـانی مـەدەنی، شوێن کەوتنی چەند کەس و رەوتێکە کە بە شـوێن مـەحاڵی شـۆرِش و گەرِاندنەوەی وابەستەیی هەمەلایەنەی میللەتدا وێڵن"[37]

هـەروەها هەفتەنامـەی (ارزشـها) نووسـیوویەتی (ئـەوەی کـە شۆرِشـی ئیسـلامی لـە خەیاڵیدا بووە، بایەخ پێدانی بەها مەعنەویەکانە لە بواری رۆشـنبیری گشـتیدا، بـەلام بەداخەوە لە هەندێ قۆناغدا رژێم گیرۆدەی هەندێ سیاسەتی دیکە بووە کە پێویستی بە چاوپێداخشانەوەیە"[38]

روح ئـلای حسـێنیان لـەم بارەیـەوە دەڵێـت: "هـەندێ گـۆرِانکـاری فەرهـەنگی لـە شـۆرِشـەکەی ئێمـەدا رووی‌دا. هـەندێ لـە بنـەماکان گـۆرِانیـان بەسـەرداهات. واتـە ئـەو

---

[35] روزنامه اطلاعات ۷۵/۱۲/۱۵، ص۲.

[36] ماهنامه صبح، شماره ٦٦ بهمن ۷۵، ص ۱۷.

[37] بیانیه شماره ۱ جمعیت دفاع از ارزشهای انقلاب اسلامی.

[38] هفتەنامه ارزشها شماره ۸، ۷۵/۱۱/۱۵، ص ۵.

بنەمایانەی شتێکی ستراتیجی بوون بوون بە شتی دنیایی و رۆژانەو بەدوای ئەمەشدا کۆمەڵێ کێشەو مەسەلە سەریان هەڵدا، سەردەمانێك بنەما یان ئەسڵ ئەوە بوو کە هەرکەسێك بەشێوەیەکی کاریگەر کار بۆ شۆڕش بکات و لەخۆ بردوویی نیشان بدات، بەڵام لەپڕ بینیمان کە ئەم پێوەرە گۆڕا بەوەی کە هەرکەس بتوانێ فریای ژیانی مادی خۆی بکەوێ و کێشە مادییەکانی خۆی چارەسەر بکات.. کاتێ ناکۆکی سەری هەڵدا مزگەوت، بوو بە مەڵبەندو جێگای هاتوچۆی سیاسی و فەرهەنگی کۆمەڵایەتی ئێمە، بەڵام بینیمان کە لەم ماوەیەدا (کاتی سەرکۆماری رەفسنجانی) لەجیاتی بایەخدان بە مزگەوت و هاندانی ئەو رەوتە، جێگای دیکە دروست بوون کە بنەماو پێوەری دیکەی دەکرد بە ئەڵتەرناتیڤی ئەو رۆحە دینی و مەزهەبییەی لاوان. لە زانکۆکان ئەم گیانە بایەخی پێدراو جۆرێك لە سیاسەت هەڵاتن دروست بوو کە بوو بە هۆی کپ بوونەوەو پشت گوێ خستنێکی قوڵ لە زانکۆکاندا لە سەرنجدانی گشتی کۆمەڵدا بە جوانی هەست بەوە دەکرێ کە فەرهەنگی ئاینی تاڕادەیەك جێگای خۆی بۆ فەرهەنگێکی دنیاخوازانەو کاسبکارانە چۆڵ کردووە"[39].

## ٨-کارتێکردنی سیاسی:

هەفتەنامەی ارزشها نووسیوویەتی: "دڵەڕاوکێو کارتێکردنی سیاسی لە هەل و مەرجی ئێستای ئێمەدا، دەبێ وەکو هەڕەشەیەکی راستەقینە لە بواری دەسەڵات و ئەمنی قەومی‌دا حسابی بۆ بکرێت"[40]. ئەندامانی دامەزرێنەری کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی بریتین لە: محەممەد محەممەد ری شهری، سەید عەلی غیوری، سەید عەلی ئەکبەر ئەبو تورابی، محەممەدی عیراقی، عەلی رازینی، روح ئلای حسێنیان، محەممەد سادق عەرەب نیا، ئەحمەد پورنجاتی، محەممەد شەریعەتمەداری (شەریعەت) و عەباس سەلیمی. هەفتەنامەی ارزشها هەتا ژمارەی (٩٥) (١٩٩٨/١١/١٤) بۆچوونی "رەسمی و نارەسمی"[41] کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی دەخستە روو.

---

[39] ماهنامه صبح شماره ٦٦/ بهمن ٧٥ ص ١٨،١٧.

[40] هفتەنامه ارزشها شماره ١، مهر ٧٥، ص٢.

[41] همان ژماره ٩٥، ٧٧/٨/٢٥، ص ١،

بەڵام ئەم کۆمەڵەیە لە ١٣/١٠/١٩٩٨دا بە دەرکردنی بەیاننامەیەك بەشێوەیەکی کاتی ڕاگرتنی چالاکیەکانی خۆی ڕاگەیاند.

سەبارەت بە ڕاگرتنی چالاکی کۆمەڵە کە چەند فاکتەرێك شایانی سەرنجن.

**١-ناهۆمۆجینی لەنێوان بۆچوونی ئەندامانی شورای مەرکەزیدا.**

ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی بریتی بوون لە محەممەد محەممەدی ری شهری، سەید عەلی غیوری، سەید عەلی ئەکبەر ئەبو تورابی، عەلی رازینی، روح ڵلای حسێنیان، محەممەد سادق عەرەب نیا، ئەحمەد پورنەجاتی، محەممەد شەریعەتمەداری و عەباس سەلیمی نمین.

لەنێو ئەم کەسانەدا عەلی غەییوری ئەندامی ئەنجومەنی مەرکەزی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێری تارانەو عەلی ئەکبەر تورابی یش بۆچوونەکانی لەگەڵ کۆمەڵەی رۆحانیەت نزیك بوو.

لەنێو تەواوی ئەندامانی ئەنجومەنی مەرکەزیدا ئەحمەدی پورنجاتی یش خاوەنی چەند بۆچوونێك بوو کە پێدەچوو لەلایەن هەندێکی تر لە ئەندامانی ئەنجومەنی مەرکەزی ئەم گروپەوە قابیلی قبوڵ کردن نەبێ.

بۆ نموونە بەر لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی (خبرگان)ی رەهبەری لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ئاژانسی هەواڵی کۆماری ئیسلامیدا مەسەلەیەکی باس کرد کە لە روونکردنەوەیەکدا دەربارەی ئەو بابەتە گوتی (ئەوەی کەلە چاوپێکەوتنەکەمدا لەگەڵ ئاژانسی هەواڵ باسم کرد نابێت وەکو هەڵوێستی کۆمەڵە لێك بدرێتەوە"[٤٢]

ئەمەش لە کاتێکدا بوو کەپورنجاتی بەرپرسی مەکتەبی سیاسی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی بوو. روح ڵلای حسێنیان یش کە ئەندامێکی دیکەی ئەنجومەنی مەرکەزی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی بوو چەند هەڵوێستێکی هەبوو کەوا دیاربوو لەگەڵ بۆچوونی هەندێکی دیکە لە ئەندامانی ئەنجومەنی مەرکەزی ئەم گروپەدا جیاواز بوو.

---

[٤٢] هفتەنامە ارزشها، شمارە ٨٦/ ٢٣/٦/٧٧، ص١.

حسێنیان لە چاوپێکەوتنێکدا رەخنەی لە سیاسەتەکانی حکومەتی خاتەمی گرتو وتی: "سیاسەتی ئاسانکاری و لێبوردن لە وەزارەتی ئیرشاد تەنها بۆ نەیارانی رژێمە.. لە کاتێکدا ئاغای خاتەمی روحانیەکەو باوەری بە ئیسلام و شۆرش هەیەو هێشتا شانازی بەوەوە دەکات کە ئیمام (ر.خ) وەکو کوری خۆی بانگی کردووە: بەلام کەسانێك کە هەرگیز باوەریان بە ئیسلام و شۆرش نەبووە، چۆن لەژێر بالی خاتەمیدان؟.. سیاسەتی وەزارەتی ئیرشاد لەگەل هەموو ئەو درووشمانەی کە بۆ لایەنگری ئازادی چاپەمەنی دەگوترێنەوە بەشێوەیەك دارێژراوە کە هێزە هەلپەرست و کۆنەپەرستەکان دەسەلاتی تەواویان لە دەستدایە.. تەواوی بەرپرسانی وەزارەتی ئیرشاد بەرگریان لێ دەکەن"[43].

ئەم رەخنەگرتنانە لە سیاسەتی حکومەتەکەی خاتەمی لە کاتێکدایە کە لە دوا بەیاننامەی کۆمەلەدا سەبارەت بە راگرتنی کاتی چالاکیەکانی ئەم گروپە، هەلوێستێکی دیکە نیشان دراوە. لەم بەیاننامەیەدا بەهۆی (سوور بوون لەسەر فراوانکردنی هۆشیاری و داکۆکی لە حورمەتی ئازادی لە چوارچێوەی بنەما ئاینیەکاندا) سوپاسی حکومەتەکەی خاتەمی و خودی خاتەمی کراوە.

دووبەرەکی لە هەلوێستەکانی ئەنجومەنی مەرکەزی کۆمەلەی بەرگری لە بەهاکاندا بەشێوەیەك بووە کە بەپێی هەفتەنامەی ارزشها هەتا هەندێ لە ئەندامانی ئەنجومەنی کۆمەلەی بەرگری لەکاتی هەلبژاردنەکانی سەرکۆماردا لە جیاتی ریشەهری دەنگیان بۆ کاندیدەکانی دیکە داوە[44] پێدەچێت ئەم بۆچوونە جیاوازانە لەنێو ئەندامانی ئەنجومەنی مەرکەزی بەرگری لە بەهاکانی شۆرشی ئیسلامیدا یەکێك بێ لە هۆ سەرەکیەکانی راگرتنی کاتی چالاکیەکانی ئەم گروپە.

**٢-سەرنەکەوتن لە مەیدانی چالاکی سیاسیدا:**

ئامانجی چالاکی سیاسی ئەم کۆمەلەیەش بەشێوەیەکی حزبی دەسەلات گرتنە دەستە. لەکاتی هەلبژاردنەکانی خولی پێنجەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامیدا، کۆمەلەی بەرگری لە بەهاکان بەشێوەیەکی رەسمی دروست نەبوبوو، بەلام کاندیدە

---

[43] همان ص ٨، ٩.

[44] نگاه کنید به ارزشها شماره ٨٦، ٧٧/٧/١١. ص١٥ پیام ارای ری شهری چیست؟

دەست نیشان کراوەکان لەلایەن گروپە جیاوازەکانەوە بوو. بەدەربڕینێکی دیکە کاندیدی تایبەتی ئەم گروپە نەچووە پەرلەمانی پێنجەمەوە لە هەڵبژاردنەکانی سەرکۆماریشدا محەممەدی ری شهری سەرۆکی ئەم گروپە لە چوار کاندیدەکەی هەڵبژاردن بوو. هەڵنەبژاردنی ری شهری بە سەرکۆمار شکستی خۆی نەبوو. چونکە هیچ کەسێ هەتا خودی ری شهریش چاوەڕوانی سەرکەوتنی نەدەکرد. بەشێوەیەك کە هەفتەنامەی ارزشها نووسی: "لەکاتی هەڵبژاردنەکانی سەرکۆماردا دەرکەوت ری شهری ماوەیەکی زۆر بەرلەوە دەوری رکابەری لێ سەندرابۆوە"[٤٥]

بەڵام ئەوەی کە ری شهری لەناو چوار کاندیدەکەدا لە پلەی چوارەمدا خۆی بینیەوە، بەلای خۆی و بەلای گروپەکەشەوە شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو و بەجۆرێك لە شکست لێك درایەوە. لە دوای ئەوە کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی بەشێوەیەکی راستەقینە بۆچوونە ناو مەرکەزەکانی دەسەڵاتەوە هەنگاوی هەڵنەگرت. لە هەڵبژاردنی نێوان خولەکانی ئەنجومەنی شورای ئیسلامیدا لە تاران و چەند شارێکی دیکەدا لیستی کاندیداکانی خۆی راگەیاند کە بە پێی بەیاننامەی ئەم گروپە بە (سەربەخۆ لە وابەستەیی گروپی و ئارەزووی باڵەکەیان) رێکخرابوو[٤٦].

لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی (خبرگان)یشدا کۆمەڵەی بەرگریلە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی خۆی لە خستنەڕووی لیستی سەربەخۆ دزیەوە. ئەم گروپە هۆی هەنگاوەکەی خۆی ئاشکرا نەکردو تەنها بەو هۆیەی کە (ئێمە هەستمان بە پێویستی خستنەڕووی لیستی سەربە خۆ نەکرد)[٤٧] لە کورتی بڕیەوە. کارانەبوونی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان لە مەیدانی هەڵبژاردندا باسی لە بوونی جیاوازی بیروڕا لەنێو ئەندامە سەرەکیەکانی ئەم گروپەو بێتوانایی گروپەکەی لە راکێشانی کەسانی دیار دەکرد.

---

[٤٥] همان.

[٤٦] ارزشها، شماره ٨، ٧٥/١١/١٥، ص٢.

[٤٧] همان، شماره ٩١، ٧٧/٧/٢٧، اظهارات محمدی ری شهری دبیر کل جمعیت دفاع از ارزشها.

وا دیاره یەکێ لە هۆیەکانی سەرنەکەوتنی ئەم کۆمەڵەیە، رابردووی چالاکی جێبەجێکردنی زۆربەی ئەندامە سەرەکیەکانی ئەم گروپە بوویێ. ئەم رابردووە تارادەیەك کاری لە پێشوازی نەکردنی خەڵك لەم گروپە کرد.

۳-روون نەبوونی هەڵوێستەکانی:

کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی لە ماوەی زیاتر لە دوو ساڵ چالاکی رەسمیدا لە جیاتی ئەوەی کە دەست بکات بە خستنەڕووی بەرنامەو شێوازی کارکردن بۆ بوارە جیاوازەکانی سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی، بەشێوەی کاردانەوە لە بەرامبەر گۆڕانکارییەکاندا هەڵوێستی وەردەگرت. بە دەربڕینێکی دیکە کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان رەخنەی لە تەواوی باڵەکان دەگرت بەڵام بەشێوەیەکی ئاشکرا بەرنامەکانی خۆی رانەگەیاند تەنها بە وتنەوەی کۆمەڵێ شتی گشتی باسی دەکرد. ئەم وەزعە لە دوابەیاننامەی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانیشدا بەدی دەکرێ.

"کۆمەڵەی بەرگری هەمیشە سوور بووە لەسەر ئەوەی کە هەر جۆرە داخوازییەکی چاوپێداخشانەوە بە بنەماو ئامانجەکانی شۆڕشدا یان مامەڵەی بریندارکەر لەگەڵ دەسکەوتە پڕ بەهاکانی ساڵانی سەرەتای سەرکەوتنی شۆڕش و سەقامگیربوونی نیزام و هەروەها ساڵانی پڕ شانازی بەرگری پیرۆزو هەر جۆرە هەوڵێکی ناڕاستگۆیانەیان بێئاگایانە بۆ گەڕانەوە بۆ سوننەت و رێبازە بێزراوەکانی سەردەمی زۆرداری یان فەرهەنگی ئالوودەی بێگانە، نا جوامێری و حورمەت شکێنییە لەبەرامبەر قوربانیدان و لەخۆبوردنی پێشڕەوانی شۆڕش و جەفایەتییەکی ئاشکرایە بۆ خوێنی پاکژی دڵسۆزانی ئەم وڵاتە و بەجۆرێك لە پەیمان شکێنی نەتەوەیی لە قەڵەم دەدرێ.

کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی لە ناخەوە باوەڕی بەوە هەیە کە ئەندێشەی شۆڕشی ئیسلامی بە پشت بەستن بە گەوهەرەکەی هێشتا بنەمای ئیسلامی خاوێن و پشتیوانی گەشەو خەملینی هەوڵدانە بۆ ناسینی زەمانە، هیچ رەگ و ریشەیەکی لەگەڵ کورت بینی دۆگمایانەو نەریتی دروست کراوی فیکری یان بیرو باوەڕ نییە. هەروەها داوای یارمەتی زەبونانە و رۆشنبیری رواڵەتکاری لە قوتابخانەی بێگانە ناکات و سنوور شکێنی نیمچە فەیلەسوفانەی نییە"[٤٨].

---

[٤٨] هفتەنامە ارزشها شمارە ۹۵، ۷۷/۸/۲۵، ص۳.

ڕەنگە بەشێوەیەکی گشتی قسەکردنی کۆمەڵە یەکێك بووبێ لە هۆ سەرەکیەکانی سەرنەکەوتنی ئەم گروپە لە ڕاکێشانی خەڵکی دیار لە سەرانسەری ئێراندا، بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵەی ڕوحانیەتی خەباتگێڕو ڕێکخراوە هاوئاراستەکان لە چالاکیەکانی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی ناڕازی بوون و ڕەخنەیان لە هەندێ لە هەڵوێستەکان دەگرت. بەڕای ئەم باڵە کۆمەڵەی بەرگری لەکاتی هەڵبژاردنەکانی خولی حەوتەمی سەرکۆماردا ئەو گروپەی بەلای خۆیدا ڕاکێشا کە پشتیوانیان لە کاندیداکەیان (واتە ناتقی نوری) دەکرد.

بە دەربڕینێکی دیکە ئەم باڵە باوەڕیان وابوو کە چالاکیەکانی کۆمەڵەی بەرگری هەمیشە بە قازانجی باڵی نەیار (کۆمەڵەی ڕوحانیە خەباتگێڕەکان و گروپە نزیکەکانی) تەواو دەبێ. هەڵبەتە ئەو خاڵە مایەی سەرنجە کە کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی لە بەیاننامەکەی خۆیدا "بێ توانایی و کەم دەرامەتی، مەسئولیەتی جۆراوجۆری کاربەدەستانی سەرەکی کۆمەڵەو بەتایبەتی ئەندامانی ئەنجومەنی مەرکەزی و کۆمەڵێ هۆی دیکە کە خۆی لە باسکردنیان دزیوەتەوە، ئەمانەی بە فاکتەرەکانی ڕاگرتنی کاتی چالاکیەکانی کۆمەڵە ناوبردووە.

### ٦-١- پەیامی خوێندکار ( پیام دانشجو )

"یەکێتی ئەنجومەنە ئیسلامیە خوێندکارییەکان و خوێندکارانی زانکۆکان و مەڵبەندەکانی خوێندنی باڵا" لە ساڵی ١٩٨٣دا لە ژێر ناوی (ئەنجومەنی ئیسلامی خوێندکاران و دەرچوانی زانکۆکان و مەڵبەندەکانی خوێندنی باڵا)دا بوونی خۆی ڕاگەیاند. ئەم ڕێکخراوە بە تێپەڕبوونی کات چالاکیەکانی خۆی فراوانتر کرد. لە هەندێ لە زانکۆکاندا وەکو زانکۆی زانست و پیشەسازی ئێران، خواجە نەسیر توسی (عمران)، شەهید بەهەشتی (ئابووری) و هەندێ کۆلیجەکانی پەرستاری (تمریض)، ئەنجومەنە ئیسلامیەکانی خوێندکاران ئەندامی هەمان ڕێکخراو بوون. لە ساڵی ١٩٨٥دا یەکەم کۆمەڵەی سەرانسەری ئەم ڕێکخراوانە، لە زانکۆی زانست و پیشەسازی ئێران لەژێر ناونیشانی (پەیامی ئەنجومەنە ئیسلامیە خوێندکاریەکان)دا سمینارێکی گرت و بەم شێوەیە چالاکیەکانی خۆی فراوان کرد. هەروەها لە ساڵانی

١٩٨٣ و ١٩٨٧دا لـه هـەڵبژاردنی نێـوان خـولی ئەنجومـەنی شـورای ئیسـلامی و سەرکۆمارییدا بە خستنە رووی لیستی سەربەخۆ، هەڵوێستە سیاسییەکانی خۆی روون کـردەوە. و لـە سـاڵی ١٩٨٧دا لەگـەڵ فەراهـەم کردنـی گروپـە فەرهـەنگی- سیاسییەکاندا چەند بەشێکی دیکەی لە هەڵوێستەکانی خۆی بەیان کردووەو ئەندام وەرگرتنـی خـۆی فـراوان کـرد. ئـەم یەکێتییـە لـە سـاڵی ١٩٨٨ یەکـەم ژمـارەی بڵاوکراوەی خۆی بەناونیشانی (فصل نامەء پیام دانشجوی بسیجی) بڵاوکردەوە. لە هەمان ساڵدا رێکخراوەکانی ئەنجومەنە ئیسلامیە خوێندکارییـەکان بـە ناونیشـانی رێکخـراوە خوێندکارییـەکانی ئـەندامی ئـەم یەکێتییـە لـە سەرانسـەری وڵاتدا راگەیەنران"[٤٩]

ئەگـەرچی ناونیشـانی "یـەکێتی ئەنجومەنـە ئیسـلامیە خوێندکاریـەکان و خوێندکارانی زانکۆکان و مەڵبەندەکانی خوێندنی باڵا" ئەوە بە خەیاڵدا دێنێ کە ئەم رێکخراوە، رێکخراوێکی خوێندکارییە؛ بەڵام لە پەیڕەوی ناوخۆی یەکێتییەکـەدا، پێش بینی چالاکی سیاسی تـەواوی توێژەکـانی کۆمـەڵ لە چوارچێوەی ئەنجومەندا کراوە. لـە پـەیڕەوی نـاوخۆی یەکێتییەکـەدا هـاتووە". (شـەش ریزەکـەی ئـەندامی یـەکێتی بریتـین لـە: خوێندکـاران، مامۆسـتایان، رۆشـنبیران، خوێندکـارانی زانکـۆ، کرێکاران و کارمەندان"[٥٠]

"ئەنجومەنی ئیسـلامی.. دەشـێ لـە هـەر شـەش ریزەکـەدا بـەدی بێـت و بـەناوی ئەندامانی هەریەکە لەو ریزانـەوە چالاکی بکـات"[٥١] هـەروەها دەربـارەی ئەرکـەکانی یەکـەی سیاسـی ئەنجومەنەکە لـە پـەیڕەوی نـاوخۆدا هـاتووە: "خسـتنەڕووی چـەند بەرنامەیەك بە مەبەستی بەهێزکردنی تێڕوانینی سیاسـی ئـەندامان و باقی توێژەکان بەشێوەیەکی گشتی لە رێگەی پێکهێنانی کۆبوونەوەی شیکردنەوەی سیاسی، وتـارو کۆبوونەوەی پرسیارو وەڵامەوە"[٥٢] ئەم رێکخراوانە بەپێی یاسای حزبەکان دوسێی چالاکیان لـە وەزارەتـی نـاوخۆ وەرگرتـووەو لـە تـاران بارەگایـەکی مەرکـەزی و لەچەند

---

[٤٩] نوشته اختصاص حشمت الله طبرزدی دبیر کل اتحادیه برای پژوهش.

[٥٠] ماده ١١ اساسنامە.

[٥١] ماده ١٢ اساسنامە.

[٥٢] ماده ٥٠، بند الف.

پارێزگایەکی دیکە مەکتەبی هەیە، هەروەها ئەنجومەنە ئیسلامیە خوێندکارییەکانِ لە زانکۆکانی سەرانسەری وڵاتدا ئەندامە[٥٣]. یەکێك لە ئەندامانی ئەنجومەنی مەرکەزی یەکێتی‌یەکە، سەبارەت بە زەمینەی دروست بوونی ئەم ڕێکخراوە دەڵێت: "حشمەتوڵڵا تەبەرزدی سەرۆکی یەکێتی‌یەکە، بەهاودەنگی لەگەڵ هاوڕێکانی خۆیدا لە ڕێگەی مەڵبەندێکەوە بەناوی مەڵبەندی فەرهەنگی (٧٢) شەهیدەکەوە چالاکی سیاسی و ڕێکخراوەیی خۆیان دەست پێکرد.

پاشان مەڵبەندی (٧٢) شەهیدەکە لەژێر ناوی ئەنجومەنە ئیسلامیە خوێندکاریەکان و دەرچوانی زانکۆدا درێژەی بە چالاکیەکانی خۆی دا. لە رووی سیاسیەوە ئەم ئەنجومەنە، گروپێك بوو لە بەرامبەر مەکتەبی سەقامگیرکردنی یەکێتی‌و مەیلی بەلای باڵی راستدا هەبوو. ئەم ئەنجومەنە وەکو نموونەی ڕێکخراوەیی دکتور بەهەشتی و وەکو نموونەی فیکریش ئایەتوڵڵا مطهری قبوڵ بوو. ئەم یەکێتی‌یە لەکاتی سەرکۆماری ئایەتوڵڵا خامنەئی‌دا پەیوەندی فیکری لەگەڵدا هەبوو هەروەها هەمان پەیوەندی لەگەڵ هاشمی رەفسنجانی هەبوو لە کاتێکدا سەرۆکی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی بوو.

یەکێتی‌یە کە لە ساڵی ١٩٨٧دا لەبەر جیاوازی بیروڕای لەگەڵ ئەو کەسانە کە بەلای باڵی راستی کۆن و کۆمەڵەی هاوپەیمانی ئیسلامیدا دایان دەشکان کارەکانی ڕاگرت. بەڵام لە کۆڕو کۆبوونەوەو بۆنە ئایینیەکاندا بۆ قسەکردن و گوتاردان بانگ هێشتی عەلی ئەکبەر ناتقی نوری، حەبیوڵلای عسگر ئەولادی، محەممەدی رەزای باهونەرو ئەندامانی شورای نیگهبانی وەکو خزعەلی، محەممەدی گەیلانی و ... دەکرد. واتە جۆرێك لە ئارەزووی فیکری لەلا هەبوو"[٥٤].

بڵاوکراوەی (پیام دانشجو)، ئۆرگانی یەکێتی، چەندین جار ڕاگیراوە کە بوو بەهۆی ناوبانگ دەرکردنی لەناو کۆمەڵداو بوو بەهۆی ئەوەش کە ئەم گروپە لەناو

---

[٥٣] نشریه داخلی انجمن های اسلامی دانشجوی دانشگاهها، تهران، شماره ٦، ٧٦/٥/٧.

[٥٤] گفتوگۆی نگارنده بایکی از اعضای مستعفی شورای مرکزی اتحادیه کە خواست نامش منتشر نشود ٧٧/٦/٩.

تەواوی توێژەکانی کۆمەڵیشدا لایەنگر پەیدا بکات. (پیام دانشجو) لە خولی پێش راگرتنیدا لە هەمان کاتدا کە دژی بەرنامەکانی دەوڵەت بوو، زیاتر لە هەر بابەتی رەخنەی لە کردەوەی بەڕێوەبەری شارەوانی تاران دەگرت و دژی گرووپی کارگوزاران دەدوا "پێدەچێت رۆژانی داخستنی "پیام دانشجو" ئەو بوارەی بۆ ئەم گرووپە هێنابێتە پێشەوە بۆ ئەوەی بە هەڵوێستەکانی خۆیدا بچێتەوە. حیشمەتوڵڵای تەبەرزدی، محەممەد مەسعود سلامەتی، سەید جوادی ئیمامی و عەلی سەرفراز لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەرو دەستەی ئەمینداری یەکێتی بوون و دەستەی ئەمینداریی ئێستاش بریتین لە حیشمەتوڵڵای تەبەرزدی، محەممەد مەسعود سەلامەتی، جوادی ئیمامی، پرویز سفری و محەممەد میر ابراهیمی. کە لەنێو ئەمانەدا حیشمەتوڵڵای تەبەرزدی سەرۆکی یەکێتییەکەیە.

## ٧-١-لایەنگرانی حزبوڵڵا (انصار حزب الله)

دەبێ لە مانگەکانی سەرەتای شۆڕشدا بۆ رەگ و ریشەی مێژوویی ئەم رەوتە بگەڕێین. کە لایەنگرانی ئەم حزبە لە قاڵبی (تیپەکانی حزبوڵڵا) رووبەڕووی لایەنگرانی سازمانی مجاهیدینی خەلقی ئێران، لایەنگرانی بەنی سەدرو پاشان (بەدحیجاب)ەکان دەبوونەوە. ئەم رەوتە فکرییە تا کۆتایی جەنگی عێراق لە دژی ئێران هەویەی سەربەخۆی سیاسی نەبوو. گەڕانەوەی لاوان لە بەرەکانی جەنگ، ئەو ناکۆکیەی کە ئەوان سەبارەت بەوەی لە خەیاڵیاندا بوو، لەگەڵ ئەوەدا کە لەناوی شارەکاندا بەدیان کرد لە دروست بوونی ئەم باڵەدا دەورێکی گرنگی بینی. ئەم باڵە لەو دەستە جیاوازانە پێك هاتووە، کە جەنگاوەرانی بەرەکان لە دوای گەڕانەوە بۆ شارەکان دروستیان کرد. بەربەرەکانی گەندەڵی کۆمەڵایەتی، دزی، بەرتیل، هێرشی فەرهەنگی و سەرمایەداری لە دروشمە سەرەکیەکانی ئەم باڵەیە. لە پێناوی بەدیهێنانی ئامانجەکانی خۆیدا گرووپی سنووردار بەڵام گونجاو ئامادە دەکات. مانگ نامەی (یالثارات الحسین) ئۆرگانی پشتیوانانی حزبوڵڵایە. دوو هەفتەنامەی (شلمچە)ش سەر بەم باڵەن. مانگ نامەی (صبح) و رۆژنامەی (کیهان)یش لە فیکرەکانی ئەم باڵەوە نزیکن.

(مەسعودی دەنمکی) بەڕێوەبەری هەفتەنامەی (شلمچە) لە بواری دروست بوونی پشتیوانانی حزبوڵڵادا دەڵێت: "بەر لە ساڵی ١٩٨٩ بەکردەوە شتێك بەناوی

پشتیوانانی حزبوڵلاوە وجودی نەبوو ناوێك بەناونیشانەوە نەبوو. ئەوکاتە ئەمانە بەناوی حزبوڵلای تارانەوە کاریان دەکرد کە تا ساڵی ١٩٩٣ ئەو وەزعە بەردەوام بوو.. ناوی پشتیوانانی حزبوڵلا لە دوای ساڵی ١٩٩٣ بەدواوە زیاتر کەوتە سەرزار.. (ئەوانە) تەنها لەسەر مەسەلەی بەهاو دژی بەها نارەحەتی خۆیان نیشان دەدا، زیاتر لە بواری دژی گەندەڵی کۆمەڵایەتی و نەفیکراوەکاندا لەکۆمەڵدا چالاکیان دەنواند"[٥٥].

## ٨-١-کارگوزارانی بیناکردنی ئێران: (کارگزاران سازندگی ایران)"

ئەگەرچی ئەم حزبە بەناوی کۆمەڵێ لە کارگوزارانی بیناکردنی ئێرانەوە لە ساڵی ١٩٩٥دا لە سەرەتای هەڵبژاردنی خولی پێنجەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی‌دا بەشێوەیەکی رەسمی خۆی راگەیاند، بەڵام پێشینەی دروست بوونی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٩. لەگەڵ کۆتایی هاتنی جەنگی عێراق لە دژی ئێران لە ساڵی ١٩٨٨ و سەرکۆماری ئەکبەر هاشمی رەفسنجانی‌دا، زەمینەی دروست بوونی ئەم حزبە فەراهەم بوو. ئەمانە باوەڕیان وابوو کە بە کۆتایی هاتنی جەنگی عێراق لە دژی ئێران (رۆژانی سیاسەتی جەنگ) کۆتایی هاتووەو ئێران چۆتە قۆناغێکی تازەوە. ستراتیجی ئەم باڵە لەسەر (بیناکردنەوەی ئابووری" و (بیرکردنەوەی بەرژەوەندخوازانە لە سیاسەتی دەرەوە" بنیات نرابوو. بەڕای ئەمانە ئێران بۆ بیناکردنەوەی ئەو کاول کاریانەی لە شەڕەوە سەرچاوەیان گرتبوو لەگەڵ دوا کەوتنەکانی ئەنجامی هەمان شەڕ دەبوایە سیاسەتێکی تازەی دەست پێ بکردایە، کە (راکێشانی یارمەتیە نێودەوڵەتیەکان) و (وەرگرتنی قەرز) لە دامەزراوە ئابوورییە نێودەوڵەتیەکان لەوانە بوون. سیاسەتێکی لەو جۆرە پێویستی بە چاوخشانەوەی سیاسەتی دەرەوەی سەردەمی جەنگ بوو. کە بەپێی ئەوە دەبوایە ئێران روو لە سیاسەتێ بکات کە بتوانێ وەکو ئەندامێکی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی حسابی بۆ بکرێ بۆ ئەوەی وەرگرتنی قەرزو راکێشانی یارمەتی لە کۆمەڵە نێودەوڵەتیەکانەوە فەراهەم ببێت. ئەو تەکنوکراتانەی لە خۆرئاوا خوێندنیان تەواو کردبوو لە دەوری هاشمی رەفسنجانی بوون دامەزرێنەری ئەم حزبەن.

---

[٥٥] هفتەنامە سیاست شمارە ٦، ٧٧/٥/٢٨.

ئەنجومەنی (پەرلەمان)ی سێیەم کەبە پایەگای کۆمەڵەی روحانیە خەباتگێڕەکان و گروپە نزیکەکانی لە قەڵەم دەدرا دەیتوانی بە کۆسپێ لەبەردەم جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی کارگوزاراندا حساب بکرێ. بەڵام هەڵبژاردنەکانی خولی چوارەمی پەرلەمان کە لە مانگی (٣)ی ١٩٩٢دا بەڕێوەچوون بوو بەهۆی ئەوەی کە باڵی کۆمەڵەی روحانیە خەباتگێڕەکان بەشێوەیەکی سەرەکی کورسیەکانی خۆیان لەدەست بدەن. لە راستی‌دا ئەم سەرکەوتنەی باڵی تەکنوکرات لە ئیئتلافی رانەگەیەنراوییانەوە لەگەڵ باڵی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تاراندا بەدەست هات. ئەوەی کە بووە هۆی نزیك بوونەوەی هەردو باڵی کارگوزاران و کۆمەڵەی روحانیەت لە هەڵبژاردنی خولی چوارەمی پەرلەماندا، نەمانی باڵی کۆمەڵەی روحانیە خەباتگێڕەکان بوو. لەبەرئەوەی کە لە بنەڕەتدا کارگوزاران دژی سیاسەتەکانی ئەو کۆمەڵەیە بوو. بەڵام لە ماوەی چوار ساڵ کارکردنی ئەنجومەنی چوارەم بەرەبەرە جیاوازی نێوان کۆمەڵەی روحانیەت و کارگوزاران دەرکەوت. هەر ئەم فاکتەرە بوو کە لە هەڵبژاردنەکانی خولی پێنجەمی پەرلەماندا تەکنوکراتەکانی ناچار کرد کە روو لە کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ وەربگێڕن و وەکو کۆمەڵێ لە کارگوزارانی بیناکردنی ئێران لە هەڵبژاردندا بەشداری بکەن. لە هەڵبژاردنی خولی پێنجەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی‌دا لە لیستی کاندیدەکانی ئەم گروپەدا ناوی دە کەس هەبوون، کە ئەم (١٠) ناوە لە لیستی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تارانیشدا هەبوون. رەخنە توندەکانی باڵی کۆمەڵەی روحانیەت لە کارگوزاران لە ماوەی نێوان هەڵبژاردنەکانی خولی پێنجەمی پەرلەمان هەتا هەڵبژاردنەکانی خولی حەوتەمی پەرلەمان، بوو بەهۆی ئەوەی ئەم گروپە لە هەڵبژاردنی سەرکۆماردا پشتیوانی لە کاندیدی بەرامبەر ئەو کەسە بکات کە بەلای کۆمەڵەی روحانیەتەوە پەسەند بوو.

عەتا ئەڵڵای مهاجرانی، محەممەدی هاشمی، غولامحسێنی کەرباسچی، مستەفا هاشمی تەبا، موحسینی نوربەخش، رەزای ئەمرڵڵایی، عەلی هاشمی و فایزەی هاشمی ئەندامانی دامەزرێنەری ئەم حزبەن، کە لەنێو ئەمانەدا غولامحسینی کەرباسچی وەکو سەرۆك دیاری کراوە. رۆژنامەی (همشهری) و (ایران) لە رۆژنامەکانی سەربەم گروپەن هەفتەنامەی (بهمن)یش کە حاڵی حازر بڵاونابێتەوە، سەر بەم گروپە بوو.

# بەشی دووەم

## هەڵوێستە
## سیاسی، ئابووری و فەرهەنگیەکانی باڵەکان

هەڵوێستە سیاسی و ئابووری و فەرهەنگیەکانی باڵی کۆمەڵەی رۆحانیەتی خەباتگێرو رێکخراوە هاوئاراستەکانی.

٢-١-بۆچوونە سیاسیەکانی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێری تاران و رێکخراوە هاوئاراستەکانی

دەتوانین بۆچوونە سیاسیەکانی ئەم باڵە لەم میحوەرانەی خوارەوەدا ریزبەندی بکەین.

ئەلف- تێڕوانینیان سەبارەت بە حکومەت

**١-ویلایەتی فەقیهو رابەری:**

ئەم باڵە، ویلایەتی فەقیه بە مەسەلەیەکی "دەست نیشان کراو" دەزانێت نەك مەسەلەیەکی "هەڵبژاردن" بەو مەعنایەی کە خەڵك دەوریان لە هەڵبژاردنیدا نییە. ئایەتوڵڵا محەممەد رەزا مەهدەوی کنی کە یەکێکە لە ئەندامانی ئەنجومەنی مەرکەزی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تاران دەڵێت: "ویلایەتی فەقیه مەسەلەیەك نییە کە بە هەڵبژاردن بێ، بەڵکو مەسەلەیەکی دەست نیشان کراوە. کەسێك کە کاری جێبەجێکردنە، مافی ئەوەی نییە کە لە مەسەلەکانی فیقهی و ئیجتهادیدا، لە بابەتە گشتییەکانی وڵاتدا رای خۆی دەربڕێ"[٥٦] حەبیبوڵڵای عسگر ئەولادی سەرۆکی کۆمەڵەی هاوپەیمانی ئیسلامیش تەئکیدی لە نەبوونی دەوری خەڵك کردۆتەوە لە هەڵبژاردنی وەلی فەقیهداو دەڵێت: "لە غیابی ئیمامی زمان (عج)دا وەلی

---

[٥٦] دوو هەفتەنامە عصرما، شمارە، ٣٠، ٧٤/٩/٢٢، ص٨.

فەقیهی دادپەروەر بە نوێنەرایەتی ئەو حەزرەتە کاروباری ئومەتی ئیسلامی لە ئەستۆدایە. رای هەندێ کەس سەبارەت بەوەی کە شەرعیەتی ویلایەت بەرای خەڵکەوە دەبەستنەوە پیلان و خواستی دوژمنانی ئیسلامە. لە سیستمی ئیسلامیدا ویلایەت لەناوەرۆکی ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتووە نەك لەرای خەڵکەوە"[٥٧].

باڵی کۆمەڵەی رۆحانیەتی خەباتگێر و گروپە هاوئاراستەکانی لە بەرامبەر ئەو بۆچوونەدا کە باوەڕی بە هەڵبژاردنی وەلی فەقیە هەیە، باوەڕی بە دۆزینەوە (کشف)ی وەلی فەقیە هەیە، بەو مەعنایەی کە وەلی فەقیە لە کۆمەڵدا هەیەو دەبێ شارەزایان (خبرگان) بیدۆزنەوە . لەم بارەیەوە لەسەر وتاری رۆژنامەی (رسالت)دا هاتووە: "خەڵك ژمارەیەك لە شارەزایان و پسپۆڕانی ئاین هەڵدەبژێرن و ئەو ئەرکەیان پێ دەسپێرن، کە بەرزترین زانای ئایینی بدۆزنەوە کە دووربینی ئازایەتی، خواپەرستیو دوربینی تیدابێت"[٥٨].

هەر لەم بارەیەوە کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێری تاران لە بڵاوکراوەیەکی تایبەتدا نووسیوویەتی: "ویلایەتی فەقیە رێسمانی مەحکەم و حەبلی خوداییە لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا کە شەرعیەتی خۆی لە خەڵك وەرناگرێ بەڵکو لە پەیوەندی بە ویلایەتی گشتی خوداییەوە وەری دەگرێ. ویلایەتی فەقیە بریتییە لە بەردەوام بوونی ویلایەت (دەسەلات)ی پێغەمبەر (د.خ) و ویلایەتی ئیمامی (عەلی) لە سەردەمی غیابدا.. رەخنەی بریندارکەر لە تیوری پێشکەوتوو شۆڕشگێڕانەی ویلایەتی رەهای فەقیە لە رێگەی دابەزاندنی پایەی ویلایەتەوە بۆ وەکالەت و سنووردار کردنی لە چوارچێوەیەکی دەست نیشان کراوو لە پێشدا دیاری کراودا، بەتاڵ کردنەوەی نیزامو ئیسلامە لەدەسەلاتی واقیعی ویلایەت"[٥٩] ئایەتوڵلا رەزا کە یەکێکە لە ئەندامانی کۆمەڵەی مامۆستایانی حەوزەی عیلمیەی قوم دەڵێت: "ویلایەت لە هیچ هەل و مەرجێکدا شەرعیەتی خۆی لە خەڵك وەرناگرێ و قایل بوون یان قایل نەبوونی

---

[٥٧] روزنامەهای ٧٦/٢/٤

[٥٨] روزنامە رسالت، ٧٤/٩/٢٦، ص١.

[٥٩] وێژنامە جامعە روحانیت مبارز بە مناسبت مرحلە دوم انتخابات دورە پنجم مجلس شورای اسلامی ص٣٢.

خەڵك هیچ كارێك لە بنەمای ویلایەتی فەقیە ناكات"[60] لە بەیاننامەی كۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێری تاراندا هاتووە: "ئەنجومەن (پەرلەمان) دەبێ گوێڕایەڵی ویلایەتی فەقیە بێ و لە پێناوی فراوان كردنی دەسەڵاتی ویلایەت و بەدیهێنانی بەهاو ئامانجەكانی شۆڕشی ئیسلامیدا بە هەموو توانایەوە هەوڵ بدات"[61] كۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێری تاران لە بەیانێكی رەسمیدا كە بڵاوی كردۆتەوە نووسیوویەتی:

"لە سیستمێكی ئیسلامی لە سەردەمی غیابدا، وەلی فەقیە، قسەی ئاخیر دەكات. ئەگەر كەسێك یان كەسانێكی دیكەش بیانەوێ لەلایەن خۆیانەوە قسەیەكیان هەبێ بۆ گوتن و لە بەرامبەر رابەرو وەلی فەقیهدا هەق و متمانە بەخۆیان رەوا ببینن، یەكەم ملكەچی عەمەلی ئەمانە بۆ ویلایەتی رەهای فەقیە دەكەوێتە ژێر پرسیارەوە، دووەم چیتر بەرد لەسەر بەرد بەند نابێ و پاشاگەردانی لە كۆمەڵگادا فەرمان رەوا دەبێت"[62] رۆژنامەی (رسالت) كە هەڵوێستی لە كۆمەڵەی روحانیەتەوە نزیكە بەشێوەیەكی رەخنەگرانە لەم بارەیەوە نووسیوویەتی: "دەڵێن هەموو مرۆڤەكان لە بەرامبەر خودا یەكسانن و هیچ كەسی بەسەر یەكێكی دیكەدا ویلایەتی نییە.. دەڵێن.. ئەرك و دەسەڵاتەكانی رەهبەرو وەلی فەقیە لە دەستووردا دیاری كراوە"[63]

بەوپێیەی كە ئەم باڵە باوەڕی بە "هەڵبژاردنی" ویلایەتی فەقیە نییەو بە (دەست نیشان كردنی) قایلە، باوەڕی بەجۆرێك پیرۆزی هەیە بۆ رابەری، ئەم باڵە رابەری شۆڕش بە (پشت ئەستوور بە پشتیوانی خوا) دەزانێت. لە بەیانێكی دیكەی كۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێردا هاتووە، "شۆڕشی ئێمە لەبەر مەحكەمی بنەمای تیوری خۆی سەبارەت بە رابەری هەرگیز دوچاری لاوازی، سستی و دواكەوتن نابێت. رابەری ئەم شۆڕشە پشتی بە پشتیوانی خوا بەستووەو مادام كە ئەم رابەرییە

---

[60] روزنامە كارو كارگر، ٧٥/١٢/٢١، ص٤.

[61] وێژە نامە روزنامە رسالت، ١٩/ ٧٤/١١.

[62] وێژەنامە جامعە روحانیت مبارز تهران بە مناسبت انتخابات دورە پنجم مجلس شورای اسلامی.

[63] روزنامە رسالت، ٧٤/٥/١٥، ص١.

پەیوەندییەکی خودایی و پەیمانێکی قورئانی‌یەو چەند پەیمانێکە لەسەر (وەحی) بنیات نراوەو بەرقەرارە، هیچ جێگایەك بۆ دزەکردنی دوژمنانی دەرەکی نامێنێتەوە"[٦٤] هەروەها رۆژنامەی (رسالت) نووسیوویەتی: "وەلی فەقیە لە سایەی توانای جێگیری دادپەروەری و عیلم و تەقواوە (ئەویش نەك لەسەر ئاستی ئاسایی بەڵکو لەسەر ئاستی بالا) لە گوناهو لادان پارێزراوە بۆیە ئیسلام وەلی فەقیهی کردووە بە حاکم و چاودێری ئەوانی دیکە. کەواتە چ کەسێك و کام دەزگا دەتوانێ لە سەرووی وەلی فەقیهەوە بێت و چاودێری بکات"[٦٥] لەلایەکی دیکەوە ئەم رۆژنامەیە هەر جۆرە رەخنەیەکی لە وەلی فەقیە رەت کردۆتەوە و دەنووسێ: "ویلایەتی فەقیە ئەمرۆ بنەمای نیزامی حکومەتی ئێمەیەو ناتوانرێ بە ئاسانی لە تریبوون و دەزگاکانی راگەیاندنی گشتی‌دا رەخنەی لێ بگیرێ"[٦٦]

ئەم باڵە شەرعیەتی تەواوی دەزگاکانی کۆمەڵ بە وەلی فەقیهەوە گرێ دەدات. لەبەرامبەر ئەو بۆچوونەدا کە شەرعیەتی پەرلەمان بە خەڵکەوە گرێ دەدات، ئەم باڵە شەرعیەتی پەرلەمانیش بە وەلی فەقیهەوە دەبەستێتەوە، نوێنەرانی سەر بەم باڵە لە خولی چوارەمی پەرلەماندا لە نامەیەکدا بۆ ئایەتوڵڵا سەید عەلی خامنەئی رابەری شۆرش نووسیان: "ئێمە پەسەندی پەرلەمان بە بەشێك لەو شەرعیەتە دەزانین کە لە ولایەتەوە سەرچاوە دەگرێ"[٦٧] بەم پێیە ئەم باڵە رۆڵێکی سنووردار بە پەرلەمان رەوا دەبینێ و بە بازووی یاسادان و چاودێری وەلی فەقیهی دەزانێ[٦٨].

هەر لەم پێناوەدا کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێری تاران لە بەیاننامەیەکدا رایگەیاند: "ئەنجومەنی شورای ئیسلامی دەبێ بازووی ویلایەت بێ لە ئیدارەی کاروباری وڵاتدا و لە پێناوی بەدی هێنانی بۆچوون و خواستەکانی ویلایەت لە

---

[٦٤] ویژەنامە روزنامە رسالت، ٧٤/١١/١٩.

[٦٥] دو هەفتەنامە عصرما، شمارە ٦٥، ٧٥/١٢/١٦، ص١٥ بە نقل از روزنامە رسالت ٧٥/١١/٢٨.

[٦٦] روزنامە رسالت، ٧٥/١١/٢٤، ص١.

[٦٧] روزنامە اطلاعات، ٧١/٣/١٣، ص٢.

[٦٨] ویژەنامە روزنامە رسالت ٧٤/١١/١٩ سخنان صدر نمایدە جامعە روحانیت در مجلس شورای اسلامی.

ولاتدا هەنگاو هەڵبگرێ"[69] هەروەها ئەم کۆمەڵەیە لە بەیانێکی ئاشکرادا نووسیوویەتی: "پەرلەمان.. دەبێ بە تەواوی مەعناوە ویلایەت قبوڵ بکات و لەژێر فەرمانی مەقامی موعەزەمی رابەری حەزرەتی ئایەتوڵڵا خامنەئیدا بێ. ئەم پەرلەمانە دەبێ هەموو هەوڵێکی خۆی بخاتەگەڕ بۆ ئەوەی لە جاران زیاتر زەمینەی فراوانکردنی وەلی فەقیە فەراهەم بێ. دەبێ یەکەم خەیاڵ و دوا خەیاڵی ئەندام پەرلەمانەکان، بەرێکی و بەتەواوی جێبەجێ کردنی نیازەکانی رابەری بێت"[70].

ئەم باڵە هێندە باوەڕی بە جەموریەتی نیزام نییەو پێی وایە، نموونەی حکومەتی ئیسلامی دەبێت لەسەر بنەمای ڕێوشوێنەکانی باوەڕی ئیسلام بنیات بنرێ. هەر لەم بارەیەوە کۆمەڵەی هاوپەیمانی ئیسلامی پێشنیازی بۆ "کۆمەڵەی دەست نیشان کردنی بەرژەوەندی نیزام" کرد کە لە گۆڕینی نیزامی جمهوری بۆ "حکومەتی عەدلی ئیسلامی" بکۆڵێتەوە. بڵاوکراوەی "شما" ئۆرگانی کۆمەڵەی (موئتەلیفە)ی ئیسلامی نووسیوویەتی: "پێشنیاز دەکرێ کۆمەڵە.. سەبارەت بە.. شێوەی گەیاندنی نیزام لە کۆماری ئیسلامیەوە بۆ نیزامی حکومەتی عەدلی ئیسلامی.. باس و لێکۆڵینەوە بکات و بۆچوونە راوێژکارییەکان پێشکەش بە وەلی ئەمری مسوڵمانان بکات"[71] لەم بارەیەوە ئایەتوڵڵا مەهدەوی کنی دەڵێت: "هەر حکومەتێ کە فەرمانڕەواکەی لەلایەن خوداوەندەوە دانرابێ و بڕیاری لەسەر درابێ بە یاسایی دەزانین هەرچەندە هەموو خەڵکیش قبوڵیان نەبێ و بە پێچەوانەشەوە هەر حکومەتی لەلایەن خوداوەندەوە بڕیاری لەسەر نەدرابێ و ڕێی پێ نەدرابێ، بە نایاسایی دەزانین و حکومە تێکی سەپێنراوە، هەرچەندە خەڵکیش پەسەندیان کردبێ.. لە حکومەتی خودایی و ئایینیدا سنوورو ئەرك و دەسەڵات و مافەکانی خەڵك لە بەرامبەر فەرمانڕەوادا لەلایەن خوداوەندەوە دەست نیشان دەکرێ وئەگەر بێجگە لەم شێوەیە وێنابکرێت حکومەتی خودایی مەعناو متمانەیەکی نابێت..

---

[69] روزنامه اطلاعات، ۷٤/۱۲/۱۰، ص۲.

[70] ڕیژەنامە جامعە روحانیت مبارز بە مناسبت دوره دوم انتخابات مجلس شورای اسلامی ۷۵/۱/۲٤، ص ۳۲.

[71] هفتەنامە شما، شمارە ۷، ۷٦/۱/۲۱، ص ۷.

حکومەت هەرچەندە لەسەر حەق و حەقیقەت راوەستابێ دەبێ کارو کردەوەی مایەی پەسەندکردنی خەڵك بێو لەلایەن خەڵکەوە پشتیوانی لێ بکرێو لە بنچینەدا جگە لەم رێگەیە رێگەیەکی دیکە لە بەردەم حکومەتی دینیدا نییە کە لە سەر بیروباوەڕی خەڵك بنیات نراوە.. بەلاَم.. پەسەندکردنی خەڵك بە تەنها بەس نییە، بەڵکو لەگەڵ جێبەجێکردنی مەقامی ویلایەتدا کامڵ دەبێت"[72].

هەر لەم بارەیەوە بەیاننامەی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ نووسیوویەتی: "سەرەکی ترین جیاوازییەکانی هەڵبژاردن لە کۆماری ئیسلامی ئێران و تەواوی وڵاتەکاندا (لەوەدایە) کە لە وڵاتەکانی دیکە هەڵبژاردن لە نێوان باش و گەندەڵدایە، بەلاَم لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا لەگەڵ بوونی شورای نگهبان و یاسای هەڵبژاردندا، (چاودێری راستەقینەی) خەڵك ئەوەیە لە نێوان باش و باشتردا هەڵدەبژێرن"[73]

ئایەتوڵڵا موحدی کرمانی ئەندامی ئەنجومەنی مەرکەزی روحانیەتی خەباتگێڕی تارانیش لە چاوپێکەوتنێکدا گوتی: "لە ئیسلامدا هەڵبژاردنی باشتر دەخرێتە روو، نەك رکابەری هەڵبژاردن بەشێوەی خۆرئاوایی، بۆیە ئەو داوایانە لە قاڵبە تایبەتیەکانی دیموکراسی خۆرئاوادایە کە دەربارەی خوداو دین هیچیان نەبیستووە"[74].

رۆژنامەی رسالت بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ "جمهوریەت" دەخاتە ژێر پرسیارەوەو بەم شێوەیە دەنووسێت: "شۆڕشی ئیسلامی کۆمپانیای پشك (سهم) نییە کە دەستەی بەڕێوەبردنی بەپێی بڕی سەرمایەو رادەی دەسەلاَتی ئەندامەکان پشکی شەریکەکان بپارێزێ. شۆڕش مەسەلەیەکی خوداییە. ئەگەر پشکیشی تێدا بخرێتە روو، هی ئەو کەسانەیە کە خواپەرستی بکەنە پیشە، رێز لە سنوورەکانی خودا بگرن و کارامەبن"[75] قسەی یەکێك لە ئەندامانی دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی (رسالت) ئەوە نیشان دەدات کە ئەم باڵە رای خەڵك لە بەرامبەر خودادا دادەنێ. ئەم

---

[72] روزنامه رسالت، ٧٦/١/٢٧، ص٥.

[73] دو هفتەنامه عصرما، شماره ٣٢، ٧٤/١١/٤، ص ١ به نقل ازبولتن جامعه روحانیت مبارز نیمه اول ازار ٧٤.

[74] ویژەنامه جامعه روحانیت مبارز تهران به مناسبت انتخابات دوره پنجم مجلس شورای اسلامی ص١٢.

[75] روزنامه رسالت ١٠/٤/٧٤؛ ص١.

ئەندامە دەڵێت: "قسەو باسی وەکو وەکالەت یان بایەخ دان بە خەڵك و تەئکید کردنەوە لەسەر دیموکراسی رەنگە بە رووکەش پەیوەندییەکی بە ئافاتی شۆڕشەوە نەبێ، بەڵام کاتێك بە قوڵی سەرنجی مەسەلەکە دەدەین هەست بەوە دەکەین کە ئەمانە دەیانەوێت پەیوەندی نێوان زەمین و ئاسمان نەهێڵن"[٧٦] دەتوانین بڵێین کە ئەم باڵە لەجیاتی جەمهوری باوەڕیان بە (حکومەتی سالحان) (روحانیەکان) هەیە.

ئایەتوڵڵا محەممەدی یەزدی ئەندامی ئەنجومەنی مەرکەزی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ باوەڕی وایە کە: "سیاسەت و حکومەت و ویلایەت لە کاروباری روحانیەتدا هەموو مەرجەکانی تێدایەو لەکاتێکدا کە فەقیە هەموو مەرجەکانی تێدابێ و رابەری نیزامی ئیسلامی هەبێ، باقی خەڵك مافی دەستوەردانیان لە مەسەلەکانی حکومەتی دا نی یە"[٧٧] بەیاننامەی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تارانیش لەم بارەیەوە بەم جۆرە دەنووسێ: "چاودێری راستەقینەی شورای نگهبان، گرنگترین ئامرازی پارێزگارییە بۆ پاراستنی رەئی خەڵك و مافی میللەت لە لادان و پروپاگەندەی کەسانی ناسالح. چاودێری راستەقینە ئەو خاسیەتەی هەیە کە کەسانی سالح لەلایەن شورای نگهبانەوە دەست نیشان دەکرێن و خەڵك لەنێو ئەوانەدا کەسانی سالح تر هەڵدەبژێرن"[٧٨] بڵاوکراوەی (شما)ش نووسیوویەتی "مەفهومی حکومەت جگە لە ویلایەت شتێکی دیکە نی یە"[٧٩].

ئەم باڵە باوەڕی وایە، کە روحانیەکان دەبێ جڵەوی کاروباری کۆمەڵیان لەدەست دابێ. بۆلتنی (بەیاننامە)ی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تاران لەم بارەیەوە نووسیوویەتی:

"هەر حکومەتێ لەگەڵ روحانیەتدا نەبێ و هەر هەوڵێك کە لە بەرامبەر روحانیەتدا بوەستێ و بۆ لە گۆڕەپان دەرکردنی روحانیەتی راستەقینە ئەنجام بدرێ، لادانێکی

---

[٧٦] ماهنامه صبح، شماره ٦٧، اسفند ٧٥، ص٢١.

[٧٧] روزنامه سلام، ٧٦/٤/٢٦، ص٢.

[٧٨] دو هفتەنامە عصرما/ شمارە ٢٨، ٧٤/٨/٢٤، ص٣ به نقل از خبرنامه جامعه روحانیت مبارز، شماره ٢٠.

[٧٩] دوهفته نامه شما، شماره ١٠، ٧٦/٢/١١، ص٦.

گەورەیە لە خەتی ئیمام"[80] عەلی ئەکبەر ناتقی نوری کە یەکێکە لە ئەندامە بەرجەستەکانی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ دەڵێت: "روحانیەت لەبەرئەوە گۆڕەپان چۆڵ ناکات بۆ ئەوەی کە شۆڕش لە ڕێڕەوی سەرەکی خۆی لانەدات و مێژووی مەشروتە دوبارە نەبێتەوە.. ڕۆحانیەت وەکو میراتگری پێغەمبەران و ئیمامە بێ گوناهەکان، پەیام گەیاندنی ئاینی خوداو ڕێنمایی خەڵکی لە ئەستۆدایە. بۆیە ئێمە بۆ بەجێ هێنانی ئەرکی سەرشانمان چووینە مەیدانی هەڵبژاردنەوە"[81] هەروەها گوتوویەتی: "روحانیەت و زانایانی ئاینیمیراتگری پێغەمبەرانن و ئەمەش بە مەعنای ئەوەیە کە لە راستیدا روحانیەت دەبێ لە بواری ڕێنمایی کردنی خەڵکدا ئەرك و بەرپرسیارێتی پێغەمبەران لە ئەستۆ بگرێ"[82] لەلایەکی دیکەوە ئەم باڵە باوەڕی بەوە نییە کە زانا ئاینی و روحانیەکان وەڵامی خەڵك بدەنەوە، چونکە ئەمانە (بۆ بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانیان) دێنە ناو چالاکی سیاسەتەوە. بۆ تەئکیدکردنی هەمان بۆچوون ڕۆژنامەی رسالت نووسیوویەتی: "زانا ئایینیەکان لە بەرامبەر خودادا بەرپرسیارن"[83]. بە باوەڕی ئەم باڵە بەرژەوەندی کۆمەڵ لەسەرەوە و لەلایەن وەلی فەقیهەوە دەست نیشان دەکرێ. ڕۆژنامەی رسالت نووسیوویەتی: "وشەی ڕەها لە (ویلایەتی ڕەهای فەقیهدا) دەربڕی دەسەڵاتەکانی حکومەتە.. مەعناکەی بریتییە لەو دەسەلات و توانایەی کە فەرمان ڕەوا بتوانێت بۆ دابین کردنی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵ و خەڵك هەر کێشەیەك چارەسەر بکات و هەر کۆسپێك لەسەر ڕێگە لابدرێت"[84].

## ٢-حزبەکان

بە سەرنجدان لە جۆری تێڕوانینی ئەم باڵە بۆ ویلایەتی فەقیه وەکو باسکرا، چالاکی حزب بەرای ئەم باڵە بەو شێوە باوەی لای حکومەتە دیموکراسیەکان نابێ.

---

[80] بولتن جامعه روحانیت مبارز تهران ویژه مرحله دوم انتخابات دوره پنجم مجلس شورای اسلامی ٧٥/١/٢٤.

[81] روزنامه رسالت، ٧٤،١٢،٢٧، ص٢.

[82] ماهنامه ایران فردا، شماره ٣٠، بهمن ٧٥، ص ٦١ به نقل از روزنامه رسالت ٧٥/٨/٢٧.

[83] همان، ٧٤/٤/١١، ص١.

[84] همان، ٧٤/١٠/٩، ص٢.

ئایـەتوڵڵا حـائری شـیرازی کـە لـە ڕووی بۆچوونـەوە لـە کۆمەڵـەی روحانیـەتی خەباتگێڕەوە نزیکە لەم بارەیەوە دەڵێت:

"لە کۆمەڵگای ئێمەدا لەجیاتی ویلایەتی حزب، ویلایەتی فەقیهە. ئەگەر حزب لە وڵاتی ئێمەدا بیەوێ بێتە مەیدانەوە دەبێ لە چوارچێوەی بیری ئێمەدا بێ. واتە حزب خەتێك و فەقیهیش خەتێکی دیکە نەبێت. چونکە لەو حاڵەتەدا دوو جەمسەر دروست دەبێت و حاڵەتی بازنەیی دەگۆڕێت بۆ هێلکەیی و ئارامی لەناو دەبات"[85].

لە لایەکی دیکەوە بە سەرنجدان لەو تێڕوانینە ڕەهایەی ئەم باڵە هەیەتی و بۆچوونەکانی دیکە بە هەڵە دەزانێ، چالاکی حزب مەعنایەکی نابێ. ئەم باڵە، باڵە سیاسیەکانی دیکە بە لادەر لە خەتی شۆڕش دەزانێت و هەتا کۆمەڵەی روحانیە خەباتگێڕەکان کە لە کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تاران جیابۆتەوە، بەلادەر لە بنچینەکانی ئیسلام دەزانێت.

**بەپێی هەمان بۆچوون، ڕۆژنامەی رسالت دەنووسێت:**

"بە بۆچوونی ئێمە کارنامەی سیاسی ئەم باڵە (روحانیە خەباتگێڕەکان) لە دوای کۆچی دوایی حەزرەتی ئیمام (قدە) هەتا ئەمڕۆ هەڵوێست و کردەوەی وای تێدایە کە هەندێکیان نەك هەر لەگەڵ بنچینە ئیسلام و شۆڕشدا ناگونجێن، بەڵکو لەگەڵیدا ناکۆکیش دێنە بەرچاو.. ئەو ڕێڕەوەی کە (روحانیە خەباتگێڕەکان لە ساڵی ١٩٨٩)، هەتا ئەمڕۆ هەنگاویان تێدا ناوە ڕێگا نەبووە بەڵکو گومڕایی بووە"[86]. بەشێوەیەکی گشتی ئەم باڵە، بەپێی ئەوەی کە لە هەواڵنامەکەی خۆیدا هێناویەتیەوە باڵە سیاسیەکان بۆ دوو گرووپی "ئسوڵی و بێ ئسوڵ" دابەش دەکات. "لە مەیدانی هەڵبژاردنەکانی خولی پێنجەمی پەرلەماندا دوو ڕەوتی سەرەکی کە گرووپی جیاواز پاشکۆیانە رکابەری یەکتری دەکەن:

ئەلف- ڕەوتێك کە پشت بە ئسوڵ و بنەماکانی ئیسلامی دەگمەنی محەممەدی (د.خ) دەبەستێ، پەیرەوی ویلایەت دەکات و لایەنگری ئامادەبوونی روحانیەتە لە مەیدانی سیاسیدا.

---

[85] دوهفته نامه عصرما، شماره ٦٣، ص٧ به نقل از نشریه اروند، ٧٥/١١/٨.

[86] روزنامه رسالت، ٧٤/١٠/١٤، ص٢.

ب-رەوتێك كە باوەڕی بە لیبرالیزمی فەرهەنگی و سیاسی و ئابووری هەیەو ئامادەبوونی بەهێزی ویلایەت و روحانیەت لە گۆڕەپانی وڵاتدا تەحەمول ناكات)[87].

بەیانامەی ئەم كۆمەڵەیە لە جێگایەكی دیكەدا نووسیوویەتی:

"بە شێوەیەكی گشتی لە حاڵی حازردا دوو رەوتی كاریگەر لە مەسەلەی هەڵبژاردندا بەدی دەكرێ:

**١-رەوتی سەر خەتی ویلایەت**

**٢-رەوتی دەرەوەی خەتی ویلایەت**

دەتوانین رەوتی دووەم بەتارماییەك ناوبەرین بەو مەعنایەی كە ئەو باڵ و رەوتانەی كە لە رابردوودا لەگەڵ یەكتری دا چەند جیاوازییەكیان هەبوو، ئەمڕۆ لەسەر بنەمای چەند بۆچوون و بەرژەوەندییەكی هاوبەش لە یەكتری نزیك بوونەتەوەو جۆرێك لە هاوپەیمانیان لە دژی رەوتی یەكەم پێك هێناوە. هەرچەندە ئەم هاوپەیمانیە بە رەسمی رانەگەیەنراوە بەڵام بەڵگەو شایەتی زۆر شایەتی لەسەر ئەو نزیكی و هاوكارییە دەدەن"[88].

حیجەتول ئیسلام مطلبی ئەندامی ئەنجومەنی مەركەزی كۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تاران لە چاوپێكەوتنێكدا دەربارەی هاتنە ناوەوەی گروپ و رەوتە سیاسیەكان بۆ مەیدانی هەڵبژاردن، لەگەڵ پێشوازی لەو مەسەلەیەدا، دەربارەی ئەگەری دزەكردنی (كەسانی نامەسئول و ناویلایەتی) لە هەل و مەرجێكی لەو جۆرەدا قسە دەكات، لە كاتێكدا كە ئەم كەسانە لەلایەن شورای نگهبانەوە پەسەند كراون. مطلبی دەڵێت: "هاتنە ناوەوەی گروپەكان و پێشكەش كردنی لیستی نوێنەرایەتی زۆر باشە. چونكە یەكەم كەش و هەوای هەڵبژاردن گەرم دەبێت و دووەم تۆمەتەكانی دوژمنانی ناوخۆو دەرەوە پوچەڵ دەكاتەوەو ئەوە نیشان دەدات ئازادی واقیعی لە سیستمی پیرۆزی كۆماری ئیسلامی‌دا هەیە. هەڵبەتە لەم حاڵەتەدا ئەركی خەڵك زۆر قورس دەبێت و دەبێت زۆر ورد بن بۆ ئەوەی كەسانێك هەڵنەبژێرن كە سبەی رۆژی زیندووبوونەوە بۆ وەڵامدانەوە بەڵگەی شەرعیان بەدەستەوە نەبێت.

---

[87] دوهفته نمنامه عصرما، شماره ۲۸، ۷٤/۸/۲٤، ص٤ به نقل از بولتن جامعه روحانیت مبارز، شماره ۲۱.

[88] همان، شماره ۳۲، ۷٤/۱۰/۲۰، ص۲ به نقل از بولتن جامعه روحانیت مبارز، ابان ۷٤.

لەم کاتەشدا روحانیەت بەرپرسە لەوەی کە رۆڵی رێنمایی و بەرچاوروون کەرەوەی خۆی پیادە بکات، چونکە ئەگەری دزەکردنی کەسانی نامەسئول و ناویلایەتی زیاتر دەبێت"[89].

بە تێڕوانینێکی لەمجۆرەوە ئەم باڵە پشتیوانی لە دروست کردنی حزب دەکات. عەلی ئەکبەر ناتقی نوری لەم بارەیەوە دەڵێت: "وڵاتێك کە پشت بە هەڵبژاردن ببەستێ، بێگومان پێویستی بە رێکخراو و حزبایەتی هەیە. بەڵام حزبەکان دەبێ گەورەو سەرتاپاگیر بن"[90] بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەم باڵە دژی ئەوەیە کە حزبایەتی وەها فراوان بکرێت بگاتە سەرو روحانیەتیش.، ئایەتوڵڵا مەهدەوی کنی دەڵێت: "من دژی حزبایەتی روحانیەتم چونکە روحانی باوکی خەڵکە"[91].

عەلی ئەکبەر ناتقی نوریش دەڵێت: "روحانیەت خەباتگێری حزب نییە.. ئێمە وەکو حزب کار ناکەین"[92].

پێدەچێت ئەم باڵە پێناسەیەکی تایبەتی بۆ چالاکی حزب هەبێ، چونکە بۆ بەدەست هێنانی دەسەڵات باوەڕی بە چالاکی حزب نییە. ئەسەدوڵڵای بادامچیان کە یەکێکە لە سەرانی کۆمەڵەی هاوپەیمانی ئیسلامی دەڵێت:

"ئایا بۆ دەستوەردان لە دەسەڵات حزب دروست دەکەین؟ ئەگەر بۆ دەستوەردان لە دەسەلات حزب دامەزرێنین کارێکی نائیسلامیمان کردووە. رۆشنبیری ئیسلام ئەمەی قبوڵ نییە"[93] بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەم باڵە "دەربارەی میحوەری ویلایەتی فەقیهو بەها پەسەندکراوەکان.. فرەمینبەری بە شتێکی پێویست دەزانێت"[94].

---

[89] ویژنامه جامعه روحانیت مُبارز تهران، به مناسبت انتخابات مجلس پنجم، ص ۱۹.

[90] دوهفتەنامه عصرما، شماره ۳۰، ۷٤/۹/۲۲، ص۱.

[91] روزنامەهای ۷٤/۹/۲۹.

[92] روزنامه ابرار، ۷٥/٤/۱۹، ص٤.

[93] روزنامه اخبار، ۷٤/۸/۹، ص٤.

[94] ویژەنامه جامعه روحانیت مبارزه به مناسبت مرحله دوم انتخابات دوره بنجەم شورای اسلامی، ۷٥/۱/۲٤، ص۲۸.

٣-ئازادی:

بە سەرنجدان لە تێڕوانینی ئەم باڵە بۆ ویلایەتی فەقیهو حزب، ئازادی چالاکی سیاسی و چاپەمەنی بۆ ئەو گروپانەی کە بەلایانەوە پەسەندە، بە پێویست دەزانن. چونکە هەروەکو باسکرا ئەم باڵە تێڕوانینێکی رەهای هەیەو بۆچوونی باڵەکانی دیکە بەلادان لە ئسوڵی ئیسلام دەزانێت. لەم بوارەدا، ئەم باڵە بەو (خەتە سورانە) قایلە کە نابێ بە هیچ جۆرێ رەخنەیان لێ بگیرێ. رۆژنامەی رسالت دەنووسێ: "لە نێوان بنەماو قەدەغەکراوەکاندا چەند بنەمایەك هەیە کە لە باقی ئەوانی تر گرنگ ترەو حەساسیەتی خەڵك سەبارەت بەوانە زیاترەو چاودێری کردنیان پێویست ترەو بریندارکردنیان لە هەموو شتێ زیاتر قسەی لەسەر دەکرێ، ئەم بنەمایانە بریتین لە:

١-ویلایەتی فەقیه.

٢-شەخسیەتی رابەری ئیمام خومەینی.

٣-کاروپلەوپایەی روحانیەت کە بەشێکە لە بنەما سەرەکیەکان و خەتە سوورەکانی نیزامەو ئەگەر کەسێك بە قەڵەم و بە هەر دەربڕینێك هەوڵ بۆ لاوازکردن و بریندارکردنیان بدات ئاو بە ئاشتی دوژمنانی ئەو شۆڕشە دا دەکات"[٩٥].

محەممەد جواد لاریجانی نوێنەری کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێر لە ئەنجومەنی شورای ئیسلامیدا تەئکید لە دەرکردنی (لادەران لە رێبازی ئیسلام) دەکاتەوەو دەڵێت: "رێکخراوێکی سیاسی کە لە رێبازی ئیسلام لایدابێت دەبێ وەکو مزگەوتێکی زیان بەخش تەماشا بکرێ کە ئەگەر نەروخێنرێ، بێگومان کاولکاری دێنێ"[٩٦].

ئەم باڵە بوونی دیدگا جیاوازەکانی لە (مەداری حەق)دا قبوڵە. هەروەها محەممەد جەواد لاریجانی لەم بارەیەوە ووتوویەتی:

"لەسەر مەداری حەق ئێمە دەبێ ئەوە قبوڵ بکەین کە فیکری جیاواز بتوانن بوونیان هەبێ.. ئێمە دەبێ بواری ئەوە بدەین کە فیکری جیاواز لەسەر مەداری حەق

---

[٩٥] روزنامە رسالت، ٧٥/١١/٢٣، ص١.

[٩٦] ویژەنامە جامعە روحانیت مبارز تهران بە مناسبت انتخابات دورە پنجم مجلس شورای اسلامی، ٧٥/١/٢٤.

پێکەوە گەشە بکەن. واتە لەسەر مەداری حەق ئێمە دەتوانین جیاوازیمان هەبێ. بۆ نموونە ئەوەی کە دوو فەقیە لەسەریەك مەسەلە چەند بۆ چوونێکیان هەبێ"[97]

## ٤-بەشداریی سیاسی:

ئەم باڵە لەلایەنی (حەق)ەوە تەماشای بەشداریی سیاسی خەڵك ناکات بەڵکو لەلایەنی (ئەرك)ەوە تەماشای دەکات. کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ لە بەیاننامەیەکدا بەم شێوەیە باس لەم مەسەلەیە دەکات: "بەشداریی سیاسی لە مەسەلەی هەڵبژاردندا ئەرکێکی شەرعی‌یە کە نابێ لەم مەسەلەیەدا بواری هیچ دوودڵیەك بدرێ"[98] هەروەها ئەم کۆمەڵەیە لە بۆڵتنی خۆی‌دا نووسیوویەتی: "ئامادەبوون لە هەڵبژاردنەکانی ئێرانی ئیسلامی‌دا لەو لایەنەوە بوو کە فەرمانێکی خودایی‌یە، زیاتر لایەنی مەعنەوی لەخۆی دەگرێ"[99] و هەر لەم بارەیەوە درێژەی دەداتێ:

"ئامادەبوونی خەڵك لە مەیدانەکەدا بەرلەوەی ئەرکێکی کۆمەڵایەتی حکومی بێت، پێویستیەکی ئاینی‌یە. بۆیە هەرگیز ئەرکی ئامادەبوون لە مەیدان و بەشداریی لە مەیدانە جیاوازەکاندا لە ئەستۆی کەسێك لە تاکەکانی کۆمەڵدا ناماڵرێ. لە بنچینەدا ئامادە بوون لە مەیدان و بەشداریی مەسەلەیەکی تایبەتی‌یەو بەوجۆرە نی‌یە کە ئەگەر ژمارەیەك لە مەیدانەکەدا ئامادەبوون ئەرکی سەرشانی ئەوانی دیکە نامێنێ. ئێمە چونکە لە گۆشە نیگای ئاینی و حکومەت و شۆڕشەوە لە بەشداری گشتی دەڕوانین پێمان وایە کە نابێ هیچ رێگرێك لەسەر رێگای بەشداری گشتی‌دا هەبێت"[100].

---

[97] دوهفتەنامە شلمچە، شمارە ٦،٧، فروردین و اردبهشت ٧٦، ص١٤.

[98] بیانیە جامعە روحانیت مبارز تهران، ٧٤/١١/١٢.

[99] ویژەنامە جامعە روحانیت مبارز تهران بە مناسبت انتخابات دورە پنجم مجلس شورای الاسلامی، ٧٥/١/٢٤، ص٢٨.

[100] همان، ص٢٤.

ئەم باڵە هەتا ئەو شوێنە بەشداریی خەڵکی لە چالاکیە سیاسیەکان قبوڵە کە لە پێناوی ئەو بۆچوونانەدا بێ کە بەلای ئەوەوە پەسەندە. ئایەتوڵڵا مەهدەوی کنی لەم بارەیەوە دەڵێت: "رای خەڵك بەلای ئێمەوە گرنگە بەڵام ئەم رێزگرتنە دەبێت بەشێوەیەك بێت کە پرانسیپی بنچینەیی نەکەوێتە ژێر پرسیارەوە"[101] لە راستیدا ئەم باڵە وەکو پەیمان تازە کردنەوە لەرای خەڵك دەڕوانێ. ئایەتوڵڵا (محەممەد ئیمامی کاشانی) ئەندامی ئەنجومەنی مەرکەزی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێری تاران لە باسێکدا دەربارەی شەرعیەتی ویلایەتی فەقیە ووتوویەتی: "پەیمان تازەکردنەوە لایەنی بەکردەوە بەدی هێنان و لە دەرەوە هەنگاو هەڵهێنانی تێدایە"[102].

بە لەبەرچاوگرتنی ئەم بۆچوونانە وادیارە کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێر، بەشێوەیەکی گشتی لە بەشداریی سیاسیدا ئەولەویەت بە "ئامادەبوونی خەڵك لە رێپێوانەکان، پێشوازی لە کاربەدەستان، بەشداری لە هەڵبژاردندا" دەزانێت و لەو شوێنەدا کە قسە دێتەسەر (رێکخراو و حزبی سیاسی) لەگەڵ پێشگری "رەنگە"دا ئاماژەی بۆ دەکات. کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێر لە وێژەنامەی خۆیدا دەنووسێت "بەشداریی خەڵك شێوازی جۆراوجۆری هەیە کە جارێك بەشێوەی ئامادەبوون لە رێپێوانەکان، پێشوازی لە کاربەدەستان، بەشداری لە مەراسیمی خواپەرستی-سیاسی نوێژی هەینی، جارێك بەشێوەی ئامادەبوون لەبەردەم سندوقەکانی دەنگدانی ریفراندۆم، هەڵبژاردنی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی و خبرگان، سەرکۆمار یان هەڵبژاردنی ئەنجومەنە ئیسلامیەکانی شارو دێ خۆی دەنوێنێ. (رەنگە جارێکیش بەشێوەی رێکخراو و حزبی سیاسی و ئامادەبوونێکی ریکخراو بێ لە مەیدانە جیاوازەکان"[103]دا.

بەڵام ئەم باڵە باوەڕێکی ئەوتۆی بە بەشداریی سیاسی نییە بەو مەعنایەی کە لە سیستمە دیموکراسیەکاندا هەیەو پەیوەندی لەگەڵ زانا ئایینیەکانداو ئامادەبوون لە مزگەوتەکان و هەنگاوی لەم جۆرە بە بەشداریی سیاسی لێك دەداتەوە. ئایەتوڵڵا

---

[101] ماهنامه صبح، شماره ٦٧ اسفنده ٧٥، ص٦.

[102] سغنرانی درنماز جمعه تهران، ٧٦/٢/٥.

[103] ویژەنامه جامعه روحانیت مبارز تهران، به مناسبت انتخابات دوره بنجم مجلس شورای اسلامی ٧٥/١/٢٤، ص٣٤.

مەهدەوی کنی لەم بارەیەوە پێی وایە کە: "تەنها رێگەی بەشداری سیاسی خەڵك لە حزبەکاندا نییە. خەڵك لە رێگەی پەیوەندییانەوە لەگەڵ زانا ئایینی و گەورەکاندا.. بەشداری لە کاروباری سیاسیدا دەکەن و شۆڕشەکەی ئێمە نموونەیەکی دیکەی بۆ بەشداری هەیە، هەمان ئەوەی کە خەڵك لە شەوو رۆژێکدا چەند جارێ لە مزگەوتەکاندا بۆ خواپەرستی ئامادە دەبن و پەیوەندی لەگەڵ رابەرانی ئاینیدا دەبەستن و دەربارەی مەسەلە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان پرس و رادەکەن، جگە لە زانا ئایینیەکان لەگەڵ مسوڵمانە هوشیارەکانی دیکەدا پەیوەندییان هەیە، ئەمە بۆخۆی جۆرێکە لە ئامادەبوونی سیاسی. شۆڕش لە مزگەوتەکانەوە بە رێنمایی زانا ئاینی و روحانیەکان دەستی پێکردو بەردەوام بوونیشی بەهەمان رێوشوێن پێشکەوت. ئەمەش دەتوانێت نموونەیەك بێت بۆ بەشداری سیاسی، واتە ئامادەبوون لە مزگەوت و پەیوەندی کردنی مسوڵمانان بەیەکەوە لە کاروباری گرنگی وڵاتدا. جۆرێکە لە بەشداریی سیاسی"[١٠٤].

### ٥-ناردنە دەرەوەی شۆڕش:

باڵی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ پێی وایە ئێران "ام القرای دار السلام"ە. عەلی ئەکبەر ناتقی نوری لەم بارەیەوە دەڵێت:

"مەسئولیەتی "سەرکۆمار" مەسئولیەتێکی قورسەو سەرەڕای بەرپرسیاری لە ٦٠ ملیون کەسی ئێران، بەرپرسیاری یەك ملیار و چەند سەد ملیۆن مسوڵمانیش لە ئەستۆی سەرکۆماردایە. چونکە ئێرە (ام القری- مەککە) و ئومێدیانە"[١٠٥]. باوەڕ بەو تیورەی ئێران (ام القرای دار السلام-ە مەککەی سەرای ئاشتییە) ئەوە نیشان دەدات کە ئەم باڵە پشتیوانی لە ناردنە دەرەوەی شۆڕش دەکات. محەممەد جواد لاریجانی ئەندازیاری ئەم تیورە لە باسکردنیدا دەڵێت:

"لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران.. ئێران بوو بە مەککەو سەرای ئاشتی. ئەگەر وڵاتێك ببێ بە (مەککە) لەو حاڵەتەدا رابەرییەکەی پێویستە لەسەری

---

[١٠٤] ویژنامە روزنامە رسالت، ٧٤/١١/١٩.

[١٠٥] ماهنامە صبح، شمارە ٦٤، آذر ٧٥، ص٢٦.

که بەرژەوەندی سەراپای نەتەوە لەبەرچاو بگرێ و لەلایەکی دیکەوە پاراستنی ئەو بەرژەوەندییە ئەرکی سەرشانی سەراپای نەتەوەی ئیسلامەو لە پێش هەر مەسەلەیەکی دیکەوە دەبێت. پراکتیکی تیوری (ام القری)، بریتی‌یە لە ناردنە دەرەوەی شۆڕش و داکۆکی لە ئومەتی ئیسلام کە یەکەم ئومەتەو لەگەڵ پرانسیپی ئابڕووی (ام القری)دا شێلراوە. ئەگەر لەهەر جێگایەکی دنیادا هێرش بکرێتە سەر ئیسلام یان دەست درێژی بکرێتە سەر مافی مسولمانان، ام القری بەرگری لێ‌دەکات"[106].

## ٦- پسپۆڕی:

باڵی کۆمەڵەی رۆحانیەتی خەباتگێر تەئکید لەکەڵك وەرگرتن لە پسپۆڕان دەکاتەوە بەڵام ئەولەویەت بە عەهدو پەیمانە نەك بە پسپۆڕی. عەلی ئەکبەر ناتقی نوری لەم بارەیەوە دەڵێت:

"ئێمە بایەخ بە کەڵك وەرگرتن لە زانست و زانیاری دەدەین بەڵام دژی باڵادەستی زانستین و پێمان وایە کە پسۆڕی بەبێ عەهدو پەیمان کارەسات هێنەرەو مایەی بەدبەختی‌یە.. لە کۆمەڵی ئێمەدا باس لەوە دە کەن کە تەنها بەڕێوەبردنی زانستی دەتوانێت کۆمەڵ رزگار بکات.. ئەمانە لە رواڵەتە ترسناکەکانی هێرشی فەرهەنگی دوژمنن"[107]

محەممەد رەزای باهونەر نوێنەری کۆمەڵەی روحانیەت لە ئەنجومەنی شورای ئیسلامی و لە ئەندامانی کۆمەڵەی ئەندازیارانی ئیسلامی یش تەئکید لە باڵادەستی ئاین بەسەر تەکنیکدا دەکاتەوەو باوەڕی وایە کە: "واژەی تەکنوکرات بە مەعنای باڵادەستی تەکنیکەو ئەگەر کەسانێك هەڵوێستیان بەرامبەر تەکنوکرات ئەوەبێ کە تەکینك دەبێ دەسەڵاتی هەبێ ئەوە یەکەم جیاوازی بۆچوونی ئێمە لەگەڵ ئەوانەدایە ئێمە دەڵێین ئاین، سالارەو حکومەت حکومەتێکی ئاینی‌یەو بەهاکان، بەهای ئاینین. هەڵبەتە خودی حکومەتی ئاینی گرنگی‌یەکی زۆر بە زانست و تەکنیك و هونەر

---

[106] محەممەد جواد لاریجانی، مقولاتی دراستراتژی ملی، مرکز ترجمە و نشر کتابە ص (٤٨-٥٤).

[107] لاورنامە اطلاعات، ٧٤/٩/٢٣/ ص٢.

دەدات"[108] هەر بۆیە دەبینین کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ لە بەیاننامەیەکدا کە دەربارەی تایبەتمەندییەکانی نوێنەرایەتی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی بڵاوی کردۆتەوە، ئاماژەیەکی بۆ پسپۆڕی نەکردووە. لەم بەیاننامەیەدا هاتووە:

"ئازادی، ئازایەتی، شۆڕشگێڕی، خەمخۆری دین و خاکی بوون و بەدەنگەوەچوونی کێشەو ئازارەکانی خەڵك لە تایبەتمەندییە گرنگەکانی ئەندام پەرلەمانی چاکە. هەروەها راشکاوی، حەقانیەت و تێگەیشتنی وردی دوژمنەکارییەکانی ئیستکباری جیهانی لە سیفەتەکانی دیکەی نوێنەرە باشەکانە"[109].

ئەم باڵە تەئکید لە رابردووی خەباتگێڕانە دەکاتەوە بۆچوونە ناو پەرلەمانەوە لە بەیاننامەی کۆمەڵەی رۆحانیەتی خەباتگێڕی تاراندا هاتووە: "کورسیەکانی (پەرلەمان).. دەبێ هی کەسانی مەزهەبی، نیشتمانی، شۆڕشگێڕ، ئازاو خاوەن رابردوو و خاوەن ئەزموون بێ و.. ئەوانەی تازە هاتوونەتە مەیدانەوەو ئەو کەسانەی کە ئازاری شۆڕشیان نەچێشتووەو دوورەپەرێز بوون، رێگەیان پێ نادرێ بچنە ناو ئەنجومەنی شورای ئیسلامی پیرۆزەوە"[110]

کۆمەڵەی مامۆستایانی حەوزەی عیلمیەی قوم یش کە لە رووی بۆچوونی سیاسی، ئابووری و فەرهەنگییەوە لەم باڵەوە نزیکە لە بەیاننامەیەکدا نووسیوویەتی: "ئەندامانی پەرلەمان دەبێ لەو شارەزایانە هەڵبژێردرێن کە باوەڕیان بە ئاین هەیە وەکو فیکری زاڵ بەسەر تەواوی مەیدانەکانی ژیانی فەرهەنگی، ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و تاکەکەسیدا، بەم شێوەیە عەهدو پەیمان و پسپۆڕی دوو کۆڵەکەی بنچینەیی پێکهێنەری ناسنامەی نوێنەرە بەرێزەکانی پەرلەمانن. بەرنامە دارشتن و یاسادانانی گونجاو لەگەڵ ئەمەدا دەبێت تەنها بەدەستی شارەزایانی خاوەن بەڵێن و باوەڕ بە ئاین ئەنجام بدرێت (کە) یەکەم

---

[108] ماهنامه صبح، شماره ٤٢، ٧٤/١١/١٠، ص٨.

[109] بيانيه جامعه روحانيت مبارز تهران، ٧٤/١١/١٠.

[110] روزنامه اطلاعات، ٧٤/١٢/١٠، ص٢.

باوەڕیان بە کاملّی سیستمی ئاینی هەبێ لە تەواوی کاروبارەکانداو دووەم/ هەمیشە لەبەرنامەداڕشتنی‌دا بەکردەوە ملکەچی ئەو باوەڕەبن.. پاراستنی هەویەی (ئیسلامی نیزام) بەشێك دەبێ لە ئامادەبوونی هەمیشەیی روحانیانی ئیسلام ناس و شارەزایانی فەقیە لە بواری یاسادانان و جێبەجێ کردنی‌دا. بۆیە بوونی ئەم پسپۆڕانەی ئاین لە ئەنجومەنی شورای ئیسلامی‌دا لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجە بەرزەکانی شۆڕشی ئیسلامی‌دا زۆر پێویست. هەڵبەتە لەم بارەیەوە لەگەڵ پسپۆڕی‌دا واتە شارەزایی لە ئاین و ئاین ناسی‌دا نابێ لە بەدەست هێنانی عەهدو پەیمانیش غافڵ بین.. کەنارگیری زانایانی ئاینی بەبیانووی ئەوەی کە ئەمڕۆ پەرلەمان پێویستی بە پسپۆڕ و شارەزا هەیە، خیانەت بووە لە ئامانجە پیرۆزە کانی شۆڕشی ئیسلامی و جگە لە دورکەوتنەوە لە بەها بنچینەییەکانی ئیسلام ئەنجامێکی دیکەی نی‌یە"[111]

## ب-بۆچوونەکان لە سیاسەتی دەرەوەدا:

### ١-پرانسیپەکانی سیاسەتی دەرەوە:

بەپێی قسەی محەممەد جواد لاریجانی ئەم باڵە لە سیاسەتی دەرەوەدا باوەڕی بە سیاسەتی لیبراڵی هەیە:

"کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ.. لە سیاسەتی دەرەوەدا لیبراڵ و کراوەن"[112] کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تارانیش لە بەیاننامەیەکدا رایگەیاند: "پەیوەندی بەرامبەرو سودبەخش مان لەگەڵ هەموو وڵاتەکانی جیهاندا دەبێت، ئەگەر لە هەڵوێستی دەسەڵات خوازی دا نەبن"[113].

هەروەها محەممەد جواد لاریجانی تەئکید لە رەفتاری میانڕەوی لە سیاسەتی دەرەکی‌دا دەکاتەوەو دەڵێت: "کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دەبێ رەفتارێکی هەبێ کە ئەوانی تر بتوانن تەحەمولی بکەن، بە ئێمەشەوە بەهەمان شێوەش کە کەسانی دی دەبێ بتوانن تەحەمولی ئێمە بکەن. ئەم فیکرە بەشێوەیەکی گشتی بنەمای سیاسەتی دەرەوەی ئێمەیە"[114].

---

[111] ماهنامه صبح، شماره ٤٧، ٧٤/١٢/١٥، ص٤،

[112] روزنامه اخبار٣/١٠/٧٤.

[113] روزنامه رسالت، ٧٤/٨/٩، ص٢.

[114] ماهنامه صبح، شماره ٣٨، ٧٤/١٠/١٢، ص٤.

## ٢- پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا:

ئەم باڵە هەر جۆرە پەیوەندییەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەمریکادا رەت دەکاتەوە. کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ لە بوڵتنی خۆیدا رەخنە لەو کەسانە دەگرێ کە هەوڵ دەدەن دەرگای گفتوگۆی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ لەگەڵ ئەمریکادا بکەنەوە[١١٥]. باوەڕی وایە کە "ئەمریکا دوژمنی ژمارە یەکی شۆڕشی ئیسلامییەو دەستبەرداری "پیلان" نابێ لە دژی کۆماری ئیسلامی.

لەم رووەوە لە بەیاننامەکەی خۆیدا رایدەگەیەنێ کە "خەتی ئیمام، خەتی گفتوگۆو سازش نییە لەگەڵ ئەمریکادا، بەڵکو یەکەم دوژمنی شۆڕشی ئیسلامی بە ئیستکباری جیهانی و لەسەرو ئەویشەوە بە ئەمریکای تاوانبار دەزانێت و باوەڕی وایە کە ئەمریکا یەك ساتیش دەست لە ئاگرخۆشکردن و پیلانگێڕی لە دژی نیزامی پیرۆزی ئێران هەڵناگرێ"[١١٦].

بڵاوکراوەی "شما"ش بۆ پەیوەندی کردن بە ئەمریکاوە چەند مەرجێك باس دەکات. ئەم بڵاوکراوەیە لەم بارەیەوە دەنووسێت: "ئەگەر لە ئەمریکا سیاسەتمەداران هاتبنەوە سەر عەقڵ و بیانەوێ عاقڵانە رەفتار بکەن دەبێ ئەوە نیشان بدەن کە دەشێ متمانە بە قسەکانیان بکرێ، یەکەم داراییەکانی ئێران (پارە بلۆك کراوە کان) -هەرچۆنێك بێ- تەسلیم بکەنەوە، پاشان ئەو یاسایانە پوچەڵ بکەنەوە کە لەگەڵ پرانسیپەکانی پەیوەندی نێودەوڵەتیدا ناکۆکن و بەراشکاوی بڵێن کە دەست لە کاروباری ناوخۆی وڵاتان وەرنادەن و رێز لە مافی رەوای موسڵمانان دەگرن و.. ئەگەر ئەمە رووی‌دا، ئەوسا دەکرێ مەسەلەکە بخرێتە ژێر لێکۆڵینەوەوە"[١١٧]

---

[١١٥] ویژەنامە انتخابات جامعه روحانیت مبارز تهران، ٧٥/١/٢٤، ص٣٦.

[١١٦] ویژەنامە انتخابات جامعه روحانیت مبارز تهران/ ٧٥/١/٢٤، ص ٣٢.

[١١٧] هفتەنامە شما، شمارە ٧، ٧٦/١/٢١، ص٤

## کورتەی بۆچوونە سیاسیەکانی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێرو ڕێکخراوە هاوئاراستەکانی

١-بەرای ئەم باڵە خەڵك لە هەڵبژاردنی وەلی فەقیهدا دەوریان نی یە. خبرگان وەلی فەقیە دەدۆزنەوە. هەڵبژاردنی وەلی لەلایەن خواوەیە.

٢-وەلی فەقیە لە سەرووی یاساوەیە.

٣-شەرعیەتی تەواوی دام و دەزگاکانی کۆمەڵ لە وەلی فەقیهەوە سەرچاوە دەگرێ.

٤-لە جیاتی سیستمی دامەزراو لەسەر بنەمای جمهوری پێشنیازی حکومەتی عەدلی ئیسلامی دەکەن.

٥-کاروبارەکانی کۆمەڵ دەبێ لە دەستی روحانیەکاندا بێت.

٦-لە چوارچێوەیەکی دیاری کراودا چالاکی حزبیان قبوڵە.

٧-ئەم باڵە بۆچونێکی رەهای هەیە، خۆی بە ئسوڵی و باڵەکانی دیکە بە نائسوڵیو لادەر لە ڕێگەی راست دەزانێت.

٨-بەرای ئەم باڵە روحانیەکان نابێ رەخنەیان لێ بگیرێ، روحانیەکان نابێ جوابی خەڵك بدەنەوە.

٩-هێندە باوەڕیان بە بەشداریی خەڵك نی یە لە چوارچێوەی دام و دەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا.

١٠-پشتیوانی لە ناردنە دەرەوەی شۆڕش دەکەن.

١١-عەهدو پەیمان دەخەنە پێش پسپۆریەوە.

١٢-باڵی کۆمەڵەی روحانیەت لە رووی سیاسەتی دەرەکیەوە باوەڕی بە سیاسەتی لیبراڵی هەیە.

١٣-پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکادا رەت دەکاتەوە.

### ٢-٢-بۆچوونە ئابوورییەکانی باڵی کۆمەڵەی رۆحانیەتی خەباتگێرو ڕێکخراوە هاوئاراستەکانی

-تایبەتی کردن:

ئەم باڵە پشتیوانی لە تایبەتی کردنی یەکەکانی بەرهەم هێنان دەکات. محەممەد جواد لاریجانی دەربارەی ئەم مەسەلەیە گوتوویەتی:

"لە نیزامی ئێمەدا نموونە ئەوەیە کە زیاتر (٨٠٪)ی کاروبارەکان بەشێوەی ئەهلی بێت.. لە فیکری ئیسلامی‌دا ئەگەر بەوە قایل نەبین کە موڵکایەتی دەوڵەت ناهێڵێ، بەلای کەمەوە ناتوانین ئەو جۆرە موڵکایەتیە (دەوڵەتیەی) لێ هەڵبهێنجین.. دەبێ دەوڵەت بەرەبەرە بەڕێوەبردنی کاروبارەکان بەخەڵك.. واتە بە بەشی تایبەتی بسپێرێ‌و خۆی چاودێری و ڕێنمایی لە ئەستۆ بگرێ"[118] محەممەد ڕەزا باهونەریش لە چاوپێکەوتنێکدا گوتوویەتی "ئێمە سیاسەتی چاکردنمان قبوڵەو پشتگیری لێ دەکەین"[119].

(سەید ڕەزای تەقوا)ش گوتەبێژی کۆمەڵەی ڕۆحانیەتی خەباتگێڕ لە دیدارێکدا پشتگیری لە تایبەتی‌کردن کردووەو دەڵێت "ئێمە باوەڕمان بەوە نی‌یە کە هەموو کارەکان لای دەوڵەت کەڵەکە بین و دەوڵەت هەموو کارەکان ئەنجام بدات. لەبەرئەوە دەبێ خەڵك بێنینە مەیدانی کارکردنەوەو بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ ئەو ڕێوشوێنانەدا کە دەستوورو بەرنامە دەست نیشانی دەکات بەرەو تایبەتی کردن، هەنگاو هەڵگرین"[120].

محەممەد جواد لاریجانی لە گفتوگۆیەکدا تەئکیدی کردەوە کە ئەگەر عەلی ئەکبەر ناتقی نوری لە هەڵبژاردنەکانی سەرکۆماردا سەرکەوتن بەدەست بێنێ، کەرتی تایبەتی پەرەدەسێنێ. "لە حاڵەتێکدا کە ناتقی نوری لە هەڵبژاردنەکانی سەرکۆماردا سەرکەوتوو بێت، هێمنی سەرمایەگوزاری زیاد دەکات.. دامەزراندنی کۆمپانیای تایبەتی هان دەدات. دەوڵەت لە چالاکی دارایی و ئابووری دەکێشێتەوە دواوەو بچووکی دەکاتەوە. تایبەتی کردن، بوارێکە کە ناتقی نوری بەنیازە لە ڕەفسنجانی زیاتر پەرەی پێبدات.. بانکی مەرکەزی سەربەخۆیی زیاتری دەبێت"[121].

---

[118] روزنامه کاروکارگر، ٧٥/٨/٢٣.

[119] ماهنامه صبح، شماره ٦٥، ص٧٥.

[120] همان، شماره ٤٥، ٧٤/١٢/١، ص١٤.

[121] خبرگزاری رویتر، ٧٥/١/٢٤.

هەروەها لاریجانی لە چاوپێکەوتنێکی دیکەدا تەئکیدی لە قبوڵکردنی ئابووری لەسەر کەرتی تایبەتی بنیات نراو کردۆتەوە لەلایەن ئەم باڵەوەو دەڵێت "باڵی زۆرینەی (پەرلەمان).. لە رووی بەرنامەوە، لە پەرەپێداندا، لایەنگری سەرسەختی تیوری چاکردنەو ئەمەمان وەکو بنەمای بیری ئابووری قبوڵ کردووە.. روحانیەتی خەباتگێڕ لە ئابووریدا مەیلێکی سەرەکی لە کەرتی تایبەتییە"[122] کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕیش لە بەیاننامە تایبەتیەکەی خۆیدا "بە دەوڵەتی کردنی کاروبارەکانی بە نەخۆشیەکی کوشندە بۆ ئابووری"[123] وەسف کردووە.

## ٢-گەشەکردنی پەرەپێدانی ئابووری:

ئەم باڵە گرنگی بۆ بەهاکان دادەنێت و پێی وایە: پەرەسەندن و گەشەکردنی ئابووری نابێ لەگەڵ بەهاکاندا بکەوێتە ناکۆکیەوەو دووەم دادپەروەری کۆمەلایەتی لەپێش پەرەسەندنەوەیە. ئایەتوڵلا مەهدەوی کنی لەم بارەیەوە دەڵێت "دادپەروەری کۆمەلایەتی لە پێش پەرەسەندنەوەیەو پەرەسەندن بەشێکە لێی. واتە دەبێ پەرەسەندن بکرێ بە ئامانجی بلاوکردنەوەی دادپەروەری کۆمەلایەتی. کەواتە پێشکەوتنی هەر پلەیەك لە سیستمی ئیسلامیدا لەگەڵ دادپەروەریدایەو دەبێ پەرەسەندن وەکو وەسیلەیەك قسەی لەسەر بکرێ... لە نموونەی پەرەسەندندا، یەکەم دادپەروەری کۆمەلایەتی لە بەرنامەی کاردایە. پارێزگاری لە ئامانجەکان و لە خەڵك بەتایبەتی تەئمین کردنی خەڵکی بێبەش و چەوساوە لە بەرنامەی کاردایە"[124].

**کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تارانیش لە بەیاننامەیەکدا لەگەڵ تەئکید کردنەوە لەم بابەتە دەنووسێ:**

"دادپەروەری کۆمەلایەتی ئامانجی گەشەکردنەو گەشەکردن پێشەکی دادپەروەری کۆمەلایەتیە. ئاوەدان کردنەوەو گەشەکردنی واقیعی بەبێ بەدی هاتنی دادپەروەری کۆمەلایەتی تەنها سەرابێکە.. لە مەسەلەی گەشەکردن دا دەوڵەت دەبێ چاوی لە

---

[122] روزنامه اخبار، ٧٤/١٠/٣٠.

[123] ویژەنامه جامعه روحانیت مبارز تهران به مناسبت انتخابات دوره پنجم مجلس شورای اسلامی ٧٥/١/٢٤.

[124] ویژەنامه روزنامه رسالت، ٧٤/١١/١٩، ص٥.

بێبەش و چەوساوەکانەوە بێت. دەبێ نموونەی گەشەکردنی ئیسلامی بەمەبەستی گەیشتن بە گەشەکردنێك شان بەشانی دادپەروەری کۆمەڵایەتی بەرنامەی بۆ دابڕێژرێ"[125] هەروەها ئەم کۆمەڵەیە لە بەیاننامەیەکی دیکەدا تەئکیدی لە ریفۆرم کردۆتەوە لەگەڵ پارێزگاری لە بەها ئاینی و شۆڕشگێڕییەکانداو رایدەگەیەنێ: "پەرلەمان دەبێ پشتیوانی بێچەندو چون لە رەوتی ریفۆرم بکات و لە هەمان کاتدا بەها دینی و شۆڕشگێڕیەکان و فەرهەنگی گەلیش بپارێزێ. سەرمایە سالاری و فەرمانڕەوایی پارە یەکێکە لەو مەترسیانەی کە هەمیشە هەڕەشە لەو کۆمەڵگایانە دەکات کە لە مالی گەشەکردندان. بۆیە ئەم پەرلەمانەیە کە دەبێ بە هوشیاری تەواوەوە.. نەیەڵێ بەهاکانی شۆڕش لەبەر تیشکی گەشەکردندا کاڵ ببنەوە"[126].

(موحسینی یەحیەوی) نوێنەری کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تاران لە ئەنجومەنی شورای ئیسلامیش لە لێدوانێکدا تەئکیدی کردۆتەوە کە گەشەکردن بەبێ دادپەروەری قابیلی قبوڵ نییە، هەتا ئەگەر پێویست بێ رەوتی گەشەکردنیش خاوبکرێتەوە، یەحیەوی دەڵێت "ئێمە ناتوانین بەبێ دادپەروەری کۆمەڵایەتی ناتوانین گەشەکردن قبوڵ بکەین. ئەگەر بڕیار بێ کە بەدی هێنانی گەشەکردن لە ماوەی ٣ خولی پێنج ساڵەدا لەگەڵ قوربانیدا ئەنجام بدرێ، ئێمە دژی دەوەستینەوە. ئەگەر پەرەسەندن لە ٨ خولدا بەدی بێت بەلام یارانی شۆڕش تێدا نەبنە قوربانی ئێمە ئەوەمان پێ باشترە لەوەی (کە پەرەسەندن لە ماوەی کورتدا بێ و قوربانی تیا بدرێ)"[127] کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تارانیش لە بەیاننامەی تایبەتی خۆیدا تەئکیدی کردۆتەوە کە "رەسەنی دادپەروەری کۆمەڵایەتی پێویست بەوە دەکات کە خێرایی گەشەکردن و پەرەسەندن لەگەڵ توانای خەڵکدا رێك بخرێ بەتایبەتی لەگەڵ توانای توێژە بێبەش و چەوساوەو هەتا ناوەندەکانیشدا"[128].

[125] بیانیه جامعه روحانیت مبارز تهران، ٧٤/١١/١٩.

[126] بیانیه جامعه روحانیت مبارز تهران ٧٤/١١/١٠.

[127] روزنامه رسالت، ٧٤/١٠/٢، ص ١٢.

[128] ویژەنامه جامعه روحانیت مبارز تهران به مناسبت انتخابات دوره پنجم مجلس شورای اسلامی، ص٣٢.

### ٣- نموونەی ئابووری:

بە گشتی ئەم باڵە لەگەڵ میحوەریەتی بازرگانیدا پێشنیازی نموونەی پەرەسەندن دەکات. محەممەد رەزا باهونەر لە چاوپێکەوتنێکدا سەبارەت بەم مەسەلەیە بەم شێوەیە رای خۆی دەردەبڕێ:

".. من زۆر ئومێدم بەوە نیە کە لە کاتێکدا پیشەسازی یان کشتوکاڵی ئێمە، وەڵامی خەرجیەکانی وڵات بداتەوە، بەڵام باوەڕم وایە کە لە بەشی ترانزێت و بازرگانی نێودەوڵەتیدا توانایەکی باشمان هەیەو دەتوانین ببینە پردی پەیوەندی زۆربەی وڵاتان)[129]

رۆژنامەی (رسالت)یش لە تەئکیدکردنی هەمان بۆچووندا دەنووسێت: دەبێ یاسای بازرگانی بنەماو چاودێرو مەیدانی هەموو مەسەلە ئابوورییەکانی وڵات بێ)[130]

### ٤-کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی:

ئەم باڵە بەکەڵك وەرگرتن لە کەناڵی دەرەکی بۆ سەرمایەگوزاری لە کاروباری ئابووریدا رازیەو پشتگیری لێدەکات. عەلی ئەکبەر ناتقی نوری لەم بارەیەوە دەڵێت:

"بەهیچ جۆرێك ئێران بە سیاسەتی دەرگا داخستن قایل نیە لە ئابووریداو بە ژەهرێکی کوشندەی دەزانێت بۆ وڵات.. سەرمایەگوزارانی ناوخۆو دەرەوە بۆ سەرمایە گوزاری لە ئێراندا لە کەرتەکانی وزە، گاز، نەوت، پیتروکیمیایی، کانزاو فلزەکان، گواستنەوەو گەیاندن، گەشت و گوزارو پیشەسازییەکانی گۆڕیندا، ڕێگەیان لێنەگیراوە"[131].

**کورتەی بۆچوونە ئابووریەکانی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕو ڕێکخراوە هاوئاراستەکانی.**

١-تایبەتی کردنی یەکەکانی بەرهەم هێنان.

٢-پشتیوانی لە سیاسەتی ریفۆرمی ئابووری.

٣-ناکۆك نەبوونی پەرەسەندنی ئابووری لەگەڵ بەهاکاندا.

٤-دادپەروەری کۆمەڵایەتی دەخەنە پێش پەرەسەندنەوە.

---

[129] ماهنامە صبح، شمارە ٦٦، بهمن ٧٥.

[130] روزنامە رسالت، ٧٦/١٢/١٧.

[131] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ١، ٧٣/٧/٢٧.

٥-ستراتیجی پیشەسازی پەسەندی ئەم باڵە بەدیل دانانە بۆ هاوردە.

٦-بە میحوەر دانانی بازرگانی وەکو نموونەی پەرەسەندن.

٧-کەڵك وەرگرتن لە کەناڵی دەرەکی.

## ٢-٣-بۆچوونە فەرهەنگیەکانی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕو ڕێکخراوە هاوئاراستەکانی.

### ١-ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی:

ئەم باڵە لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی تەقلیدی لە ئاین دەڕوانێ، ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی رەت کردۆتەوەو بە مەترسییەکی دەزانێ بۆ فەرهەنگی ئاینی کۆمەڵ: "کۆمەڵەی کارگەرانی ئیسلامی" لە ڕێکخراوە هاو ئاراستەکانی کۆمەڵەی روحانیەتی تاران لە بەیاننامەیەکدا نارەزایی خۆی بۆ ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی ئاوا دەردەبڕێ "ئێمە دەبێ نموونەی فەرهەنگی خۆمان لەسەر بنەمای بەها ئاینییەکان بنیات بنێین، نەك لەسەر ئەو فیکرەی کە دەیەوێ نموونە ئەورووپییەکان وەکو ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی دەرخواردی میللەت"[١٣٢] بدات.

### ٢-کۆنترۆڵکردنی چالاکیە فەرهەنگیەگان:

ئەم باڵە پشتگیری لە کۆنترۆڵی دەوڵەت دەکات بەسەر چالاکیە فەرهەنگیەکان داو باوەڕی وایە دەبێ بەم شێوەیە لە رووی ئەخلاقیەوە کۆمەڵ لە نە خۆشی بپارێزرێ.

بەم پێیە ئەم باڵە پشتگیری لە سیاسەتی سانسۆر دەکات بەر لە بڵاوکردنەوەی بەرهەمە رۆشنبیرییەکان. کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تاران لە بەیاننامەی تایبەتی خۆیدا تەئکیدی لە (کۆکردنەوەی ئانتێنەکانی سەتەلایت) کردۆتەوە.

لەو بایەننامەیەدا هاتووە: "کاتێك باس لە پێویستی کۆکردنەوەی ئانتێنەکانی سەتەلایت وەکو یەکێك لە کەناڵەکانی دزەکردن و هێرشی فەرهەنگی دوژمن دەکرێت (لیبراڵەکان) نەك تەنها پشتگیری لەمە ناکەن بەڵکو دژیشیدەوەستنەوە"[١٣٣].

---

[١٣٢] مجلس پنجم و مواضع ما، جامعه اسلامی کارگران، ص٢٧.

[١٣٣] ویژەنامە جامعه روحانیت مبارز تهران به مناسبت انتخابات دوره پنجم مجلس شورای اسلامی، ص٢٢.

هەروەها ئەم باڵە باوەڕی وایە کە دەوڵەت دەبێ جڵەوگیری لەو چالاکیانە بکات کە بە تێکدەر دەست نیشان کراون. کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ لە بۆڵتنەکەی خۆیدا دەنووسێت: "یەکێك لە ئامرازەکانی دوژمن لە هێرشی فەرهەنگیدا کە دەیتوانی زەمینە بۆ سەرکەوتنی هێرش و دزەکردنی فەرهەنگی دوژمن خۆش بکات، سەتەلایت بوو کە خۆرئاوا وەکو کەناڵی دزەکردنی فەرهەنگی خۆی بۆ ناو فەزای خاوێنی خێزانەکان بەکاری دەهێنا کە لە سایەی خواوە لەگەڵ هەنگاوی بێ چەندوچوونی ئەندامانی پەرلەمان، بەکارهێنانی سەتەلایت قەدەغەکرا.. دەتوانین ئەم هەنگاوەی پەرلەمان وەکو هەنگاوی پاراستنی ئەخلاقی کۆمەڵ باس بکەین"[١٣٤]

عەلی ئەکبەری ناتقی نوریش لە لێدوانێکدا لەم بارەیەوە دەڵێت:

"پەسەندکردنی بەرنامەی قەدەغەکردنی بەکارهێنانی سەتەلایت یەکێکە لە هەنگاوە بایەخدارەکانی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی (پەرلەمان)"[١٣٥]

باڵی ناوبراو لە درێژەی سیاسەتەکانی کۆنترۆڵی چالاکیە فەرهەنگیەکاندا، پشتیوانی لە سانسۆری دەوڵەت دەکات لەسەر مامۆستایانی زانکۆو ناوەرۆکی دەرسەکانیان. عەلی ئەکبەر ناتقی نوری لەم بارەیەوە دەڵێت: "لە مەسەلەی زانکۆکاندا.. دەبێ هەم بەڕێوەبەرێتی زانکۆکان چاودێری بکرێن و هەم مامۆستاکانی زانکۆ چاویان لەسەر بێت. هەروەها بێگومان دەبێ تەئکید لە ناوەرۆکی دەرسەکانیش بکرێتەوە. لە ناوەرۆکی هەندێ لە دەرسەکاندا چەند مەسەلەیەك هەن کە نە لەگەڵ ئیسلام و نە لەگەڵ بەهاکانی ئێمەدا نایەنەوە. لەم بارەیەوە دەبێ حەوزە یارمەتیمان بدات"[١٣٦] کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تارانیش لە بەیاننامەیەکدا دەنووسێت: "ئەوەی کە لە ئیسلامی بوونی زانکۆکاندا دەبێ زۆرترین بایەخی پێ بدرێ، بەدیهێنانی گۆڕانی ئیسلامییە لە فەرهەنگی زانکۆکان و بواری زانستی لێکۆڵینەوەو ناوەرۆکی وانەکان بەتایبەتی لە زانستە مرۆییەکاندا"[١٣٧].

---

[١٣٤] همان، ص٢٨.

[١٣٥] روزنامه اطلاعات، ٧٤/٩/٢٣، ص٢.

[١٣٦] ماهنامه صبح شماره ٦٤، آذر ٧٥.

[١٣٧] روزنامه اطلاعات، ٧٥/٩/٢٦.

### ٣-سیاسەتی فەرهەنگی:

سیاسەتی فەرهەنگی باڵی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ سیاسەتێکی تەقلیدیی‌یە بەپێی قسەی محەممەد جواد لاریجانی: "کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تاران.. لە مەسەلەی فەرهەنگدا مۆڵەت بە ئارەزوویەکی بەهێزی تەقلیدی دەدات"[138].

ئارەزووی تەقلیدی ئەم باڵە بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەمانە دژی ئەو دامەزراوە فەرهەنگیانە بوەستنەوە کە لە دەرەوەی دەسەڵاتی روحانیەتەوە کاردەکەن. ئایەتوڵڵا رەزا ئوستادی ئەندامی کۆمەڵەی مامۆستایانی حەوزەی عیلمیەی قوم لەم بارەیەوە دەڵێت: "دەزگا فەرهەنگیەکان بەناوە جیاوازەکانیانەوە ئایا بە راستی کاری مزگەوتەکان دەکەن؟ کەسێ وای بۆ دەچێت لە مەڵبەندێکی لەو جۆرەدا بەناوی فەرهەنگ سەرا لاوان بەشێوەیەکی ئیسلامیانە پەروەردە بکرێن"[139]. هەروەها ئایەتوڵڵا رەزا لە جێگایەکی دیکەدا دەڵێت: "لە تاران خانمێك وەکو سەرۆکی شارەوانی یەکێ لە ناوچەکان بێبەش دەبێ.. ئایا ئێمە، لە هەل و مەرجێکداین کە ژنێك وەکو سەرۆکی شارەوانی هەڵبژێردرێ؟ سەرەڕای ئەمەش هەل و مەرجی نێودەوڵەتی و سەنگەرگرتن لە کۆماری ئیسلامی بەشێوەیەکە کە ئەگەر کەسێك دژی ئەو مەسەلەیە بێ، بیانیەکان وەکو دژایەتی کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ مافی ژنان لێکی دەدەنەوە"[140].

ئایەتوڵڵا مەهدەوی کنی یش لەگەڵ دژایەتی چالاکی مەڵبەندە فەرهەنگیەکاندا، خوازیاری بەڕێوەبردنی ئەم مەڵبەندانەیە لەلایەن رۆحانیەکان و ئەو بەڕێوەبەرانەوە کە ئەوان پەسەندی دەکەن. مەهدەوی لەم بارەیەوە رایدەگەیەنێ: "ئاشکرا نی‌یە ئەو کەسانەی کە مەڵبەندە فەرهەنگیەکان دروست دەکەن یان بەڕێوەی دەبەن، نیازیان خودایی بێت و بەپێی رێبازی ئیسلام و بەها ئیسلامیەکان بجوڵێنەوە. نابێ دەست بەرداری ئەمانە بین. لەهەر جێگایەکدا کە کتێبخانەیەك یان مەڵبەندێکی فەرهەنگی

---

[138] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ٣١، ٧٤/١٠/٦، ص ٧ بە نقل از روزنامە اخبار.

[139] سخنرانی در روز ٧٦/٣/١٦.

[140] روزنامە کاروکارگر، ٧٥/١٢/٢١، ص٢.

دروست دەکرێت دەبێ لەژێر چاودێری ئیمامی دادپەروەرو بەڕێوەبەرانی دڵسۆزدا بن و پەیوەندی راستەقینەیان لەگەڵ مزگەوتدا هەبێت"[141] لە هەمان بواردا محەممەد رەزای باهونەریش دەڵێت: "ئێمە لە دیدگای فەرهەنگیەوە رادیکاڵین، هەتا ئێستا هیچ کەسێ (لە بواری فەرهەنگی) بەوە تاوانباری نەکردوین کە لیبراڵین"[142]

## ٤-بایەخدان بە رووکەش:

پاراستنی رووکەش لەو مەسەلانەیە کە لای ئەم باڵە تەئکیدی لێ دەکرێتەوە. حیجەتول ئیسلام (عبدوس) ئەندامی شورای مەرکەزی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕ دەڵێت: "سەبارەت بە دروست کردنی خانوو هەندێ جار نموونە شەرعیەکان لەبەرچاو ناگیرێ کە هەندێ لەم مەسەلەیە لە ئەستۆی وەزارەتی (مەسکەن) و شارەوانیەکانە کە نموونە ئیسلامیەکان بسەپێنن.. کاڵ بوونەوەی مەسەلەی حیجاب و نموونە وەرگرتن لە پۆشاکدا، تێکەڵاوی کۆڕو کۆمەڵی جۆراوجۆر لە هەندێ ناوەندو دەزگاکانی راگەیاندندا کە لە کۆتاییدا کۆمەڵ بەرەو پووچی و بێ ناسنامەیی دەبات"[143].

ئایەتوڵڵا ئیبراهیمی ئەمینی لە کۆمەڵەی مامۆستایانی حەوزەی عیلمیەی قوم سەبارەت بە ئیسلامی کردنی زانکۆکان رایگەیاند: "لە بە ئیسلامی کردنی زانکۆکاندا مامۆستاکان رۆڵێکی گرنگیان لە ئەستۆدایە. لە هەڵبژاردنی مامۆستاکاندا رەچاوکردنی ئەم مەسەلانەی خوارەوە بە پێویست دەزانین:

باوەڕ بە بەها ئیسلامیەکان، ملکەچی بۆ ئەنجامدانی ئەرکە ئاینیەکان و وازهێنان لە قەدەغەکراوەکان، قەناعەت بە سیستەمی ئیسلامی و ویلایەتی فەقیه، زانیاری تەواو دەربارەی ئیسلام، حەزکردن بە بڵاوکردنەوەی ئیسلام و بایەخدان بە شتی باش و رەوشتی باش.. زمان شیرین و شیك پۆشی لەگەڵ رەچاوکردنی مەسەلەی ئیسلامدا، باوەڕ بەوەی کە ئیسلام لە زانستە مرۆییەکان و مەسەلەکانی ژیان تیوری وای هەیە

---

[141] ماهنامه صبح، شماره ٣٢، ٧٤/٨/٣٠، ص٣.

[142] همان، شماره ٦٦، بهمن ٧٥.

[143] ویژەنامه جامعه روحانیت مبارز تهران به مناسبت انتخابات دوره پنجم مجلس شورای اسلامی، ص٧.

کە دەکرێ کەڵکی لێ وەربگیرێ. (هەروەها) لە هەڵبژاردنی خوێندکاراندا پێویستە ڕەوشت باشی و پابەندی بەکردەوە بۆ بنەماو بەها ئیسلامیەکان، لانەدانی فیکری، قبوڵکردنی حکومەتی ئیسلامی و ویلایەتی فەقیە لەلایەن داواکارانەوە، لە ڕێگەی شارەزایانی جێی متمانەوە پەسەند بکرێ.. بۆ بەهێزکردنی بنەمای فیکری ئایینی، ئەخلاقی، کۆمەڵایەتی، سیاسی خوێندکاران ئەم ڕاسپاردانەی خوارەوە دەکەین:

ئەلف: خوێندنی ژیاننامەی پێغەمبەرو ئیمامەکان (د.خ).

ب: هەدیەکردنی کتێبی ئاینی، ئەخلاقی، سیاسی گونجاو بەخوێندکاران.

ج: ئەنجامدانی مێزگردو سیمیناری زانستی و سیاسی و وەڵامدانەوەی کێشەی خوێندکاران لە بۆنە جیاوازەکاندا بە ئامادەبوونی ئوستادو زانایانی پەیماندارو چاکەکارو پەسەندو دامەزراندنی کلاسی سەرنج ڕاکێش و بەسود.

د: بەپێی تواناو بەرەبەرە دەبێ کولیژی کوڕان و کچان جیابکرێنەوە، بەتایبەتی کۆلیژەکانی پزیشکی و ئەگەر لە توانادا نەبوو دەبێ خوێندکارانی کوڕو کچ جیابکرێنەوە. بەپێی توانا هەوڵ بدرێ لە دەرس وتنەوەی کلاسی کچاندا مامۆستای ژن بەکاربێ و لە دەرس وتنەوەی کلاسی کوڕانیشدا مامۆستای پیاو بەکاربێ.

هـ: جیاکردنەوەی تاقیگەکانی کچان و کوڕان و بەتایبەتی تاقیکردنەوەکانی زانستی پزیشکی و ڕەچاوکردنی تەواوی مەسەلە ئیسلامیەکان، پێشنیاز دەکرێ.

هەر بەپێی بۆچوونی (ئەمینی) بۆ زیاتر ئیسلامی بوونی کەش و هەوای گشتی زانکۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە پێشنیاز دەکرێ:

١-نوێژی جەماعەت بەشێوەیەکی ڕێك و پێك ئەنجام بدرێ.

٢-ئوستاد و بەرپرسانی زانکۆش ئامادەبن.

٣-بانگ بە بڵندگۆ لەسەر ئاستی زانکۆ پەخش بکرێ.

٤-دەرسی ئوستادەکان بەشێوەیەك ڕێك بخرێ کە بەر لەکاتی نوێژکردن تەواوبێ.

٥-لە هەڵواسینی تابلۆی جوان کە ئایەت و حەدیسی گونجاوی لەسەر بنووسرێ، سیفە ت و کارە چاکەکان و بەها ئیسلامیەکان ستایش بکرێن و سەرزەنشتی کارو ڕەوشتی ناپەسەند بکرێ.

٦-فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە لەسەر ئاستی گشتی زانکۆ و لە ڕێگەی هەموو کەسێکەوە جێبەجێ بکرێ.

٧-بە خانمان ڕابگەیەنرێ کە حیجابی ئیسلامی بپۆشن و ڕێگە لە چوونە ناوەوەی ئەو خانمانە بۆ ناو زانکۆ بگیرێ کە حیجابەکەیان باش نییە.

٨-داوا لە زانایانی ئاینی خاوەن تەقوا و بەڕێز بکرێ کە ناوەناوە سەردانی زانکۆ بکەن و بچنە ناو مامۆستاو خوێندکارانی زانکۆوە.

٩-پێکهێنانی کۆڕو کۆبوونەوەی دوعای (کمیل) لە شەوانی هەینی و مەراسیمە ئاینییەکانی دیکەدا"[144].

## کورتەی بۆچوونە فەرهەنگییەکانی
## کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕی تاران و ڕێکخراوە هاو ئاراستەکانی

١-ڕەت کردنەوەی ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی.

٢-باوەڕ بە بوونی هێرشی فەرهەنگی.

٣-پشتگیری لە کۆنترۆڵی دەوڵەت بەسەر چالاکیە فەرهەنگیەکانەوە.

٤-پشتگیری لە سیاسەتی سانسۆر بەسەر بەرهەمە فەرهەنگیەکانەوە بەر لە بڵاوکردنەوەیان.

٥-پشتگیری لە (سیاسەتی قەدەغەکردن) لە سیاسەتی فەرهەنگیدا.

٦-لایەنگیری لە (ئارەزووی تەقلیدی) لە سیاسەتی فەرهەنگیدا.

٧-ئەنجام دانی چالاکی فەرهەنگی (ڕۆشنبیری) لەژێر چاودێری روحانیەکاندا.

٨-پاراستنی رووکەش بەپێی بۆچوونە پەسەندەکانی ئەم باڵە تەئکیدی لێ دەکرێتەوە.

---

[144] ماهنامه یالثارات الحسین، شماره ۳۲، ۷۵/۸/۳، ص۷.

## هەڵوێستە سیاسی و ئابووری و فەرهەنگیەکانی باڵی ئەنجومەنی روحانیە خەباتگێڕەکان و گروپە نزیکەکانی

### ١-٢-بۆچوونە سیاسیەکانی باڵی ئەنجومەنی رۆحانیە خەباتگێڕەکان و گروپە نزیکەکانی.

ئەلف: تێڕوانینیان سەبارەت بە حکومەت.

### ١-ویلایەتی فەقیهو رابەری:

ئەم باڵە دەسەڵاتەکانی وەلی فەقیە لە سنووری دەستووردا دەبینێت و باوەڕی وایە کە وەلی فەقیە دەبێت لە چوارچێوەی دەستووردا رەفتار بکات. بەهزادی نەبەوی کە یەکێکە لە رابەرانی رێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێران لەم بارەیەوە دەڵێت: "ویلایەتی رەها لە چوارچێوەی دیاریکراوی رەهادا دەبێت. چونکە ئەگەر بە پێچەوانەی ئەمەوە بێ، لە بنەڕەتدا نەدەبوو لە دەستووردا دابنرێ"[١٤٥].

بڵاوکراوەی (عصرما) ئۆرگانی رێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێرانیش بەمەبەستی ئاراستەکردنی ئەم بۆچوونە دەنووسێت: "یەکەم ویلایەتی رەها زاراوەیەکە کە لایەنی بابەتی هەیە نەك زاتی، بەو مەعنایەی کە دەوڵەتی ئیسلامی بە گشتی مافی دەستوەردان و دەسکاری کردنی هەموو بابەتەکانی حکومەتی هەیە دووەم بەڵام لە جێگای خۆیدا ناتوانێت ئەم دەسەڵاتە رەهایە بەرێگر بزانین لە بەردەم دابەشکردنی لوجیکیانەی ئەرکەکانی فەرمان رەوایی لەنێوان هێزە جیاوازەکاندا. سێیەم بوونی دەسەڵاتی رەها تایبەت نییە بە حکومەتی ئیسلامی و پێویستی هەر جۆرە وڵاتێك بەتایبەتی لە حاڵی حازردا، ئەوەیە کە ئیرادەیەك نەبێ لە سەروو ئیرادەی فەرمان رەوایی میللیەوە. لە هەمان کاتدا لە هیچ وڵاتێکدا کە بە مەعنای سیاسی پەرەی سەندبێ، دەسەڵاتی رەهای حکومەت، بە مەعنای دەرچوون لە دەستورو لە یاسالادانی کاروبارەکان لێك نەدراوەتەوە. هیچ کەسێك بەڵگەیەکی

---

[١٤٥] روزنامە کیهان، ٧٥/١٠/٤، ص٢.

نەخستۆتە روو سەبارەت بەوەی کە پێویستە هەموو دەسەڵاتەکان لە دەستی یەك کەسدا بن. چوارەم ئیمام خومەینی کە خۆی ئەندازیاری ئەم تیورە بوو، هەرگیز کارێکی وای نەکرد کە هەموو دەسەڵاتە حکومیەکان بۆ خۆی پاوان بکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە تەئکیدێکی زۆری لەوە دەکردەوە کە رێڕەوێکی رەوای جێگیرو یاسایی بۆ بەکارهێنانی دەسەڵاتەکانی حکومەتی ئیسلامی لەبەرچاو بگیرێ. (بەم پێیە).. ویلایەتی رەهای فەقیە بەمەعنای حکومەتی رەهای تاکەکەسی نی‌یە"[146]

ئەم بڵاوکراوەیە لە جێگایەکی دیکەدا بۆ سەلماندنی بۆچوونی خۆی سەبارەت بە سنووورداری دەسەڵاتەکانی وەلی فەقیە بەو پێیەی کە لە دەستووردا هاتووە، نووسیوویەتی: "بە پشت بەستن بە مادەی ۱۷۷ی دەستوور.. رابەری ناتوانێت پرانسیپ و ئامانج و بەهاکانی ئیسلام رەت بکاتەوە. چونکە فیقهو فەقاهەت و ویلایەتی فەقیە دەبێ قبوڵیان بکات. پاراستنی سەربەخۆیی و یەکپارچەیی خاکی وڵات بەندە بە دەسەڵاتی رابەرییەوە. رابەری ناتوانێت بۆ نموونە یەکێتی نیشتمانیی ئێران هەڵبوەشێنێتەوە چەند بەشێك یان هەموو خاکی وڵات بخاتە سەر قەڵەمڕەوی وڵاتێکی دیکە.

ناتوانرێ بە پشت بەستن بە رەهایی دەسەڵاتەکانی رابەری، جمهوریەتی نیزام لە کار بخرێ، ماوەی (۱۰۰)ی دەستوور لە دەسەڵات و ئەرکەکانی رابەری کۆڵیوەتەوەو لە (۱۱) خاڵدا جێی کردۆتەوە.. مەعنای نی‌یە کە یاسادانەرێ بەدەسەڵاتی رەهای کەسێ قایل بێ پاشانیش بێت و دەسەڵاتەکانی بژمێرێ. مادەی ۱۷۷ راشکاوی تیایە کە (پەسەندکراوەکانی ئەنجومەنی چاوپێداخشانەوەی دەستوور لەدوای تەئیدکردن و ئیمزای مەقامی رابەری دەبێ لە رێگەی گەڕانەوەوە بۆ رای گشتی لە لایەن زۆرینەی رەهای بەشدارانی راپرسی‌یەوە پەسەند بکرێ". ئەمە بەو مەعنایەیە کە ئیمزای مەقامی رابەری بەتەنها ناتوانێت ببێتە هۆی بەدەست هێنانی توانای یاسایی و ئەم ئیمزایە هەتا لەلایەن رای گشتیەوە پەسەند نەکرێ، بەهای یاسایی نابێت. مادەی (۵۷) کە ئاماژە بۆ رەهایی ویلایەت دەکات ئەوە نیشان دەدات کە ئەو رەهایی‌یە لە چوارچێوەی دیسپلین و رێوشوێنی یاسادا مەرجی بۆ دانراوە. لەم

---

[146] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ٦١، ۷۵/۱۰/۱۹، ص٥.

مادەیەدا هاتووە "هێزە دەسەڵاتدارەکان لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا بریتین لە دەسەڵاتی یاسادانان، دەسەڵاتی جێبەجێکردن و دەسەڵاتی داوەری کە لە ژێر چاودێری ویلایەتی رەهای ئەمر و ئیمامەتدا بەپێی مادەکانی دوایی ئەم یاسایە کاردەکەن ئەم دەسەڵاتانە سەربەخۆن لە یەکتری" ئەوە بەدی دەکرێ کە سیانەیی دەسەڵات و سەربەخۆیی و جیاکردنەوەیان لە یەکتری رێرەوی پەسەند کراوی کارکردنی ویلایەتن و رەهایی ویلایەت ناتوانێ دەست لە کاروباریان وەربدات و یان لەجیاتی جیایی و سەربەخۆییان تێکەڵیان بکات. لەمانەش گرنگتر ناوەڕۆکی مادەی (٥٦)ە کە دەڵێت: "فەرمان رەوایی رەها بەسەر جیهان و مرۆڤدا لەلایەن خواوەیەو هەر خواش مرۆڤی کردووە بە حاکمی چارەنووسی کۆمەڵایەتی خۆی. هیچ کەسێ ناتوانێ ئەو مافە خوداییەیە لە مرۆڤ زەوت بکات، یان بیخاتە خزمەتی بەرژەوەندی کەسێك یان گروپێکی تایبەتیەوە و میللەت ئەم مافەی کە خودا پێی داوە لە مادەکانی دواییدا، بەکاردێنێت".تێبینی دەکرێ کە مافی دیاری کردنی چارەنووس لەم مادەیەدا بۆ هەموو هاووڵاتیان بە رەسمی دانی پێدانراوە و هاوڵاتیان ئەم مافە لە رێگەی مادەکانی دەستوورەوە پیادە دەکەن. بۆیە هەر جۆرە رێوشوێنێك کە مادەی ئەم مافەو رۆشن کردنەوەی بەتاڵ بکاتەوە ئەو پەیمانە بەتاڵ دەکاتەوە کە لە نێوان کۆمەڵ و دەوڵەتدا دەبەسترێ. بەپێی ئەو سەرنجانەی سەرەوە ئەوەی کە سنووری دەسەڵاتەکانی حکومەت (و) رابەری لە رووی ناوەرۆکەوە لە سیستەمی کۆماری ئیسلامیدا بە مەرجەوە گرێ دەدات، بەرژەوەندی نیزامە، کە بەپێی پێناسە بەکات و شوێنەوە بەندەو لە ئیرادەی گەلەوە هەڵدەقوڵێ. هەروەها لە رووی یاسایی و شکڵییەوە مادەکانی دەستوور بڕیاری لەسەر چوارچێوەیەك داوە بۆ بەکارهێنانی ئەم دەسەڵاتانە"[١٤٧].

محەممەد سەلامەتی سەرۆکی رێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێرانیش لە چاوپێکەوتنێکدا تەئکیدی لە سنووورداری دەسەڵاتەکانی وەلی فەقیە کردۆتەوە و دەڵێت: "لە بنچینەدا لە کۆمەڵگای ئێمەدا بڕیار نییە وەلی فەقیە لە جیاتی هەموان بیربکاتەوەو لە بوارە جیاوازەکانی رێگەچارە دەست نیشان بکات.

[١٤٧] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ٦٢، ٧٤/١١/٣، ص ٧٢٤.

بیرکردنەوەیەکی لەو جۆرە وا دەکات کە دەزگا یاساییەکان (حکومی و ناحکومی) هەرگیز چالاك نەبن، چونکە لە حاڵەتی چالاك بوونیاندا مەیدانەکە لەبەردەم فەقیهدا تەسك دەکەنەوە"[148].

ئەم باڵە باوەڕی وایە کە لەسەردەمی غیابدا دەبێ وەلی فەقیە لەلایەن خەڵکەوە هەڵبژێردرابێ. بڵاوکراوەی (عصرما) لەم بارەیەوە دەنووسێ:

"باڵی چەپ باوەڕی بە ویلایەتی فەقیهی هەڵبژێردراو هەیە و بنەمای حکومەتی ئیسلامی بە ڕاو هەڵبژاردنی خەڵك دەزانێت. بەپێی ئەم بۆچوونە لەسەردەمی غیابدا دەستی خودا لە قۆڵی کراسی خەڵکەوە دێتە دەرەوە"[149].

ئەسەدوڵڵای بەیات ئەندامی شورای مەرکەزی ئەنجومەنی روحانیە خەباتگێڕەکان گوتویەتی: "کاتێك کارەکانی ویلایەتی فەقیە ڕاست و ڕەوا دەبێت کە خەڵك ویلایەتەکەی ئەویان قبوڵ کردبێ"[150].

بڵاوکراوەی "عصرما"ش لەو تاریکدا تەئکیدی لە هەڵبژاردنی وەلی فەقیە کردۆتەوە لەلایەن خەڵکەوەو دەنووسێت: "بەپێی هەردوو مادەی (٥٦) و (٥٧)ی دەستوور فەقیهەکان وەکو نوێنەری گشتی ئیمامی سەردەم (عج) ڕابەری ئومەت لە ئەستۆ دەگرن. لەم حاڵەتەدا ئەگەر (خبرگان)ی ئومەت بەگشتی دەنگ (یان زۆرینەی دەنگ) کەسێکیان بۆ ئەو پلەیە هەڵبژارد، ویلایەت و ئەمانەتی مەعصومیان پێ سپارد.. دەوری خەڵك ئەوەیە کە لەنێو "خبرگان"دا دەست بە هەڵبژاردن دەکەن، واتە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ وەلی فەقیە هەڵدەبژێرن. بەم شێوەیەش شەرعیەتی سیاسی بەدەست دێت. شەرعیەتی سیاسی و گوێڕایەڵی ڕەزامەندانە پەیوەندی تەواوی بە حەق پەروەردەی نیزامی کۆماری ئیسلامیەوە هەیەو ناتوانرێ بە بانگەشەی نوێنەرایەتی ئیمامی بێ گوناهەوە (د.خ) بەبێ ئەوەی ڕەزامەندی خەڵکی لەگەڵدا بێت، دەست بە دامەزراندنی حکومەت بکرێ"[151].

---

[148] همان شماره ١، ٧٣/٧/٢٧، ص٣.

[149] همان، شماره ١٣، ٧٤/١/٣٠، ص٢.

[150] روزنامه همشهری ٧٥/١٠/٩.

[151] دوهفته نامه عصرما، شماره ٦٤، ٧٥/١٢/١.

ئەم باڵە باوەڕی وایە کە کۆماری ئیسلامی لە سێ کۆڵەکەی: کۆماریی، ئیسلامیو ئێرانی بوون پێکهاتووەو دەبێ ئەم سێ بنەمایە بپارێزرێن. بڵاوکراوەی (عصرما) لەم بارەیەوە دەنووسێت "کۆماری ئیسلامی ئێران لە سێ کۆڵەکەی کۆماریی، ئیسلامی و ئێرانی بوون پێك (هاتووە).. ئێمە هەموو هەوڵی خۆمان لە پێناوی پارێزگاری ئەم بنەمایانەدا دەخەینە گەڕو باوەڕمان وایە بایەخ نەدان بە هەریەکێ لەم سێ بنەمایەو سست بوونی هەریەکێ لەم سێ کۆڵەکەیە، لە جیاتی ئەو سیستەمەی کە خەڵکی مسوڵمانی ئێران لەکاتی شۆڕشی پڕجۆش و خرۆشی خۆیاندا هاواریان کرد، سیستمێکی دیکەیان بەسەردا دەسەپێنێ"[152].

باڵی روحانیە خەباتگێڕەکان و گروپە نزیکەکانی تەئکید لە جەمهوریەت و ئیسلامیەتی نیزام دەکەنەوە. بڵاوکراوەی (عصرما) لە باسکردنی ئەم دوو بنەمایەدا دەنووسێت: "ئیسلامیەتی نیزام.. لە جەمهوریەتی نیزامەوە سەری هەڵداوە. بەو مەعنایەی کە خەڵك چارەنووسی کۆمەڵایەتی خۆیان وا دیاری کردووەو بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارە جیاوازەکانی کۆمەڵ سیستمی ئیسلامیان هەڵبژاردووە. سیستمی کۆماری ئیسلامی. کۆماریە چونکە بەشداری خەڵك لە دیاری کردنی چارەنووسی خۆیدا لە دەستووردا بە رەسمی دانی پێدا نراوە. و ئیسلامییە لەبەرئەوەی رەنگدانەوەی ئیرادەی خەڵك ئەو مسوڵمانییەیە کە ویستیان بەها و ئامانج و رێگە ئیسلامیەکانی لە پەیوەندی نێوان خۆیاندا سەقامگیر بکەن"[153].

رۆژنامەی (سلام) کە لەرووی هەڵوێستەوە لە ئەنجومەنی روحانیە خەباتگێڕەکانەوە نزیکە، دوورکەوتنەوەی لە رای خەڵك وەکو (دورکەوتنەوە لە ئەسڵی ئیسلام) وەسف کرد. ئەم رۆژنامەیە لەم بارەیەوە دەنووسێت "ئەگەر رۆژێك بەبیانووی دابین کردنی ئیسلامیەتی نیزامەوە هەل و مەرجێ بێتە ئاراوە بۆ ئەوەی (رای خەڵك) لە دیاری کردنی مەسەلەکاندا گورزی بەربکەوێ و بەهای پێویست لە

---

[152] دوهفتەنامە، شمارە ٤، ٧٣/٩/٩.

[153] همان، شمارە ١٢، ٧٤/١/١٦، ص١.

دەست بدات لە نەریت و رۆشنبیری سیاسی وڵاتدا بێ دودڵی دەبێ ئەم دیاردەیە بە مەعنای دوورکەوتنەوە لە بنچینەی ئیسلام لێك بدرێتەوە)[١٥٤].

عەباس عەبدیش کە لە کاربەدەستانی رۆژنامەی (سلام)ە لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەدا تەئکید لە بنچینەیی بوونی رای خەڵك دەکاتەوەو دەڵێت: "هەتا ئەگەر خەڵك بەپێچەوانەی بەرژەوەندی کۆمەڵگەشەوە دەنگ بدەن، گۆڕینی ئەو دەنگە لە رێگەی فرت و فێڵەوە، دەردێك دەرمان ناکات. ئەوەی کە خودا دەفەرموێت: "خودا چارەنووسی هیچ نەتەوەیەك ناگۆڕێ، مەگەر ئەو نەتەوەیە خۆیان بگۆڕن، لەو راستیەوە سەرچاوە دەگرێ کە بە دەستکاری کردنی رای خەڵك (هەتا ئەگەر ئەو رایە پێچەوانەی بەرژەوەندی کۆمەڵیش بێ) ناتوانرێ کۆمەڵ چاك بکرێ، خەڵك خۆیان دەبێ بەرپرسیارێتی کارەکانی خۆیان لە ئەستۆ بگرن"[١٥٥].

هاشم ئاغاجری کە یەکێکە لە ئەندامانی شورای مەرکەزی (دفتر تحکیم وحدت) تەئکیدی لە پەیوەندی دوو سەرەی نێوان حکومەت و خەڵك کردۆتەوەو دەڵێت: "پەیوەندی حکومەت و کۆمەڵ و مەسەلەی ماف لە سیستمێکی سیاسیدا مەسەلەیەکی دووسەرەو دولایەنەیە. ئەگەر مەسەلەی ماف یەك مەسەلەی یەك سەرەبێ و لایەنێك لەسەر حەق بێ و لایەنەکەی دیکە تەنها جێبەجێکردنی فەرمانی لەسەربێ، ئەمە جگە لەزاتی پیرۆزی خودا بۆ کەسێکی دیکە نییە"[١٥٦] مەکتەبی سەقامگیرکردنی یەکێتی (دفتر تحکیم وحدت)یش لە بەیاننامەیەکدا تەئکیدی لە جەمهوریەتی نیزام کردۆتەوە. لەم بەیاننامەیەدا "سەبارەت بە نفوزی رەوتێکی سیاسی و بیرکردنەوەی توێژێك کە دەیەوێ گورز لە پرانسیپی ئازادی و جەمهوریەتی نیزام بسرەوێنێ" تەحزیری داوە[١٥٧].

هەروەها رێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە پرۆگرامی خۆیدا لەگەڵ تەئکیدکردنەوەدا لە رۆڵی خەڵك لە حکومەتی ئیسلامی ئاوای نووسیووە: "لە سەردەمی غیابدا وەلی سەردەمی (عج) کاروباری حکومەت بە کۆمەڵی ئیسلامی

---

[١٥٤] روزنامه سلام، ٧٥/١١/٧.

[١٥٥] همان، ٧٦/١/١٧، ص٩.

[١٥٦] هفتەنامه مبین/ شماره ٢٦٤، ٧٥/١٠/١٥، ص٣.

[١٥٧] بیانیه شماره ٢، دفتر تحکیم وحدت.

سپێردراوه. له ڕاستی‌دا توانای حکومه‌تی ئیسلامی له سه‌رده‌می غیابدا له کۆمه‌ڵه‌وه سه‌رچاوه ده‌گرێت"[158] بڵاوکراوه‌ی (عصرما)ی ئۆرگانی مجاهیدیشنیش له‌م باره‌یه‌وه ده‌نووسێت: "ئه‌گه‌ر نیزام کۆماری نه‌بێ، ئیسلامیش نابێت و هه‌ر هه‌وڵێك بۆ لابردنی کۆماریی نیزام.. هه‌نگاوێکی کۆنه‌په‌رستانه‌یه‌و دژی شۆڕشه"[159] به‌رای ئه‌م باڵه، شوراو هه‌ڵبژاردن و په‌رله‌مان له ئامرازه‌کانی حکومه‌تی ئیسلامین له‌سه‌رده‌می غیابدا. بڵاوکراوه‌ی (عصرما) له‌م باره‌یه‌وه ده‌نووسێت: "له سه‌رده‌می غیابدا، مافی فه‌رمانڕه‌وایی و دیاری کردنی چاره‌نووسی خۆیان به خه‌ڵك سپێردراوه بۆ ئه‌وه‌ی له ڕێگه‌ی په‌یمان تازه‌کردنه‌وه‌وه به‌شێوه‌ی جیاواز شورا و هه‌ڵبژاردن و په‌رله‌مان پێك بێنن و که‌سێك یان گروپێك بۆ کاروباری حکومه‌ت هه‌ڵبژێرن. بێگومان ئه‌م هه‌ڵبژاردنانه له چوارچێوه‌ی چه‌ند پرانسیپێکدایه که ئیسلام وه‌کو ئاینێکی کۆمه‌ڵایه‌تی و خاوه‌نی حکومه‌ت بۆ فه‌رمان ڕه‌واو حکومه‌تی ئیسلامی ده‌ست نیشانی کردووه"[160] ئه‌م باڵه بوونی سه‌لاحیه‌ت به پێویست نازانێت بۆ حکومه‌ت کردن. بڵاوکراوه‌ی عصرما له‌م باره‌یه‌وه ده‌نووسێت:

(ئێمه شه‌رعیه‌ت و په‌سه‌ندکراوی (ئیسلامی و کۆماریی) به دوو پایه‌ی هاوشێوه ده‌زانین بۆ کۆماری ئیسلامی.. ئێمه پێمان وایه که ڕه‌وایی فه‌رمانڕه‌وایی کۆماری ئیسلامی له ده‌نگی خه‌ڵکه‌وه سه‌رچاوه ده‌گرێ‌و سه‌لاحیه‌ته‌کان به خوڵقێنه‌ری ئه‌رکی تاکه‌که‌سی ده‌زانین، به‌و مه‌عنایه‌ی که هیچ گروپێك ته‌نها له‌به‌ر بوونی سه‌لاحیه‌ت مافی ئه‌وه‌یان نی‌یه حوکمی کۆمه‌ڵ بکه‌ن، هه‌تا له لایه‌ن گه‌له‌وه قبوڵ نه‌کرێت"[161] ئه‌م باڵه ته‌ئکید له به‌رپرسیاری کاربه‌ده‌ستانی حکومه‌تی ئیسلامی له به‌رامبه‌ر خه‌ڵکدا ده‌کاته‌وه. له‌م پێناوه‌دا بڵاوکراوه‌ی (عصرما) به‌م شێوه‌یه ده‌نووسێت: "ئێمه.. کۆماری ئیسلامی وه‌کو کۆمپانیایه‌کی پشکداری ده‌بینین که هه‌ڵگری په‌یڕه‌وی ناوخۆی ئیسلامیه که هه‌ریه‌که له تاکه‌کانی کۆمه‌ڵ تیایدا به چاوپۆشی له سه‌رمایه‌ی مادی و مه‌عنه‌وی خۆیان له‌گه‌ڵ که‌سانی دیدا پشکی یه‌کسانیان هه‌یه‌و به‌هه‌مان

---

[158] اساسنامه و مرامنامه سازمان مجاهدین انقلاب اسلامی ایران، ص۹.

[159] دوهفته‌نامه عصرما، شماره ۶۷، ۷۶/۲/۳/ ص۲.

[160] همان، شماره ۱۳، ۷٤/۱/۳۰، ص۲.

[161] همان، شماره ۱۹، ۷٤/٤/۲۱/ ص٤.

ئەندازەش مۆڵەتی دەستوەردانیان دیاریکردنی لە چارەنووسی خۆیاندا هەیە، بەم پێیە بەڕێوەبەرانی کۆمپانیایەکی لەم جۆرە سەرەڕای بەرپرسیاری ئیلاهی، لە بەرامبەر خاوەن پشکەکانیشدا بەرپرسیارن"[162].

باڵی ئەنجومەنی روحانیە خەباتگێڕەکان و.. بینای سیاسی حکومەتی ئیسلامی لە هیچ قاڵبێکی تایبەتیدا نابینن و وای دەبینین کە بەپێی هەل و مەرجی رۆژگار قابیلی گۆڕانە. بڵاوکراوەی (عصرما) بۆ روون کردنەوەی بۆچوونەکانی ئەم باڵە دەنووسێت "بینای سیاسی حکومەتی ئیسلامی لە قاڵبی شێوەیەکی تایبەتیدا نییەو لەگەڵ پێویستیەکانی کات و کۆمەڵدا قابیلی گۆڕانە.. دەسەڵات و ئەرکی حاکم و حکومەتی ئیسلامی لەو ئەرك و دەسەڵاتانەیە کە حکومەتێك لەو لایەنەوە کە حکومەتی بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵە دەبێ خاوەنی بێت. ئەم باڵە باوەڕی بەجۆرێك لە خەڵك سالاری هەیە لە چوارچێوەی ئامانج و پێوەرە دینیەکانداو خەڵك بە سونگەی شەرعیەت و مافی فەرمانڕەوایی دەزانێت"[163].

## ٢-حزب:

ئەنجومەنی روحانیە خەباتگێڕەکان و گروپە نزیکەکانی تەئکید لە پێویستی چالاکی حزبە سیاسیەکان دەکەنەوە. بڵاوکراوەی (عصرما) لە روونکردنەوەی بۆچوونەکانی رێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا دەنووسێت: "لەم سەردەمەدا کە پرانسیپ لەسەر بەشداری خەڵك دامەزراوە، بوونی حزبی سیاسی نەك تەنها شتێکی ئاسایی بووە بەڵکو بە پێویستیش لە قەڵەم دەدرێ و نەبوونی لە هەر وڵاتێك سەرسوڕێنەرەو مایەی پرسیاریشە"[164]. ئەم بڵاوکراوەیە باوەڕی وایە کە چالاکی حزب لە وڵاتدا بەر لە جێگیربوونی رژێمی زۆردار دەگرێت.

"زیادبوونی چالاکی حزبی و رێکخراوەیی دەبێتە هۆی فراوان بوون و گەشەکردنی هوشیاری و وریایی خەڵك. لە کۆمەڵگایەکی هوشیارو گەشەکردودا کە ئازادی سیاسی و چالاکی حزبی بەشێوەی راست و لۆجیکی تاقیکردۆتەوە، ئەگەری

---

[162] همان.

[163] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ٧٤/١/١٣، ص٢.

[164] همان، شمارە ١، ٧٣/٧/٢٧، ص٣.

گەشەکردنی کەسانی هەلپەرست و دیماگۆگی و وابەستە کەمترەو ئەگەری بەدی هاتنی پیلان و دەسیسەی ئاشکراو نهێنی گەیشتۆتە کەمترین رادەو زەمینەیەك بۆ جێگیربوونی دیکتاتۆری نییە"[١٦٥].

مەهدی کەڕوبی سەرۆکی ئەنجومەنی روحانیە خەباتگێڕەکان پشتگیری لە لەدایك بوونی حزبە سیاسیەکان کردووە لە ولاتداو دەڵێت "لە دایك بوونی حزبە سیاسیەکان لە ژیانی سیاسی ولات دەبێتە هۆی بەهێزبوونی زیاتری پەرلەمان، جدی بوونی هەڵبژاردن، بیمەبوونی نیزام و خولقاندنی جۆش و خرۆش و چالاکی لەنێو خەڵکدا. حزبە بەهێزەکان وەکو سیستمێکی چاودێری لە بەرامبەر سەرهەڵدانی لادانیدا بە رێگرێکی گرنگ لە قەڵەم دراون و دەبنە هۆی خولقاندنی ململانێی ساغ و سەلیم"[١٦٦] کەڕوبی بەم شێوەیە لەسەر دەربڕینی بیروڕاکانی خۆی بەردەوام دەبێت "سیستمی ئێمە سستمێکی پەرلەمانییەو بە رای خەڵك فۆرمەڵە دەبێت . لە دە ستووریشدا بە راشکاوی مەسەلەی حزب لەبەرچاوگیراوە و ئێمە لەگەڵ ئیشکردنی حزبین بەشێوەیەکی واقیعیانە"[١٦٧].

رێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێران رەنگدانەوەی ناڕەزایی گروپی و رێکخستنی و خواستە گشتیەکان بەکاری حزبی لە قەڵەم دەدات و باوەڕی وایە: "یەکێ لە سەرەکیترین کارەکانی حزب و رۆژنامەگەری رەخنەگر، رێکخستنی خواستە گشتیەکان و عەکس کردنەوەی بەرژەوەندی و ناڕەزاییەکانی گروپە جیاوازە کۆمەڵایەتیەکانە لە دەزگا بڕیار بە دەستەکانی وەکو حکومەت و پەرلەماندا بە رێگەیەکی ئاشتی خوازانە لە کۆڕو کۆبوونەوەو بۆنەکانی تردا"[١٦٨].

### ٣-ئازادی:

ئەم باڵە ئازادی رادەربڕین بۆ ئەو کەسانەی کە نیزامیان قبوڵ کردووە، بە قابیلی پەسەندکردن دەزانێت. بلاوکراوەی (عصرما) لەم بارەیەوە دەنووسێت "بەڕای ئێمە..

---

[١٦٥] همان، شماره ٢٣، ٧٤/٦/١٥، ص٤.

[١٦٦] هفتەنامە صبح، شمارە ٣٦، ٧٤/٩/٢٨.

[١٦٧] روزنامە سلام، ٧٥/١٢/١.

[١٦٨] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ١٣، ٧٤/١/٣٠، ص٧.

ئـارامی سیاسـی، مانــەوەو زیـادبوونی شـەرعیەتی نـیزام و پاشـانیش پارێزگـاری لەسەربەخۆیی وڵات لـە پەسـەندکردنی مـافی رەخنـەگرتن و ئازادی رادەربڕینندایـە بـۆ هـەموو ئـەو کەسانەی کـە مـەبدەئی نیزامەکەو سـەروەری یاسـایان قبـوڵ کـردووە"[169] "ئازادی چالاکی سیاسی (بەهەرشێوەیەك بێ) لـە چوارچێوەی دەسـتووردا گرنگـترین دابینکەری مافەکانی مرۆڤ و ئازادی‌یە بنچینەییەکانە"[170].

ئەم باڵە ئازادی رادەربڕیـن (بە مـافێکی خوداییـی و سروشـتی) دەزانێـت نـەك بـە (ئیمتیازێك). (عصـرمـا) دەنووسێت "دەسـتوور ئـازادی رادەربڕیـن بـە مـافی هـەموو تاکەکانی کۆمـەڵ دەزانێت نەك بە ئیمتیـازێك کە لەلایەن دەوڵەتـەوە بـە کەسـێك یـان گروپێکی تایبەتی دەدرێت.. ئازادی رادەربڕین مافی خوداییـی و سروشـتی تاکەکانی کۆمەڵەو بە هیچ یاسایەکی دیکە ناتوانرێ بگۆڕدرێ بە ئیمتیاز"[171] هەروەها ئەم باڵە تـەئکید لـە پاراسـتنی مـافی نـەیارەکان دەکاتـەوە بڵاوکـراوەی (عصـرمـا) لـەم بارەیـەوە دەنووسێت "بە حوکمی ئازادی دەبێ هـەتا سـەبارەت بـە پاراسـتنی مـافی نـەیارانیش وەکـو مـاف و ئازادییـەکانی خۆمـان هەسـت بـە بەرپرسـیاریی بکـەین و هــەر جوڵانەوەیەکی پێچەوانەی یاسا لەم بارەیەوە مەحکوم بکەین"[172].

هــەروەها ئـەم بڵاوکراوەیـە جـەخت لەسـەر ئـەوە دەکـات کـە ئیسـلام لەگـەڵ دیموکراسـی‌دا نـاکۆك نـی‌یـە. "قوتابخانەیـەك کـە لـە گەلاڵەنامـەو نـاوەڕۆکی خـۆی‌دا بنەمای ئازادی قبوڵ کردووە، دەتوانێ وەکو میتۆدێك دیموکراسی پیادە بکات.

لــەم رووەوە دەتوانــین بگەینــە ئــەو بــاوەڕەی کــە فیکــری ئیســلامی لەگــەڵ دیموکراسـی‌دا لـە سـەرکەوتووترین میتـودی بـەڕێوەبردنی کاروبـاری وڵاتـە نـاکۆك نی‌یە"[173] ئەم بڵاوکراوەیە تەئکید لە ئازادی و مافی رەخنـەگرتن و چاودێری کردنـی کاربەدەسـتانی سیسـتمی کۆمـاری ئیسـلامی کردۆتـەوە و لـەم بارەیـەوە دەنووسـێت "ئازادی بە مەعنای نـەمانی کۆسپە لـە بەردەم بەکارهێنانی مافدا. هـەرکاتێ کۆسـپ نـەبێ ئـازادی هەیـەو لەگـەڵ جۆراوجـۆری و زۆربوونـی کۆسپەکاندا، ئازادی لـە قـاڵب

---

[169] هەمان، شمارە ٢، ٧٣/٨/١١، ص١٠.

[170] هەمان، شمارە ١١، ٧٣/١٢/١٧، ص٦.

[171] هەمان، شمارە ١٨، ٧٤/٤/٧، ص٦.

[172] هەمان، شمارە ٢٢، ٧٤/٦/١/ ص٨.

[173] هەمان، شمارە ٢٣، ٧٤/٦/١٥، ص٣.

دەدرێ. ئازادی.. کاتێك لە کۆمەڵگایەکدا دێتەدی کە توانای رەخنەگرتن لە سەرەکی ترین سیاسەت و بەرزترین ئاستەکانی دارشتن و جێبەجێکردن سیاسەت هەبێ.. بەرای ئێمە ئازادی و مافی رەخنەگرتن لە بەرزترین ئاستەکانی بریاردان و چاودێری کردنیان نەك تەنها نابێتە هۆی لاوازبوونی نیزام بەڵکو لە بنچینەدا تواناو سەقامگیری نیزام بەندە بە مەسەلەیەکی لەو جۆرەوە.. سیفەتی ئازادی بنەرەتی لە کۆمەڵێکدا، بریتی‌یە لەوەی کە کەمینەکان بتوانن مافی خۆیان بەکاربێنن و توانای چاودێری کردنی کاروکردەوەکانی کاربەدەستانیان هەبێ"[١٧٤] مەکتەبی سەقامگیرکردنی یەکێتی‌یش لە بەیاننامەیەکدا "ئازادی بە بەهرەی خودایی" لە قەڵەم دا[١٧٥].

لە روانگەی ئەم باڵەوە، ئازادی لە رێنماییەکانی ئیسلامدا رەگ و ریشەی هەیە. لەم بارەیەوە (عصرما) دەنووسێت "ئازادی بە گەوهەری بیری ئاینی نامۆ نی‌یە.. و زۆر لەو مافانەی کە لە جیهانی ئەمرۆ وەکو مافی بنەرەتی مرۆڤ دانیان پێدانراوە، لای ئیسلامیش پەسەند کراون.. لە بواری سیاسەت و کۆمەلایەتیش دا فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە بە مەعنای بانگهێشت کردنە بۆ کاروبارێك کە لە رووی عەقڵ و شەرعەوە شیاوەو ستایش کراوەو گەرانەوەیە لە کاروبارێك کە لە رووی عەقڵ و شەرعەوە نەشیاوەو زەم کراوە وەکو یەکێك لە بەشەکانی ئاین، بە ئەرکی کۆمەلایەتی‌و مافی هەمووان لە قەڵەم دراوە، هەڵبژاردنی بیروباوەرو ئاین بە زۆرەملێ نی‌یە. لە کۆمەڵگای ئیسلامی‌دا ئەوانەی باوەریان بە قوتابخانە و ئاینەکانی دیکە هەیە بە رەسمی دانیان پێدا نراوە. مەبەستمان لەوە نی‌یە کە هەموو ئەوەی کە لە جیهانی ئەمرۆدا وەکو ئازادی بۆ مرۆڤ بە رەسمی دانی پێدانراوە لەلایەن فیقهەوە پەسەندکراوەو تەواو دەسکەوتێکی ئیسلامی‌یە.. قسەی ئێمە لەسەر ئەوەیە کە گەوهەری ئازادی لە رێوشوێنەکانی ئیسلامدا هەیە"[١٧٦] لەگەڵ ئەوەشدا رێکخراوی مجاهیدینی شۆرشی ئیسلامی ئێران، قبوڵ کردنی بێ قەیدو شەرتی گەلاڵەنامەی جیهانی مافی مرۆڤ بە باش نازانێت پێی وایە "قبوڵ کردنی سەربەخۆو بێ قەیدو شەرتی گەلاڵە نامەی جیهانی مافی مرۆڤ لە بەرژەوەندی ئێمە (نی‌یە) باشترین

---

[١٧٤] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ١٢، ٧٤/١/١٦، ص٣.
[١٧٥] بیانیە دفتر تحکیم وحدت، ٧٤/٦/١٥.
[١٧٦] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ٢٣، ٧٤/٦/١٥، ص٣.

شێوە، داواکردنی ئەندامێتی‌یە لەگەڵ هێشتنەوەی مافی (تەحەفز) لە بەرامبەر هەندێ لە مادەکانی گەلاڵەنامەکەدا.

هەرچەندە پێمان وایە کە زیاتر (٩٠٪)ی مادەکانی گەلاڵەنامەکە لەگەڵ یاساکانی شەرع و دەستووری وڵاتەکەماندا ناکۆك نی‌یە"[١٧٧].

لە هەڵوێست و سەرەتاکانی بەرنامەی ڕێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێران دا تەئکید لە ئازادی رادەربڕین، پێکهێنانی کۆڕو کۆبوونەوە، حزب و ئەنجامدانی هەڵبژاردن و.. کراوەتەوە: "ڕێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێران ئازادی رادەربڕین، ئازادی کۆبوونەوە، پێکهێنانی حزب و ڕێکخراوی سیاسی، ئازادی هەڵبژاردن، ئازادی چاپەمەنی و راگەیاندن بە ئەرکی خۆی دەزانێت، ڕێکخراوی مجاهیدین پشتگیری لە هەموو ئەو حزب و ڕێکخراوانە دەکات کە وەفاداری خۆیان بۆ نیزامی کۆماری ئیسلامی راگەیاندووەو دەستووریان قبوڵ کردووەو ئیلتیزامی پێوە دەکەن.. هەموو هێزو بۆچوونەکان دەبێ لە مەیدانێکدا بواری خستنەرووی خۆیان بۆ کۆمەڵ هەبێ دیارە لە چوارچێوەی دەستووردا"[١٧٨] ئەم ڕێکخراوە تەئکیدی لە "پارێزگاری و قوڵ کردنەوەی ئازادی" لە حکومەتی ئیسلامی‌دا کردۆتەوە. بەم شێوەیە باس لەم بابەتە دەکات "ئەرکی حکومەتی ئیسلامی پارێزگاری و قوڵ کردنەوەی ئازادی‌یە نەك بەخشینی. بۆیە کۆمەڵگای ئیسلامی دەبێ شایستەی گرەنتی تەواوبێ بۆ بەدی‌هێنان و مانەوەی ئازادی و تاکەکانی کۆمەڵگای ئیسلامی دەبێ بواری بەشداری کاریگەریان لە دیاری کردنی چارەنووسی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی خۆیاندا هەبێت. هەروەها دەبێت گیان و بنەمای ئازادی لە تەواوی پەیوەندی و دەزگا فەرهەنگیی و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیەکاندا لەبەرچاو بگیرێ"[١٧٩].

بڵاوکراوەی (عصرما) لە روون کردنەوەی بۆچوونی ئەم باڵەدا دەنووسێت: "باڵی چەپ ئازادی و دیموکراسی بە تەنها وەکو ئایدیولوجیایەك تەماشا ناکات بەڵکو وەکو ڕێوشوێنێکی پێویست بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵ و جێگیری و پەرەسەندنی کۆمەڵ

---

[١٧٧] هەمان، شمارە ٦، ٧٢/١٠/٧، ص٧.

[١٧٨] دو هفتەنامە عصرما، شمارە ٤٢، ٧٥/١/٢٩، ص٧.

[١٧٩] مرامنامە سازمان مجاهدین انقلاب اسلامی ایران، ص١١.

تەماشای دەکات، هەروەها وەکو ئامرازێك بۆ نەهێشتنی ئەگەری سەرهەڵدانی دوژمنایەتی لێکی دەداتەوە.. ئەم رەوتە بیری ئازادی بە یەکێك لە دروشمە سەرەکییەکان و بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی دەزانێت و دابڕانی ئازادی و سەربەخۆیی وا لێك دەداتەوە کە کاری کردە نییە"[180] بەرای ئەم باڵە "فراوانکردنی ماف و ئازادی خەڵك یارمەتی بەردەوام بوونی نیزام دەدات" و بەو جۆرەی لە رەش نووسی بەڵگەنامەی هەڵوێستەکانی رێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا هاتووە. "شۆڕش و دەوڵەت ئەنجامی ئەو شۆڕشە، بە رێگە خۆشکردنی گونجاو بەرەو فراوانکردنی ماف و ئازادییەکانی خەڵك و هێزە سیاسیەکان و جوڵان بەرەو بە دامەزراوکردنی تواناکانی کۆمەڵ، بە توانایی خۆی دابین دەکات. شۆڕشی ئیسلامی تا چەند بتوانێ ئازادییە یاساییەکان پەرە پێبدات و بیان کات بە شتێکی دامەزراو، دەتوانێت هێندە ئومێدی بەتوانای خۆی هەبێت چ لە بواری جیهانی و لە بەرامبەر هێزە دەسەڵاتخوازەکانی دەرەوەو چ لە بواری بەرەوپێشەوەبردنی ئامانجەکانی خۆیدا لەناوخۆ"[181]

### ٤-بەشداریی سیاسی:

ئەم باڵە پشتگیری لە رێکخراوبوونی بەشداری خەڵك دەکات، بڵاوکراوەی (عصرما) لەم بارەیەوە دەنووسێت "رۆڵی خەڵك لە پارێزگاری کردنی شۆڕشدا تەنها لە کاتێکدا بەردەوام دەبێ و دەگاتە قوڵایی فراوان بوون و گەشەکردن کە لە قاڵبی دەزگای سیاسی و کۆمەڵایەتی رەگ و ریشەداردا، دابمەزرێ، یەکێتی قوڵ و پایەداری کۆمەڵایەتی تەنها لە سایەی پێکادانی فیکرەکان و گەشەکردنی هوشیاری و ئەنجامەکانی ئەمەدا، کاری کردەیە"[182].

ئەم بڵاوکراوەیە لە جێگایەکی دیکەدا دەنووسێت: "بەردەوام بوون و مانەوەی شۆڕش بەبێ بەشداری جەماوەر ئاسان و رەوان نابێ. جێگیرکردنی دامەزراوەکانی

---

[180] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ١٢، ٧٤/١/١٦، ص٢.

[181] همان، شمارە ٥٧، ٧٥/٨/٢٣، ص٢.

[182] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ٨، ٧٣/١١/٥، ص٢.

بەشـداری وەکـو سیسـتمی حزبـی و پەرلـەمانی و شـێوەکانی هـەڵبژاردن، میکانیزمەکانی بڕیاردان و تەنها گرەنتی دڵنیاکەرو لە شکان نەهاتووی هێشتنەوەی خەڵکن لە گۆڕەپانە جیاوازە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکاندا"[١٨٣].

ئەم باڵە بەشداریی سیاسی خەڵك بەوە نازانێت کە تەنها بریتی بێت لە بەشداری لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان و ری پێوانەکاندا. عصرما لەم بارەیەوە دەنووسێت "بە تەنها بوونی پەرلەمان و هەڵبژاردنی پەرلەمان یان بەشداری خەڵك لە ریٌپێوانەکاندا (بەشداری خەڵك)ی تێدا بەرجەستە نابێت. بەڵکو پێکهێنانی شوراکان لەسەر ئاستە جیاوازەکانی گوندوشار و پارێزگاو بەشداری خەڵك لە بڕیارەکاندا لە ڕێگەی هەڵبژێردراون و نوێنەرانی هەڵبژاردەی خۆیانەوە، هەروەها فەراهەم کردنی کەش و هەوای ئازادی پێکادانی فیکرەکانە کە یەکدەنگی نیشتمانی بەدی دێنێ"[١٨٤].

هەروەها ئەم باڵە بەشداری خەڵك بە "ماف" دەزانێت و بەوە ڕووبەڕووی بۆچوونەکەی کۆمەڵەی روحانیەتی خەباتگێڕو ڕێکخراوە هاوئاراستەکانی دەبێتە کە بەشداری خەڵك بە (ئەرك) لێك دەدەنەوە. "بەشداری لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتدا زیاتر لەوەی ئەرکێکی تاکەکەسی بێت، مافێکی کۆمەڵایەتیەو لە هەمان کاتدا مافێکی رەواشە. خەڵك کاتێك پێشوازی لە بەکارهێنانی ئەم مافە دەکەن کە یەکەم سەبارەت بە چارەنووسی خۆیان و نیزام هەمیشە هەست بە لێپرسراوی بکەن و دووەم ئامادەبوونو بەشداری خۆیان بەکاریگەرو ئەنجام بەخش ببینن"[١٨٥].

ڕێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێران چالاکی حزبی و دامەزراندنی ڕێکخراوە سیاسییەکان بە گرنگترین فاکتەر بۆ پێکهێنانی بەشداری گشتی لە قەڵەم دەدات. "دروست کردنی شوراکان لە گوندو گەڕەك تا بەرزترین ئاستی نیشتمانی و فەراهەم کردنی زەمینەی گونجاو بۆ چالاکی حزبی و دامەزراندنی ڕێکخراوی سیاسی، گرنگترین فاکتەری هاندانی خەڵکن بۆ بەکارهێنانی مافی خۆیان و

---

[١٨٣] همان، شماره ٩، ٧٣/١١/١٩، ص٣.

[١٨٤] همان، شماره ١٥، ٧٤/٢/٢٥، ص١.

[١٨٥] همان، شماره ٢، ٧٤/٥/٤، ص٧.

دامەزراوکردنی فەرهەنگی بەشداری گشتی"[186] بەڕای ئەم باڵە فەراهەم کردنی زەمینەی بەشداری سیاسی خەڵك یارمەتی مانەوەی نیزامیش دەدات. لەم ڕووەوە دەبینین لە ڕەش نووسی بەڵگەنامەی هەڵوێستەکانی ڕێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا هاتووە:

"نیزامی ئیسلامی لە ڕێگەی بەشداری هوشیارانەو ئازادانەی خەڵکەوە هەرچەندە پایەگای کۆمەڵایەتی خۆی لە قاڵبی ڕێکخراوی چۆنایەتی و سیاسی ئەواندا قوڵ بکاتەوەو پەرەی پێبدات، بەهەمان ڕادەش یارمەتی مانەوەی خۆی دەدات"[187].

بڵاوکراوەی (عصرما) بەشداری سیاسی بەبێ مەعناو نامەفهوم دەزانێت ئەگەر لە ڕێگەی دامەزراوی پایەدارو کاریگەرەوە نەبێت و تەئکید لە بەشداری هوشیارانەو هەمیشەیی خەڵك دەکاتەوە لە ڕێگەی جێگیرکردنی ئەو بەشدارییەوە لە ڕەوتی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی و حزب و شوراو ئەنجومەنە ئیسلامیەکانەوە[188].

### ٥-ئامانج داری:

ئەنجومەنی روحانیە خەباتگێڕەکان و.. بەشێوەیەکی گشتی ئەولەویەت بە ئامانج داری دەدەن و زیاتر لە کاروکردەوە بایەخی پێدەدەن. مەهدی کەڕوبی دەربارەی ئەم بابەتە دەڵێت "شان بە شانی بیناکردن ئێمە پێمان وایە ئەولەویەت لای ئامانجەکانی شۆڕشە.. تایبەتمەندییەکانی وەکو دژایەتی کفر، دادپەروەری کۆمەڵایەتی، پشتیوانی لە هەژاران، درێژەدان بە شەری هەژارو دەوڵەمەند، لایەنگیری بێ بەشەکان.. (لە ئەولەویەت)[189] دایە بڵاوکراوەی (مبین)یش دەنووسێت: "پاراستنی بەهاو ئامانجەکانی شۆڕش دیارترین مەسەلەیە کە نوێنەرانی پەرلەمان لە ڕەوتی کارەکاندا لە قسەو باسەوە بیگرە هەتا ئەو گەڵاڵەنامەو پلانانەی کە ئامادەو پەسەندی دەکەن دەبێ بە تەواوی سەرنجی بدەن و لێی وردببنەوە"[190].

---

[186] همان.

[187] همان، شماره ٥٧، ٧٥/٨/٢٣، ص٢.

[188] دو هفتەنامە عصرما، شمارە ١٢، ٧٤/١/١٦، ص٢.

[189] همان، شمارە ٦٦، ٧٦/١/٢٣، ص١٣.

[190] هفتە مبین، شمارە ٢٣١، ٧٥/٣/١٣، ص١.

### ٦-ناردنە دەرەوەی شۆڕش:

ئەم باڵە پشتگیری لە ناردنە دەرەوەی شۆڕش دەکات. ڕێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە ڕەش نووسی بەڵگەنامەی هەڵوێستەکانی خۆی‌دا بەم شێوەیە ئەم مەسەلەیە باس دەکات "بەرژەوەندی نیشتمانی.. ئێرانی ئیسلامی وا دەخوازێ کە بە یارمەتی‌دانی میللەتە چەوساوەکان و بەتایبەتی میللەتە مسوڵمانەکان بەرەو بەدەست هێنانی سەربەخۆیی و ئازادی، سنووری نفوزی ئیستکبارو ئیمپریالیزمی جیهانی لە قاڵب بدەین. سەربەخۆیی هەر وڵاتێك و ئازادی هەر میللەتێك وەکو شکاندنی یەکێك لە ئەڵقەکانی زنجیرەی دەسەڵاتی جیهانی وایە، جوڵەی ئێمە بەم ئاراستەیەدا جگە لەوەی کارکردنە بە یەکێك لە بنەماکانی باوەڕو بەهای ئیسلامی، گەشەکردنی کەش و هەوای ژیانی سەربەخۆو ئازادو سەقامگیرکردن و دابین کردنی بنەماکانی ئاسایش و بەرژەوەندی نیشتمانی خۆشمانی لەگەڵدا دەبێت"[191] ئەم ڕێکخراوە لە ئاشکراکردنی خاڵەکانی بەرنامەکانی خۆیدا بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە ڕایگەیاندووە کە پشتیوانی لە خەباتی هەموو میللەتان و جوڵانەوە ئیسلامی و جەماوەریەکان دەکات لە پێناوی بەدەست هێنانی سەربەخۆیی نیشتمانی و ئازادی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی‌دا"[192].

هەڵبەتە ئەم باڵە بایەخ بە نیشاندانی نموونەی ئێرانیش بەخەڵکی جیهان دەداتو بە فاکتەرێکی دەزانێت بۆ "گەشەکردنی بیری شۆڕشی ئیسلامی" لەم بارەیەوە لە ڕەش نووسی بەڵگەنامەی هەڵوێستەکانی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا هاتووە: "ناساندنی روخساری ڕۆشن و نیشاندانی نموونەیەك لە ئێرانی شۆڕشگێڕو ئیسلامی بە خەڵکی جیهان دەبێتە هۆی گەشەکردنی بیری شۆڕشی ئیسلامی و بەدەست هێنانی لایەنگران لەنێو میللەتان و دەوڵەتانداو کۆت کردنی دوژمنان لە هەنگاو هەڵگرتنی دوژمنانە. ئەم مەسەلەیە لەگەڵ ئەوەدا کە پایەگای ناوەوەی شۆڕش و نیزام مەحکەم دەکات و قوڵی دەکاتەوە، قەڵغانێکی ئەمنی ئەمین لە ڕای گشتی جیهاندا بە دەوری بوون و مانەوەی ئێرانی ئیسلامی‌دا دەکێشێت و ئیلهام

---

[191] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ٢٦، ٧٤/٧/٢٦، ص٦.

[192] همان شمارە ٣٤، ٧٤/١١/١١، ص٢.

بەخشی دەسکەوتە پێشکەوتووەکانی، دادپـەروەری خولقێنـەرو ئـازادیخواز دەبـێ لـەناو سـنوورە نیشـتمانیەکانی سەرانسـەری جیـهانداو کـاری دوژمنـان بەشـێوەی سیاسی و سەربازی لە دژی شۆڕش و نیزام دژوار دەکات"[193].

عەلی ئەکبـەر موحتەشـەمی ئـەندامی ئەنجومـەنی روحانیـە خـەباتگێڕەکانیش لـە وتوێژێکدا پشتیوانی لە ناردنە دەرەوەی شۆڕش دەکات و بە مەبدەئێکی مەحکەمی دەزانێت لە ئیسلامدا). موحتەشـەمی لـە باسکردنی بەڵگەکانی خۆیدا لـەم بارەیـەوە دەڵێـت: "لـە قورئـاندا گـەلێ ئایـەت هەیـە کـە دەڵێـت پێغەمبـەری مـەزن بـۆ هـەموو بەشەرییەت نێردراوەو شۆڕش و قوتابخانەکەی جیهانیـیە. بۆ نموونـە لـە ئایـەتێکدا دەڵێت "قل یا ایها الناس انی رسول الله علیکم جمیعاً" یـەعنی گوتارەکـەی روو لـە خەڵکە واتـە خـەڵك بەگشـتی لـە مسوڵمان و غـەیری مسـوڵمان هـەتا کافرەکـان چ لـەم نەوەیە بن و چ لە نەوەکانی داهاتوو. کەواتە بنچینـەی ئیسـلام تایبـەت نـیـیە بـە سـەر زەمینێکـی تایبـەتی یـان نەوەیـەکی تایبـەتی و جیهانـیـیـەو هـەموو مرۆڤـەکان دەگرێتەوە.. (هەروەها) هیچ وڵاتێك ئاسایشـی تـەواو لەسـەدا سـەد بەدەسـت ناهێنـێ مەگەر یان دوژمنـی نەبێ یان بە شێوەیەکی تەواو سەد دەرسەد دوژمنی لەناو بردبێو تارومـاری کردبێ یان بەلای کەمەوە رووبەرێکی فراوان لە رووبەری جوگرافیایی ئـەو وڵاتە لە هەموو روویەکەوە پاکسازی بکرێ و دوژمن هیچ جۆرە ئامادەبوونێکی نەبێو ئەمـەش نابـێ مەگـەر لەبـەر رۆشـنایی دامـەزراندنی رەگ و ریشـەکانی شـۆڕش لـە رووبەرێکدا کە بەقەد سـەرزەمینی مەزنی ئیسـلام فراوان بـێ لـە قوڵایـی ناوچـەی ژێـر قەڵـەمڕەوی دوژمنـداو ئەمـەش هـەمان پرانسـیپی ناردنـە دەرەوەی شـۆڕش و فراوانکردنی میحوەری ئیسلام و شۆڕشە"[194] مەکتەبی سەقامگیرکردنی یەکێتیش لە بەیاننامەیەکدا داوای "پاراستنی هەڵوێستی ئیسوڵی هێرش بەرانەو بەردەوام بوونـی ئەمەی کرد لە سیاسەتی دەرەوەدا"[195].

---

[193] دوهفتەنامە عصرما شمارە ٢٦، ٧٤/٧/٢٦، ص٦،

[194] هفتەنامە صبح، شمارە ١٧، ٧٤/٥/١٧، ص١٠.

[195] بیانیە دفتر تحکیم وحدت، شمارە ٧٤/٤/١.

## ب-سیاسەتی دەرەوە:

### ١-بنەماکانی سیاسەتی دەرەوە:

ئەم باڵە سەبارەت بە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان تێڕوانینێکی خراپی هەیەو دەتوانرێ بگوترێ کە باوەڕی بە (تیوری پیلان گێڕی) هەیە. لەم لایەنەوە دەبینین بڵاوکراوەی (عصرما) لە کاردانەوەیدا بۆ بڕیاری (کۆمەڵی گشتی) ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەربارەی چاودێری کردنی هەڵبژاردن لە وڵاتدا، ئەمریکای بە نەخشەداڕێژەرو ئەندازیاری سەرەکی پەسەندکردنی ئەم بڕیارە ناساندووەو دەنووسێت: "چەمکی سادەی بڕیارەکە، چاودێری نەتەوە یەکگرتووەکانە بەسەر هەڵبژاردنی وڵاتە جیاوازەکانەوەو ئەگەر بەشێوەیەکی ئیلزامی بێت، بە پێشێل کردنی ئاشکرای فەرمان ڕەوایی نیشتمانی وڵاتان دەژمێردرێ. ئەمریکا نەخشە داڕێژەرو ئەندازیاری سەرەکی پەسەندکردنی بڕیاری (ناوبراوە)"[١٩٦]. هەمان بڵاوکراوە لە جێگایەکی دیکەدا ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئۆرگانە وابەستەکانی وەکو "بەشێك لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا" وەسف کردووەو دەنووسێت: "لەگەڵ هەڵوەشانەوەی ئەو سیستمانەی بە (سوسیالستی) ناودەبران و تاکە سواریی ئیمپریالیزمی ئەمریکا لە گۆڕەپانی جیهانیدا، نەتەوە یەکگرتووەکان و دەزگاکانی سەر بەو بە کردەوە وەکو بەشێك لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کار دەکەن و ئەم وڵاتە، زۆر لە مەبەستەکانی خۆی بە ئالەتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەباتە پێشەوە"[١٩٧]. ڕێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە ڕەش نووسی هەڵوێستەکانی خۆیدا لەگەڵ ئاماژەدا بۆ ئەوەی کە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بووە بە (ئامرازی ڕەسمی بۆ شەرعیەتدان بە ئامانج و سیاسەتەکانی ئەمریکا" تەئکید لەو خاڵە دەکاتەوە کە "ڕێکخراوی کۆنفرانسی ئیسلامی، ئەکو و.. یش هەروەکو تەواوی کۆمەڵە نێودەوڵەتییەکان لە دەوڵەتە وابەستەکان و کاریگەریی ئیرادەی دەسەڵاتە ئیستکبارییەکان بەتایبەتی هی ئەمریکا پارێزراو نییە.

(بەم پێیە) ئەو ئامانجانەی کە ئێرانی ئیسلامی دەبێ لەم جۆرە ڕێکخراوو دەزگا نێودەوڵەتیە ئیسلامیانەدا بەدوایدا بچێت بریتین لە:

---

[١٩٦] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ٧، ٧٣/١٠/٢١، ص٨.

[١٩٧] همان شمارە ١١، ٧٣/١٢،١٧، ص٦.

ئەلف- پێکهێنانی بلۆکی دەوڵەتانی سەربەخۆی مسوڵمان لەناو ڕێکخراو و کۆمەڵەکاندا.

ب- هەوڵی بەرفراوان بەرەو کەمکردنەوەی وابەستەیی نەتەوەیی ئیسلام و وڵاتە مسوڵمانەکان بۆ ئەمریکاو هەموو هێزە خاوەن دەسەڵاتەکان.

ج-پێکهێنان و بەهێزکردنی هەڵوێستی دژی (سەهیونیستی) و ئیمپریالیستی لەناو ئەم ڕێکخراوو کۆمەڵانەدا.

د-پێکهێنانی ناوکی یەکەمین یەکێتی ئسولی وڵاتە ئیسلامیەکان"[١٩٨].

لە روانگەی ڕێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێرانەوە، یەکگرتن لەگەڵ وڵاتە سەربەخۆکان و کەڵك وەرگرتن لە ناکۆکی نێوان هێزە دەرەکیەکان دەبێ دووپایەی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی بێت: "لە مەیدانی دەرەوەدا دەبێ سیاسەتی کۆماری ئیسلامی ئێران لەسەر دوو پایەی پەیوەستیو یەکێتی وڵاتە سەربەخۆو هاوچارەنووسەکان و کەڵك وەرگرتن لە ناکۆکی هێزە سەرمایەدارەکان لەگەڵ ئەمریکادا دابمەزرێ"[١٩٩]

هەروەها ئەم باڵە پێشنیازی پەرەپێدانی پەیوەندییەکان لەگەڵ خۆرهەڵاتدا دەکات. (عصرما) لە روونکردنەوەی ئەم بۆچوونەدا دەنووسێت: "بەداخەوە لە رابردوودا سیاسەتی پەرەپێدانی پەیوەندی‌یەکان لەگەڵ خۆرهەڵاتدا بەشێوەیەکی راستەقینە لێی نەکۆڵرایەوەو لە هەندێ لایەنی دیاری‌کراویشەوە بەبێ هۆ لە مەسەلەی پەرەپێدانی پەیوەندی لەگەڵ خۆرئاوادا گرێی لێدرا "قفل بوو""[٢٠٠].

## ٢- پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکادا:

ئەم باڵە هەر جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ ئەمریکادا بە توندی رەت دەکاتەوە. ڕێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە بەیاننامەیەکدا لەم بارەیەوە دەنووسێت "ئەم دەسەڵاتە شەیتانیە (ئەمریکا) بە شتێکی کەمتر لە گۆڕین یان لە ناوبردنی شۆڕشی ئیسلامی قایل نابێت.. چیتر جێگایەك بۆ ئەو بۆچوونە ساویلکانە نەماوەتەوە کە چارەسەری کێشەکانی ناوخۆیان وەکو بەشێك لە نزیکی لەگەڵ

---

[١٩٨] همان، شماره ٣٠، ٧٤/٩/٢٢، ص ٦،٧.

[١٩٩] همان، شماره ١٣، ٧٤/١/٣٠، ص٧.

[٢٠٠] دو هفتەنامە عصرما، شماره ١٥، ٧٤/٢/٢٥، ص٥.

ئەمریکادا شی‌دەکردەوە"[201] هەروەها (عصرما) دەنووسێت: "ئەمریکاو بەریتانیا دوژمنانی سەرەکی ئیسلام و شۆرش، لەناوبردن یان گۆرینی نیزامی ئیسلامی ئێمەیان کردووە بە ئامانج. نەرم و نیانی‌و سازش لەگەڵ ئەم هێزانەدا سەرەرای ئەوەی گۆرانێك لە هەڵوێستی ئەو هێزانەدا بەدی نەهێناوەو بەدی ناهێنێ، لە بەرامبەر هەرەشەکانی ئەمانەدا ئێمە تووشی زیان دەکات"[202] ئەم رێکخراوە لە بەیاننامەیەکی دیکەدا تەئکید لەوە دەکاتەوە کە "ناتوانرێ پاشەکشەو گۆران لە رەفتاری ئەمریکا لە بەرامبەر شۆرش و نیزامی کۆماری ئیسلامی ئێراندا بە لوتف و خۆشەویستی لێك بدرێتەوە.. ئیمپریالیزمی ئەمریکا دوژمنی سەرەکی و خێرای ئێمەیە.. دروشمی ستراتیجی و رێنیشاندەری ئێمە، نە تەسلیم بوونەو نەهێرش بردن، بەڵکو بەرگریەکی کاریگەرە"[203] هەروەها "بەربەرەکانی لە بەرامبەر ئەمریکا"دا وەکو یەکێك لەو سێ ئامانجەی سیاسەتی دەرەوە لە قەڵەم داوە کە بەلای خۆیەوە پەسەندە"[204] تا ئەو ئاستەی کە "رادەی نزیکی و فراوانکردنی پەیوەندی لەگەڵ وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا لەسەر بنەمای هەڵوێستی ئەو وڵاتانە لە بەرامبەر ئەمریکاو بەریتانیادا"[205] حساب دەکات.

ئەم رێکخراوە لە باسکردنی هەڵوێستەکانی خۆیدا ئەگەری هەر جۆرە پەیوەندییەك لە نێوان ئێران و ئەمریکادا بە شتێکی چاوەروان نەکراو دەزانێت. هەروەکو لە رەش نووسی هەڵوێستەکانی‌دا باسی کردووە: "ئەمریکا دوژمنی سەرەکی و ستراتیجی شۆرش و کۆماری ئیسلامی ئێرانە. سیفەتی دەست درێژکاری‌و دەسەڵاتخوازی ئەمریکا لە لایەکەوەو تایبەتمەندی عەدالەت خوازی و سەربەخۆیی خوازی شۆرش و کۆماری ئیسلامی ئێران لەلایەکی دیکەوە.. هەر جۆرە لەیەك گەیشتن و پەیوەندی‌یەکی ئاشتی خوازانەی نێوان ئێمەو ئەمریکای رەت کردۆتەوە"[206]

---

[201] همان، شماره ١٣، ٧٤/١/٣٠، ص٧.

[202] همان، ص٣.

[203] بیانیه شماره ٧، سازمان مجاهدین انقلاب اسلامی ایران، ٧٤/١٠/١٨.

[204] دوهفتەنامه عصرما، شماره ٦٦، ٧٦/١/٢٣، ص٩.

[205] همان، شماره ٢٨، ٧٤/٨/٢٤، ص٦.

[206] همان، شماره ٣٠، ٧٤/٩/٢٢، ص ٦،٧.

## کورتەی هەڵوێستە سیاسیەکانی

## باڵی ئەنجومەنی روحانیە خەباتگێڕەکان و گروپە نزیکەکانی

١-سنورداری دەسەڵاتەکانی وەلی فەقیە لە چوارچێوەی دەستووردا.

٢-لەسەردەمی غیابدا دانانی وەلی فەقیە بە هەڵبژاردن بێ.

٣-تەئکید کردنەوەی یەکسان لەسەر (جەمهوریەت و ئیسلامیەتی نیزام).

٤-بینای سیاسی حکومەتی ئیسلامی بەیەك شێوەی تایبەتی نەبێت و لەگەڵ هەلومەرجی رۆژگاردا قابیلی گۆڕان بێ.

٥-تەئکید کردنەوە لەسەر پێویستی چالاکی حزبی سیاسی.

٦-گرنگی ئازادی چالاکیە سیاسیەکان لە چوارچێوەی دەستووردا.

٧-ئازادی مافێکی خودایی و سروشتیی‌یە نەك ئیمتیاز.

٨-تەبایی ئیسلام لەگەڵ دیموکراسی‌دا.

٩-پشتیوانی لە بە دامەزراوکردنی بەشداری سیاسی.

١٠-بەشداری خەڵك "مافی" خەڵکە.

١١-ئامانج داری لە جیاتی کارکردن.

١٢-پشتیوانی لە ناردنە دەرەوەی شۆڕش.

١٣-نیشان دانی نموونەی ئێران لە پێناوی یارمەتی‌دانی ناردنە دەرەوەی شۆڕشدا.

١٤-رەش بینی لە بەرامبەر رێکخراوە نێودەوڵەتیەکاندا.

١٥-پێشنیازکردنی پەرەپێدانی پەیوەندی‌یەکان لەگەڵ خۆرهەڵاتدا.

١٦-پێشنیازکردنی یەکێتی لەگەڵ وڵاتە سەربەخۆکان و سوودوەرگرتن لە ناکۆکی هێزە دەرەکیەکان وەکو دوو پایەی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی.

١٧-رەت کردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا.

١٨-"بەربەرەکانی لە بەرامبەر ئەمریکادا" وەکو یەکێك لە سێ ئامانجە سەرەکیەکەی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی.

## ٢-٢-بۆچوونە ئابوورییەکانی باڵی ئەنجومەنی روحانیە خەباتگێڕەکان و گروپە نزیکەکانی

### ١-تایبەتی کردن:

ئەم باڵە دژی تایبەتی کردنی بەرفراوانی یەکەکانی بەرهەم هێنانەو ئەم مەسەلەیە بەشێوەیەکی سنووردار قبوڵ دەکات مەرجی بۆ دادەنێت. لەم بارەیەوە لە رەش نووسی بەڵگەنامەی هەڵوێستە ئابوورییەکانی رێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا هاتووە:

"رێکخراوی.. پرانسیپەکانی موڵکایەتی تایبەتی مەرجدارو سنووردار بە بەڵك دەزانێت و رێزی لێ دەگرێ.. هەتا ئەو شوێنە رێز لە موڵکایەتی تایبەتی دەگرێ و پشتیوانی لێ دەکات کە:

-نەبێتە هۆی دەسەڵاتی سەرمایە بەسەر کۆمەڵ داو بە دەربڕینێکی تر کەڵەکەبوون و ئاڵ و وێڵ کردنی سامان و لە رێی ئەمەشەوە دەسەڵات لە دەستی توێژێکی تایبەتی‌دا نەبێت.

-پرانسیپی زیان نەگەیاندن بە کەسانی دی رەت نەکاتەوەو نەبێتە فاکتەری چەوسانەوەو لەبەردەم بەدی هێنانی دادپەروەری کۆمەلایەتی‌دا نەبێتە کۆسپ.

-بە حساب کردن بۆ بایەخ پێدان و پێشکەوتنی بەرژەوەندی گشتی بەسەر بەرژەوەندی تاکەکانی کۆمەڵدا هەر جۆرە دژایەتیەك لە نێوان موڵکایەتی گشتی و تایبەتی لە پێناوی یەکەمدا هەڵ بگیرێ"[٢٠٧].

بە رای ئەم باڵە هەل و مەرجی کۆمەڵگای ئێران ئەوە فەرز دەکات کە دەوڵەت دەست لە کاروباری ئابووری وەربدات. چونکە بەپێی ئەوەی کە لە رەش نووسی بەڵگەنامەی هەڵوێستەکانی رێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا هاتووە:

"کۆمەڵی گەشە نەکردوو و دوواکەوتووی ئێران بەبێ بوونی دەوڵەتێکی بەهێز، بەرنامەداڕێژ، دەست وەردەر وەکو ماشینی جوڵێنەری گەشەکردن، هیچ بە هیچ

---

[٢٠٧] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ٦٥، ٧٥/١٢/١٦/ص٨.

ناکات"[208] لەگەڵ ئەمەشدا بە رای ئەم باڵە بەشە سەرەکیو ستراتیجیەکانی ئابووری دەبێ هەمیشە موڵکی دەوڵەت بن. ڕێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە بەیاننامەیەکدا لەم بارەیەوە دەنووسێت: "بەشەکانی دایك و ستراتیجی ئابووری وەکو پیشەسازی قورس، سەرچاوەکانی وزە، پرۆژە گەورە نیشتمانیەکان، کشتوکاڵو.. لەو لایەنەوە کە پەیوەندییان بە کاروباری ژێرخانی وڵاتەوە هەیە. هەمیشە بە موڵکی دەوڵەت دەمێننەوە"[209].بەپێی ئەم بەیاننامەیە "دەسەڵاتی کەرتی تایبەتی و دەسەڵاتی سەرمایەداری و بازاڕ بەسەر ئابووری وڵاتدا جگە لەوەی پێشێل کەری گیان و پرانسیپەکانی دەستووره لەگەڵ واقیعی وڵات و تایبەتمەندییەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی کۆمەڵدا ناساز بووە، بەردەوام بوونی ئەمە بۆ شۆڕش و نیزام و وڵات زۆر زیان بەخش و ترسناکە"[210] ئەم ڕێکخراوە تەئکیدی لە سنووورداری چالاکیەکانی بەشی تایبەتی کردۆتەوەو دەڵێت: "بەشی تایبەتی دەڵاڵ سیفەت دەبێ بە توندی لە قاڵب بدرێ"[211].

هەروەها بڵاوکراوەی عصرما دەنووسێت: "چارەسەرکردنی کێشە ئابوورییەکانی وڵات و لە هەمووشی گرنگتر گرانی و هەڵئاوسان بە بەردەوامی قبوڵ کردنی مۆدیلی ئابووری بازارو نموونەی سەرمایەداری مەیسەر نابێ.. تەنها ڕێگەی ڕووبەڕووبوونەوەی قەیرانەکان و گیروگرفتە ڕاستەقینەکان، چاوپێداخشانەوەی بنەڕەتی و ستراتیجی بە بەرنامە ئابوورییەکانی وڵاتدا.. ڕێگەچارەی کورت خایەن، کۆنترۆڵی تەواو وردی بەهای بەدەست هاتووی نەوت و دابەش کردنی لەسەر بنەمای ئەولەویەتی پەرەسەندن و دابین کردنی پێویستیە بنەڕەتی و پێویستەکانی وڵات و پاشان تەرخان کردنی لەو ڕێگایانەوە کە شایانی جێبەجێکردن و خەرج کردنن. پێویستە تەواوی بەهاکان لەوانەش بەهای هەناردەکان بەبێ ئەوەی ئەو کۆنترۆڵەی سەرەوە بیان گرێتەوە. لە بازاڕێکی خواست و خستنەڕوودا بۆ تەواوی چالاکیە

[208] هەمان، شمارە ٥٦، ٧٥/٨/٩، ص٥.

[209] هەمان، شمارە ٤٢، ٧٥/١/٢٩، ص٢.

[210] هەمان.

[211] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ٦٦، ٧٦/١/٢٣، ص٩.

ئابوورییه پێویستەکان خەرج بکرێن. تەنها سنووردارکردنی تەواو پێویست لەم بارەیەوە، ڕێگرتنە لە هێنانی کالای لۆکس (کەمالیات) و نا پێویست و کەمتر پێویست لە بەرامبەر بەهای هەناردەکاندا. ئەم ڕێگرتنە پێویستەیان لە ڕێگەی مۆڵەت نەدانی هێنانی زۆربەی ئەو کالایانەوە بێ یان لە ڕێگەی زیادکردنی گومرگی ئەو جۆرە کالایانەوە ئەنجام بدرێت و ئەم بڕیارانەش هەموو ڕێگەکانی هێنانی کالا بۆ ناو ولات بگرێتەوە. هاوزەمان پێویستە بە پیادەکردنی سیاسەتی نرخی ڕاست و دروست، سیستمی پشکداری کالا بنەڕەتیەکان بە تواناو فراوانی زیاتر لە جارانەوە جێبەجێ بکرێن و کۆمەلە هەرەوەزیەکانی بەکاربردن و.. کرێکاری و کارمەندی سەرلەنوێ ببووژێنرێتەوەو بەهێز بکرێن بۆ ئەوەی لە ماوەیەکی مام ناوەندیدا گرانی کۆنترۆڵ بکرێ. لە لایەکەوە ڕێگەچارەی ماوە درێژی گرانی و کەم کردنەوەی مەرجی لە ڕێگەی پشکدارییەوە، گۆڕینی نموونەی خەرجی ئەم چەند ساڵەی دوایی و ڕاگرتنی هەمیشەیی دەرگا کراوەکان، لە لایەکی ترەوە زیادکردنی بەرچاوی سەرمایەگوزاری لە بواری کالاکانی سەرمایەیی و (نێوانی) و دروست کردنی ژێرخانەکان لە ماوەی بەرنامەی دووەمدا. ئەم سیاسەتانەی سەرەوە لە کاتێکدا قابیلی جێبەجێکردنن و سەرکەوتوو دەبن کە لەگەڵ پەسەندکردنی نموونەی ئابووری بە بەرنامەو کۆنترۆڵ کراوی پشت بەستوودا بێ بە کەرتی بەتوانای دەوڵەتیو هەرەوەزی و تایبەتی. لە ئابوورییەکی تێکەلی لەم جۆرەدا، لەهەمان کاتدا کە دەوڵەت بەرنامە ڕێژی و کۆنترۆلی ئابووری و بەپێی مادەی (٤٤)ی دەستووریش بەڕێوەبردنی کەرتە ستراتیجیەکان لە ئەستۆ دەگرێ. کەرتە تایبەتی و هەرەوەزییەکانیش بەتواناو درێژە بە چالاکیەکانی خۆیان دەدەن"[٢١٢]

بە شێوەیەکی گشتی باڵی ڕوحانیە خەباتگێڕەکان.. سەرمایەداری کۆن و نوێ ڕەت دەکەنەوە. (مونتەجب نیا)ی ئەندامی ئەنجومەنی ڕوحانیە خەباتگێڕەکان لەم بارەیەوە دەڵێت: "هەردوو بۆچوونی سەرمایەداری کۆن و نوێ لەگەڵ نیزامی ئابووری ئیسلام و دەستووردا ناتەبان"[٢١٣].

---

[٢١٢] همان، شماره ١، ٧٣/٧/٢٧، ص٤،٥.

[٢١٣] روزنامه کاروکارگر، ٧٥/٩/٢١.

## ٢- پەرەپێدان:

لە روانگەی باڵی ئەنجومەنی روحانیە خەباتگێرەکانەوە، پەرەسەندن و گەشەکردنی ئابووری بە بەراورد لەگەڵ دادپەروەری کۆمەڵایەتیدا ئەولەویەتێکی کەمتری هەیە. (عصرما) لەم بارەیەوە دەنووسێت: "باڵی چەپ لەگەڵ ئەوەشدا کە باوەڕی بە پێویستی گەشەپێدان و پەرەپێدانی ئابووری هەیە، لە بەرامبەر سەربەخۆیی و دادپەروەری کۆمەڵایەتیدا ئەولەویەتی پەرەپێدانی ئابووری بە کەمتر دەزانێت. بە دەربڕینێکی دیکە پەرەپێدانی ئابووری تەنها لە رێگەی پاراستنی سەربەخۆیی و دادپەروەری کۆمەڵایەتیەوە پەسەند دەکات بەپێی ئەو چەمکانەی خۆی پێی باشە.. چەپ دژی تیۆرو پلانەکانی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی و بانکی جیهانییە"[٢١٤] (عصرما) بۆ روون کردنەوەی ئەم بۆچوونە درێژەی دەداتێ: "پێویستە ئامانجە سەرەکیە ئابوورییەکانی کۆماری ئیسلامی یەك لە دوای یەك ئەولەویەتی بەدیهێنانی، سەربەخۆیی ئابووری، دادپەروەری کۆمەڵایەتی و گەشەپێدان و پەرەپێدانی ئابووری بێت. سەربەخۆیی ئابووری قابیلی گۆڕینەوە نییە لەگەڵ گەشەپێدان و پەرەپێدانی ئابووری و هەتا لەگەڵ دادپەروەری کۆمەڵایەتیشدا هەر هەنگاوێك بەرەو بەدی هێنانی ئامانجی دووەم و سێیەم کە لەگەڵ ئامانجی یەکەم (سەربەخۆیی) ناکۆك بێ، پەسەند نییە. هەروەها دادپەروەری کۆمەڵایەتیش لە پێش گەشەپێدان و پەرەپێدانی ئابوورییەوەیەو چونکە گەشەپێدان و پەرەپێدان ئەگەر دادپەروەری کۆمەڵایەتی رەت بکاتەوە، مایەی پەسەندکردن نابێ"[٢١٥]

ئەم باڵە باوەڕی بەو پەرەپێدانی ئابوورییە هەیەکە پشتی بەناوخۆ بەستبێ بڵاوکراوەی (عصرما) بۆ روون کردنەوەی ئەم بۆچوونە دەنووسێت: "پێداگرتن لەسەر سەربەخۆیی ئابووری پێویستی بە رەت کردنەوەی رێگەچارەو نموونەکانی سەرمایەداری و تێکەڵ بوون لەگەڵ بازاڕی جیهانی هەیە. رێبازی پشت بەستن بەناوخۆ لە هەموو بوارەکاندا لەو پێویستیانەیە کە رێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێران تەئکیدی لێ دەکاتەوە"[٢١٦]

---

[٢١٤] دو هفتەنامە عصرما، شمارە ١٢، ٧٤/١/١٦، ص٢.

[٢١٥] همان.

[٢١٦] همان، شمارە ٣٧، ٧٤/١٢/٩، ص٥.

### ٣-دادپەروەریی کۆمەڵایەتی:

باڵی ناوبراو دادپەروەری کۆمەڵایەتی لە رێگەی سیستەمی پشك داری‌یەوە بەکاری کردە دەزانێت. بڵاوکراوەی (عصرما) لەم بارەیەوە ئاوا دەنووسێت: "بۆ بایەخدان بە دادپەروەری کۆمەڵایەتی و پشتیوانی راستەقینە لەو توێژانەی تووشی نەداری بوون، دەبێ سیستەمی پشکداری کالایی بۆ فەرمان بەرانی دەوڵەت، کرێکاران و توێژە نەدارەکانی کۆمەڵ زیندوو بکرێتەوە"[217] هەروەها دەربارەی روونکردنەوەی دیدگای باڵی چەپ سەبارەت بە دادپەروەری کۆمەڵایەتی دەنووسێت: "مەبەستی باڵی خەتی ئیمام لە دادپەروەری کۆمەڵایەتی بریتی‌یە لە گۆڕینی ژێرخانی ئابووری و کۆمەڵایەتی وڵات لە پێناوی بەرژەوەندی بێبەشان و بەدامەزراوکردنی ئەو رێبازەیەو بۆ بەدی‌هێنانی پێشنیازی چەند رێگایەك دەکات کە هەندێ لەوانە بریتین لە:

١-فراوانکردنی موڵکایەتی لە رێگەی پەرەپێدانی کۆمپانیا پشکیە گشتیەکانەوە کە دەبێتە هۆی ئەوەی بەشداری گشتی خەڵك لە مەسەلەی سەرمایەگوزاری و بەرهەم هێناندا فەراهەم بێت، لەگەڵ ئەمەش جڵەوگیری لە کەڵەکەبوونی یەکەکانی بەرهەمهێنان و خزمەت گوزاری لە دەستی کۆمەڵێ کەسی دیاری کراودا بکرێت.

٢-بەهێزکردن و پەرەپێدانی کۆمەڵە هەرەوەزییەکان: پێویستی ئەم کارە بریتی‌یە لە پشتیوانی راستەقینەی دەوڵەت لە کۆمەڵە هەرەوەزییەکان و بەهێزکردنی پێکهاتەی دارایی و یارمەتی‌دان و رێنمایی و فێرکردنیان.

٣-گۆڕینی یاسای داراییەکان بە مەبەستی وەرگرتنی دارایی زیاتر لە دەوڵەمەندان.. لە بەرامبەریشدا چاکردنی ئاستی دارایی چینە بێبەش و کەم دەرامەتەکان.

٤-رێگەدان بە متمانەی تایبەت بە کەرتی تایبەتی لە سیستەمی بانکی وڵاتدا، لە پێناوی بەهێزکردن و پەرەپێدانی کەرتی تایبەتی بەرهەم هێن.

٥-بەردەوام بوونی دانی یارمەتی بە بەکاربەر.

٦-بە گشتی کردنی تەئمینی کۆمەڵایەتی.

٧-پەرەپێدانی بیمەی بێکاری"[218]

---

[217] هەمان شمارە ٣٠، ٧٤/٩/٢٢، ص٥.

[218] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ٦٢، ٧٥/١١/٣، ص٥.

لە رەش نووسی بەڵگەنامەی هەڵوێستە ئابوورییەکانی رێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا بۆ تەئیدکردنی هەمان مەسەلە هاتووە "لە ئەگەری سەرهەڵدانی هەر جۆرە ناکۆکیەکدا لە نێوان ئامانجەکانی دادپەروەری کۆمەڵایەتی و گەشەپێدان و پەرەپێدانی ئابووری لە کۆمەڵدا، پاراستنی دادپەوەری کۆمەڵایەتی ئەولەویەتی دەبێ"[219] مەهدی کەڕوبی‌یش لەم بارەیەوە دەڵێت: "شان بە شانی بیناکردن ئەولەویەت بۆ دادپەروەری کۆمەڵایەتی و پشتیوانی لە هەژارانە، لە شەڕی هەژار و دەوڵەمەندیدا لایەنگری لە بێبەشەکان دەکات"[220].

بەڕای باڵی چەپ دادپەروەری کۆمەڵایەتی لە دوای سەربەخۆیی و گرنگترین ئامانجی ئابووری نیزامی ئیسلامی‌یە. بەپێی نووسینی (عصرما): "رەوتی فیکری چەپ فراوانکردن و پەرەپێدانی دادپەروەری کۆمەڵایەتی لە دوای سەربەخۆیی بەگرنگترین ئامانجی ئابووری نیزامی ئیسلامی دەزانێت و بەدی هاتنی تەنها لە سایەی لەناوبردنی جیاوازی چینایەتی و کەڵەکە نەبوون و پاوان نەکردنی سامان و دەسەڵات لە دەستی توێژێکی تایبەتی، دابین کردنی لایەنی کەمی پێویستیەکانی ژیانی تاکەکانی کۆمەڵ، رەخساندنی دەرفەتی یەکسان و لایەنی کەمی تواناکان بۆ هەموو هاووڵاتیان و بەکورتی بەتەواوی بەدیهێنانی مادەکانی (٤٣ و ٤٤)ی دەستووردا دەبینێت.. بۆ بەدیهێنانی دادپەروەری کۆمەڵایەتی.. نابێ دەوڵەت تەنها رۆڵی چاودێرێك ببینێ کە بەدانانی یاساو بڕیارەکان ئابووری ئاراستە دەکات، بەڵکو پێویستە بە شێوەیەکی بەردەوام دەست لە کاروباری ئابووریش وەربدات و بەدوور و درێژی رۆڵی سیاسەت داڕێژەر ببینێ و کەڵك لە بەرنامەڕێژی مەرکەزی و کۆنترۆڵی راستەوخۆو دابەشکردنی سامانەکان وەربگرێ"[221].

مەهدی کەڕوبیش لە چاوپێکەوتنێکدا لەم بارەیەوە دەڵێت: "کۆڵەکەی بیری ئیمام (رە) لە بواری ئابووری‌دا رووبەڕووبوونەوەی سەرمایەداری لغاو بۆ شل کراوە لە تانوپۆی ئابووری وڵاتدا بە پشت بەستن بە دیدگای جەنگی بەردەوام و بێ ئامانی هەژاری و دەوڵەمەندی و پشتگیری لە چەوساوەکان و پێ پەتیەکان".

---

[219] هەمان، شمارە ٦٦، ٧٦/١/٢٣، ص٣.

[220] هەمان، شمارە ١٢، ٧٤/١/١٦، ص٢.

[221] روزنامە کیهان، ٧٥/١١/٢.

مەکتەبی سەقامگیرکردنی یەکێتی یش لە بەیاننامەیەکدا هەمان بۆچوونی ڕاگەیاند: "ئابووری وڵات دەبێ بەرەوپشتگیری و خۆشگوزەرانی توێژە چەوساوەکانی کۆمەڵ.. بەڕێ بکرێ"[222].

### ٤- نموونەی ئابووری:

نموونەی ئابووری ئەم باڵە پشت بەخۆبەستنە. لە ڕەش نووسی بەڵگەنامەی هەڵوێستە ئابووری‌یەکانی ڕێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا لەم بارەیەوە نووسراوە: "پشت بە خۆبەستن بە مەعنای دابین کردنی هەموو پێویستیە جۆراوجۆرەکانی وڵاتێك نی‌یە لەناوخۆدا، بەڵکو مەبەست لە فەراهەم هێنانی وزەو توانای دروست کردنی پێکهاتەیەکی پێویستە لە سەرمایە، هێزی کار، کەرەسەی سەرەتایی و تەکنەلۆژیا بۆ کۆمەڵ لە هەل و مەرجی جیاجیای ئابووری و سیاسی‌دا"[223]. ئەم ڕێکخراوە بە تەئکیدکردنەوە لە ئەولەویەتی بەدەست هێنانی پشت بەخۆبەستی کشتوکاڵی دەڵێت (بەدەست هێنانی پشت بەخۆبەستنی کشتوکاڵی و خۆراکی دەبێ لەهەر بەرنامەیەکی پەرەپێداندا بە شێوەیەکی ڕاستەقینەو واقیعی بایەخی پێ بدرێ و بە ئەولەویەت دان بە دابین کردنی پێویستیە خۆراکیەکان لە ماوەی کورتی پێنج تا دە ساڵ دا دەبێ ئەم دەستکەوتە بەدەست بێنن. بەڵام لە ماوەی درێژدا بە مەبەستی پەرەپێدانی ئابووری بەتایبەتی لەوەزعی پاش تەواوکردنی سەرچاوەو دەرامەتە نەوتیەکاندا، دەبێ نموونەی پەرەپێدانی ئابووری لەبەرچاو بگیرێ و ئەوەی لەم ڕێڕەوەدا ئەولەویەتی هەیە، بریتی‌یە لە پشت بەستن بە هێزی مرۆیی پسپۆڕو بەڕێوەبەرایەتی کارامەی ناوخۆ، زانیاری تەکنەلۆژیایی ناوخۆیی، سەرمایەگوزاری لە پیشەسازی بنچینەیی و نێوانی‌دا"[224]. هەروەها ئەم ڕێکخراوە لە بەیاننامەیەکی دیکەدا، ڕەت کردنەوەی وابەستەیی بە ئابووری زاڵی دەرەکیەوە وەکو یەکێك لە ئامانجە ئابوورییە پەسەندەکانی ڕاگەیاندووە"[225].

---

[222] دو هفته نامه عصرما، شماره ٥٠، ٧٥/٥/١٧، ص ٧.

[223] همان، شماره ٦٥، ٧٥/١٢/١٦، ص٨.

[224] همان، شماره ٤٢، ٧٥/١/٢٩، ص٢.

[225] همان، شماره ٦٦، ٧٦/١/٢٣، ص٢.

لە روانگەی ئەم باڵەوە ئابووری تێکەڵ بۆ ئەم بارودۆخە پێویستە. (عصرما) لە روون کردنەوەی بۆچوونەکانی ئەم باڵەدا دەنووسێت: "باڵی چەپ نموونەیەکی دیاریکراو بۆ کۆمەڵ بە ئایدیای خۆی نازانێ، بەڵام سیستمی ئابووری تێکەڵ و شێوەیەك لە سوسیال دیموکراسی دەتوانن لەبەرچاوی ئەم باڵە مایەی بایەخ پێدان لەبەرچاوگرتن بن. رەنگە نزیکترین نموونە لە بیری ئابووری و سیاسی باڵی چەپەوە چەند کۆمەڵێکی وەکو سویدو چین و هندستان بێ و بە دەربڕینێکی باشتر تێکەڵێك بێ لەم سێ نموونەیە. لە روانگەی ئەم باڵەوە سویدو هندستان لە رووی ئابوورییەوە تا رادەیەك نموونەی قابیلی قبوڵن، ئابووری ئەم وڵاتانە تێکەڵەو لە یەکگرتنی کەرتی دەوڵەتی و هەرەوەزی و تایبەتی پێك هاتووە.. رەوتی فیکری چەپ باوەڕی بە سستمی ئابووری تێکەڵ هەیە شان بە شانی کۆنترۆڵی دەوڵەتی و پەرەپێدان لە سایەی سەربەخۆیی و دادپەروەریدا"[٢٢٦].

عصرما لە شەرح کردنی ئەم دیدگایەدا درێژەی دەداتێ" چەپ باوەڕی بەجۆری ئابووری تێکەڵ هەیە. لە ئابووری ناوبراودا کەرتی دەوڵەتی و هەرەوەزی وەکو دەسەڵاتی لغاوکەری بەرژەوەندی خوازی بێ سنوورو لە قاڵبدانی کەرتی تایبەتی کاری کردووەو بەرژەوەندییە درێژخایەنەکانی کۆمەڵ و بەرژەوەندی زۆرینەی خەڵك دابین دەکات"[٢٢٧] لە هەمان کاتدا ئەم باڵە هەروەکو لە بەیاننامەی رێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا هاتووە بایەخێکی تایبەتی بەکەرتی هەرەوەزی دەدات.

"ئێمە باوەڕمان وایە کە بە مەبەستی بەدەست هێنانی ئامانجەکانی رەت کردنەوەی چەوسانەوەو بەرقەراری یەکسانی ئابووری، جوشدان و زیادکردنی کارامەیی و ئەنجامی کاری مرۆیی لە سیستمی ئابووریداو کارپەیداکردن و بەدەست

---

[٢٢٦] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ١٣/٣٠/١/٧٤، ص٢.

[٢٢٧] همان شمارە ١٢، ١٦/١/٧٤، ص٢.

هێنانی پەرەپێدانی هەمەلایەنە، سەقامگیرکردنی بنەماکانی سەربەخۆیی و پشت بەخۆبەستنی نیشتمانی و ستراتیجی نیشتمانی لە ئابووری وڵاتدا دەبێ بەرەو سیستمی هەرەوەزی، پەلکێش بکرێ.. هەرەوەزییەکان، سازکاریەکن کە هەم جڵەوگیری لە گۆڕانی دەوڵەت دەکەن بۆ خاوەن کارێکی گەورەو بێ هاوتاو هەم دەرگای دەسەڵاتی سەرمایەداری و بازاڕ لە دژی ئابووری و ڵات دادەخەن"[228].

## ٥-کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی:

ئەم باڵە بەشێوەیەکی مەرجدار لەسەر کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی رازی‌یە. رێکخراوی مجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە بەیاننامەیەکدا بۆ شەرح کردنی ئەم هەڵوێستە دەنووسێت: "مەرجی پێویست بۆ بەکارهێنانی سەرچاوەی دەرەکی، کەڵك وەرگرتنی باشترە لە سەرچاوەی ناوخۆو کەمبوونی سەرچاوە دەرەکیەکان بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەکانی پەرەپێدانی نیشتمانی‌یە. بەڵام وڵاتێك کە سەرچاوەکانی خۆی بۆ شتی ناپێویست خەرج دەکات رێگەی پێنادرێ کە هەتا بۆ سەرمایەگوزاری پێویست و بەکەڵکیش پەنا بۆ سەرمایەو متمانەی بانکی دەرەکی بەرێ. چاکردنی سیستمی ئیداری و دەزگای بیرۆکراسی جێبەجێکردنی دەوڵەتی و بەڕێوەبەرێتی کارامە لەگەڵ توانا کەڵك وەرگرتنی پێویست و سازندە لە متمانەی دەرەکی، مەرجی پێویستی هەر جۆرە قەرزوەرگرتنێکە. کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی تەنها بە مەبەستی سەرمایەگوزاری ژێرخان بەرهەم هێنان قابیلی رووتێکردنە. لە هیچ هەل و مەرجێکدا نابێ سەرمایەو متمانەی دەرەکی لە ئابووری وڵاتدا رۆڵی چارەنووس ساز ببینێ"[229].

---

[228] همان شمارە، ٤٢، ٧٥/١/٢٩، ص٢.

[229] همان.

## کورتەی بۆچوونە ئابوورییەکانی

## باڵی ئەنجومەنی روحانیە خەباتگێڕەکان و گروپە نزیکەکانی

١-ناڕازی بوون بەتایبەتی کردنی بەرفراوانی یەکەکانی بەرهەم هێنان و قبوڵ کردنی بەشێوەی مەرجدار و سنووردار.

٢-دەست وەردانی دەوڵەت لە کاروباری ئابووری.

٣-دەوڵەتی بوونی کەرتەکانی دایك و ستراتیجی ئابووری.

٤-بێتوانایی مودیلی ئابووری بازاڕ لە چارەسەرکردنی کێشە ئابوورییەکانی ئێراندا.

٥-ئەولەویەتی پەرەپێدان لە دوای سەربەخۆیی و دادپەروەری کۆمەڵایەتیەوە دێت.

٦-باوەڕیان بە بەهێزکردن و فراوانکردنی هەرەوەزیەکان هەیە.

٧-پێشنیازکردنی سیاسەتی پشت بەخۆبەستن وەکو نموونەی ئابووری.

٨-ئەولەویەتدان بە پشت بەخۆبەستنی ئابووری.

٩-بایەخدان بە نموونەی پەرەپێدانی پیشەسازی درێژخایەن.

١٠-دادپەروەری کۆمەڵایەتی لە دوای سەربەخۆیی گرنگترین ئەولەویەتە.

١١-پەسەندکردنی ئابووری تێکەڵ وەکو مۆدیلی پێویست و تەئکیدکردنەوە لە کەرتی دەوڵەتی و هەرەوەزی بەشێوەی دەزگای لغاوکەری کەرتی تایبەتی.

١٢-توانای کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی بەشێوەیەکی مەرجدار.

٣-٢-بۆچوونە فەرهەنگیەکانی باڵی ئەنجومەنی روحانیە خەباتگێڕەکان و گروپە نزیکەکانی:

### ١-چاودێری کردنی چالاکیە فەرهەنگیەکان:

ئەم باڵە پشتگیری لە چاودێری کردنی بەرهەمە فەرهەنگیەکان دەکات لە دوای بڵاوکردنەوەیان. رۆژنامەی (سلام) دەربارەی ئەم بابەتە دەنووسێت: "دەبێ لە حکومەتی ئایندەدا بنەمای تایبەتی کتێب لەسەر متمانە بێ بە بەرهەم هێنەرانی فەرهەنگی و دەبێ لەسەر ئەوە بەند بێ کە پەخش کەران و نووسەرانی کتێب

خزمەتگوزاری فەرهەنگن.. پەخش کەرانیش دەتوانن وەکو بەرپۆوەبەرانی بەرپرسی بڵاوکراوەکان بەرپرسی بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی خۆیان بن و بەم شێوەیە دەتوانرێ لە قۆناغی دوای بڵاوکردنەوەدا بنەمایەکی تایبەت دابنرێ"[230].

بڵاوکراوەی (عصرما)ش لەم بارەیەوە دەنووسێت: "سەبارەت بە چاودێری لەسەر چاپی کتێب دوو سیاسەت لە ئارادایە. سانسۆر لەسەر کتێب بەر لەچاپکردنی یان سانسۆری کتێب لەدوای چاپکردنی. سیستمی یاسایی ئاگادارکردنەوە باشترین شێوەیە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە لە پرانسیپەکان لادەدەن. نموونەیەك لەکاتی جێبەجێکردنی یاسای چاپەمەنی‌دا بۆخۆی ئەزموونێکی باشە لەم بوارەداو دەتوانرێ لە مەیدانەکانی دیکەی فەرهەنگی‌دا پەرەی پێ بدرێ"[231]. ئەم بڵاوکراوەیە لە ژمارەیەکی دیکەدا رەخنەی لە سیاسەتی "سانسۆری تەواو و راستەقینە گرتوە بەر لە بڵاوکردنەوەی بەرهەمی فەرهەنگی" لەجیاتی ئەوە پێشنیازی سیاسەتی "دانان و پەسەندکردنی دیسپلینی یاسایی کردو داوای کرد سەرپێچی کەران لە رێی دادگاوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ"

(عصرما) دەنووسێت "سیاسەتی سنووورداری یاسایی و مامەڵەی راستەوخۆ لەگەڵ بەرهەم هێنەرانی فەرهەنگی‌دا ئەنجامی نەبووە، باڵی چەپ لە بواری فەرهەنگدا.. تەئکیدی لە دەسەڵاتی دەوڵەت و ئازادی تاکەکەس وەکو دوانەیەك کردۆتەوە و دەکاتەوەو رێگەی گەشەکردنی لە بواری فەرهەنگ و هونەرو ئەدەب.. دا بە فراوانکردنی ئازادییەکانەوە گرێ دەدات. تەنها بە بەرهەم هێنانی هەرچی زیاتری بەرهەمی فەرهەنگی دەتوانرێ گەشەکردن و زیندوویی کۆمەڵ لە مەیدانی گۆڕانکارییەکانی جیهاندا دابین بکرێ. بۆ داکۆکی لە مافی کەسان و رسکاندنی ئەنگێزە بۆ بەرهەم هێنانی بەرهەمی فەرهەنگی دەبێ هەرچی زووتر بەرەو بە یاسایی کردنی کاروبارەکان، هەنگاو هەڵبگرین و کەش و هەوایەك دروست بکەین بۆ ئەوەی کەسانێك کە دژی ئاین، سەربەخۆیی، یەکپارچەیی و سەربڵندی ئێران نین. بتوانن بێنە مەیدانەوەو بە داهێنانی بەرهەمی فەرهەنگی تۆکمەیی و پارێزراوی کۆمەڵ زیاتر بکەن"[232]. هەروەها ئەم باڵە خوازیاری پشتیوانی دەوڵەتە لە کەرتی فەرهەنگی

---

[230] روزنامه سلام، ٧٦/٤/٢٨، ص٢.

[231] دوهفته‌نامه عصرما، شماره ٤٧، ٧٥/٤/٦، ص٢.

[232] همان، شماره ٢٥، ٧٤/٧/١٣، ص٧.

بەپێی نووسینی (عصرما): "لابردنی سەرمایەگوزاری و یارمەتی دانی دەوڵەت لە کەرتی فەرهەنگیدا نەکاری کردەیەو نە واقیعێکی پێویستیشە. بەم پێیە دەبێ سیاسەتی پشتیوانی دەوڵەت لەم کەرتە بەشێوەیەکی بنەڕەتی و ئسولی درێژەی هەبێ"[233].

## ٢-هێرشی فەرهەنگی:

ئەم باڵە باوەڕی وایە کە هێرشی فەرهەنگی هەیە، بەڵام لەم مەسەلەیەدا فاکتەرە ناوخۆییەکان بەکاریگەرتر دەزانێت. بەپێی بڵاوکراوەی (عصرما) "باڵی چەپ هێرشی فەرهەنگی وا دەبینێ کە لە ناهاوسەنگی دان و ستاندن و بەرهەم هێنانی فەرهەنگی و بوونی خاڵی لاواز لە فەرهەنگی خۆماڵیدا سەرچاوەی گرتووە"[234] ئەم بڵاوکراوەیە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشی فەرهەنگی ئەم ڕێگایانەی خوارەوە پێشنیاز دەکات.

"بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشی فەرهەنگی دەبێ لە هەنگاوی یەکەمدا هەژاری فەرهەنگی لە کۆمەڵدا بە بەرهەم هێنانی بەرهەمی فراوان لە بواری کتێب، سینەما، ڕۆژنامەگەری و.. لەناو ببرێ و هاوزەمان زەمینەی بابەتی وەکو بێکاری، نەبوونی توانای ژن هێنان و.. بگەیەنرێتە کەمترین ئاست و بە کارامەکردنی سیستەمی فێرکردن و دەزگای فەرهەنگی و ڕاگەیاندنی دەوڵەتی، کۆمەڵ لەسەر ڕێبازی ئامانجەکانی نیزام ئاراستە بکرێ"[235] بە شێوەیەکی گشتی ئەم باڵە ڕەگ و ریشەی ناهەمواریيە فەرهەنگیيەکان بە فاکتەری ناوخۆیی دەزانێت. (عصرما) دەنووسێت:

"ڕەوتی چەپ ڕەگ و ریشەی ناکاملی و ناهەمواریيە فەرهەنگیيەکان زیاتر لە لاوازی ناوخۆدا دەبینێ تا پیلانی دەرەکی"[236].

---

[233] همان، شماره ١٣، ٧٤/١/٣٠، ص٢.

[234] همان، شماره ١، ٧٣/٧/٢٧، ص٦.

[235] همان، شماره ٢٥، ٧٤/٧/١٣، ص٧.

[236] همان، شماره ١٣، ٧٤/١/٣٠، ص٢.

به ڕای ئەم باڵە بۆ چاکردنی کاروباری فەرهەنگی دەبێ روو لە باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی بکرێ.

بڵاوکراوەی (عصرما) دەربارەی بڕیاری پەرلەمان سەبارەت بە قەدەغەکردنی بەکارهێنانی ئامرازی وەرگرتنی سەتەلایت دەنووسێت: "مەبەستی ئێمە رەت کردنەوەی رێگا یاسایی‌و فەرهەنگی‌یەکانی رووبەڕووبوونەوەی سەتەلایت نی‌یە.. تەئکید کردنەوەی سەرەکی ئێمە لەسەر ئەوەیە کە رێگەی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سەتەلایتدا بەشێوەی ئیلزامی تەنها لە شێوە فەرهەنگیەکاندا نی‌یە. بەڵکو دەبێ بەرلەوە بایەخی تەواو بەخاڵە لاوازە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسیەکان بدرێ کە زەمینە بۆ سەرهەڵدانی قەیرانی لەو جۆرە خۆش دەکەن. بەبێ حسابکردن بۆ باری نالەباری کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی ناتوانرێ ئومێدێکی ئەوتۆ لەسەر چاکردنی کاروباری فەرهەنگی هەڵبچنرێ"[٢٣٧] ئەم باڵە ئەگەرچی نیگەرانی هێرشی فەرهەنگی‌یە بەڵام حەزیشی لە ئاڵوگۆڕی ئەندێشەو فەرهەنگ و مامەڵەی هەڵبژاردەیە لەگەڵ فەرهەنگەکاندا. "رەوتی چەپ نیگەرانی سەربەخۆیی، بەتوانایی و پاراستنی ناسنامەی فەرهەنگی خۆیەتی‌و.. باوەڕی وایە گەشەکردنی فیکری و فەرهەنگی لە راوێژکردنی بیرو دانوستاندنی ئەندێشەو فەرهەنگە کاندایە"[٢٣٨].

## ٣-ستراتیجی فەرهەنگی:

بەپێی ئەوەی بڵاوکراوەی (عصرما) ئاماژەی بۆ دەکات: "ستراتیجی فەرهەنگی باڵی چەپ لەسەر ئەم میحوەرانەی خوارەوە بنیات نراوە:

- بە رەسەن زانینی فەرهەنگی خۆماڵی و ناوەرۆك و بە لاوەکی زانینی فۆرم لەگەڵ بایەخ پێدانی‌دا.
- پەسەندکردنی ئاڵوگۆڕو دانوستاندنی فەرهەنگی و مامەڵەی هەڵبژاردە لەگەڵ فەرهەنگ و بیرە جیاوازەکاندا.
- کەڵك وەرگرتن لە ئامرازو شێوەی مۆدێرن لە بواری فەرهەنگی‌دا.

---

[٢٣٧] هەمان، شمارە ١، ٧٣/٧/٢٧، ص٦.

[٢٣٨] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ١٣، ٧٤/١/٣٠، ص٢.

• جیاکردنەوەی ئاراستەی فەرهەنگی و سیاسی لە ئاراستەی جاسوسی و ئەمنی لە مەیدانی فەرهەنگدا.

-دوورکەوتنەوەی تەواو لە رواڵەتکاری و دوگماتیکی و بەربەرەکانی رواڵەتەکانی.

-پەیوەندی و مامەڵە فەرهەنگی‌یەکان بخرێنە چوارچێوەی یاساوە و لە دورکەوتنەوە مامەڵەی سەلیقەی تاکەکەسی لەگەڵ ناهەمواربیەکاندا"[239].

## کورتەی بۆچوونە فەرهەنگیەکانی

## باڵی ئەنجومەنی روحانیە خەباتگێڕەکان و گروپە نزیکەکانی

١-پشتگیری لە چاودێری کردنی بەرهەمە فەرهەنگیەکان لە دوای بڵاوبوونەوە.

٢-پشتیوانی لە بەرهەم هێنانی هەرچی زیاتری بەرهەمی فەرهەنگی.

٣-تەئکیدکردنەوە لەسەر دەسەڵاتی دەوڵەت لە بواری فەرهەنگی‌دا شان بە شانی ئازادی کەسەکان.

٤-دژایەتی مامەڵەی سەلیقەیی لە بواری فەرهەنگی‌دا.

٥-پشتیوانی لە سەرمایەگوزاری و یارمەتی دەوڵەت لە بواری فەرهەنگی.

٦-بایەخ دان بە فاکتەری ناوخۆیی لە هێرشی فەرهەنگی‌دا.

٧-رەگ و ریشەی ناکامڵی و ناهەمواریەکان لە بواری فەرهەنگ زیاتر لە لاوازی ناوخۆی فەرهەنگدایە تا پیلانی دەرەکی.

٨-حسابکردن بۆ باری کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی بۆ چاکردنی کاروباری فەرهەنگی.

٩-بایەخ دان بە ئاڵوگۆڕی فەرهەنگ و بیرو مامەڵەی هەڵبژاردە لەگەڵ فەرهەنگەکاندا.

١٠-کەڵك وەرگرتن لە ئامرازو شێوازی مۆدێرن لە مەیدانی فەرهەنگدا.

١١-یاسایی بوونی پەیوەندی فەرهەنگی و دوورکەوتنەوە لە مامەڵەی سەلیقەیی لەم بوارەدا.

١٢-تەئکیدکردنەوە لە بەرەسەن زانینی فەرهەنگی خۆماڵی.

---

[239] همان.

# هەڵوێستە سیاسی و ئابووری و فەرهەنگیەکانی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی

## ١-٢-بۆچوونە سیاسیەکانی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی

**ئەلف: تێڕوانینیان سەبارەت بە حکومەت:**

### ١-ویلایەتی فەقیهو رابەری:

ئەم گروپە وەلی فەقیه وا دەبینێ کە لەلایەن خوداوە دانراوەو باوەڕی بە دەوری خەڵك نییە لە دانانیدا . و تەنها (قبوڵ کردنی خەڵك بە پێویست دەزانێت بۆ پیادەکردنی حوکمی فەقیه) بلاوکراوەی "ارزشها" دەنووسێت: "شەرعیەتی ویلایەتی فەقیه بەندە بە هەڵبژاردنی خەڵك و دامەزراندنی مەعصومین لەلایەن خوداوەندەوەو هەردووکیان، بەشی لە جیابوونەوە نەهاتووی یەکترین. هەتا فەقیه نەبێت شەرعیەتی نییەو هەتا بە هەڵبژاردنی خەڵك نەبێ و هەڵنەبژێردرێ یان نەگەڕێتەوە بۆ لای خەڵك کارکردنی ویلایەتەکەی ئەرك نییە.. پەسەندکردنی خەڵك بەمەرجی پێویست لە قەڵەم دراوە بۆ جێبەجێکردنی حوکمی فەقیه"[٢٤٠] ئەم کۆمەڵەیە لە پرۆگرامی خۆشیدا بە تەئکیدکردنەوە لەسەر ئەوەی کە چالاکی ویلایەتی فەقیه بەندە بە رای خەڵکەوە دەنووسێت: "لە سەردەمی غیابدا گەورەیی ئیمامی سەردەم (عج) و چالاکی و کاریگەری ئەو ویلایەتی فەقیهەی کە مەرجی رابەری تیایە، بەندە بە گەڕانەوە بۆ رای خەڵك یان نوێنەرانی هەڵبژاردەی خەڵك"[٢٤١] محەممەد محەممەدی ری شهری سەرۆکی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی دەڵێت: "لە راستیدا ویلایەتی فەقیه درێژەپێدانی حکومەتی پێغەمبەران و پێشەوایانی مەعصومە (د.خ)"[٢٤٢] و لە چوارچێوەی ئەم باوەڕەدا کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان لە رێنمایی رێکخراوەییدا بۆ ئەندام و لایەنگرانی خۆی تەئکیدی لەوە کردۆتەوە کە "ویلایەتی فەقیه نوێنەری ئیمامی سەردەمە"[٢٤٣].

---

[٢٤٠] هفتەنامە ارزشها، شمارە ١٤، ٧٦/١/٢٥، ص٢.

[٢٤١] مرامنامە جمعیت دفاع از ارزشهای انقلاب اسلامی/، فصل اول.

[٢٤٢] ماهنامە صبح، شمارە ٦٩، ارد بهشت ٧٦، ص١٣.

[٢٤٣] هفتەنامە ارزشها، شمارە ١٣، ٧٦/١/١٨.

ئەم گرووپە وەلی فەقیه لە سەرو دەستوورەوە دەبینێ. ئەحمەدی پورنجاتی بەرپرسی مەکتەبی سیاسی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی دەڵێت: "ئێمە دژی سنووردارکردنی دەسەڵاتەکانی وەلی فەقیهین"[244] بەوەشەوە کە (وەلی فەقیه لە هەل و مەرجی ناچاری یان پێویست یان مەسڵەحەتدا (دەتوانێ) سنوری ئەو دەسەڵاتانە ببەزێنێ کە لە ماوەی (١١٠)ی دەستووردا ئاماژەیان بۆ کراوەو لە دەرەوەی ئەو سنوورە ویلایەتەکەی خۆی بەکاربێنێ"[245].

ئەم گرووپە بە حسابکردن بۆ ئەوەی کە وەلی فەقیه بە هەڵبژێردراو دەزانێت لە لایەن مەعصومەکانەوەو باوەڕی بە دەوری رابەری هەیە لە سەروو دەستوورەوە، بە دروست کردنی خەرمانەیەکی پاکژ بە دەوری رابەردا قایلە. بەپێی نووسینێکی پورنجاتی لە بڵاوکراوەی (ارزشها)دا "رێز لێنانی خەڵك بۆ رابەری نەك تەنها لەگەڵ سەروەری یاسا لە کۆمەڵدا ناکۆك نییە بەڵکو گرەنتی مەحکەم و دڵنیایی بەخشی یاساش دەبێت. جگە لەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەها روونەکان بچنە ناو هەڵوێست و رەفتارەکانی رابەرییەوە.. و لە رەفتاری کۆمەڵایەتی خەڵکدا.. رەوت پەیدا بکات"[246] پاشان درێژەی دەداتێ: "کاری چاك بە مەعنای هەنگاوی گونجاوە لەگەڵ پێویستیەکانداو بە پێوەری حەق کە باسکردنی رابەری (ئومەت)دا دەدرەوشێتەوە، هەڵدەسەنگێنرێ.[247]

گرووپی ناوبراو تا ئەو شوێنە رێز لە رای خەڵك دەگرێ کە (لەگەڵ پێویستی واقیعی خەڵکدا ناکۆك نەبێ" ئەگەرچی ئەم کۆمەڵەیە ئەوەی روون نەکردۆتەوە کە دیاریکردنی ئەم (پێویستییە واقیعی)یە لە ئەستۆی چ کەسێکدایە بەڵام وادیارە لە روانگەی ئەوانەوە کاربەدەستانی حکومەتی ئیسلامی ئەم بەرپرسیارێتییە لە ئەستۆ دەگرن. محەممەدی ری شهری لەم بارەیەوە دەڵێت "لە ئیسلامدا خواستی خەڵك تا ئەو شوێنە رێزی لێ دەگیرێ کە لەگەڵ پێویستی واقیعی ئەواندا ناکۆك نەبێ و

---

[244] هفتەنامە ارزشها، ویژە انتخابات، ٧٦/٢/٣١، ص٢.

[245] همان، شمارە ١٥، ٧٦/٣/٢، ص٥.

[246] همان، شمارە ٨، ٧٥/١١/١٥، ص٥.

[247] همان، شمارە ٦، ٧٥/١٠/١٥، ص١.

راستی‌و راستگۆیی حکومەتی ئیسلامی پێویست بەوە دەکات کە پێویستیە واقیعیەکانی خەڵك دابین بکات.. یەکێك لە جیاوازییە بنەڕەتیەکانی حکومەتی ئیسلامی لەگەڵ دیموکراسی خۆرئاوادا ئەوەیە کە لە دیموکراسی خۆرئاواییدا خواستی خەڵك هەرچی بێ پەسەند دەکرێ هەتا ئەگەر بە زیانی پێویستیە واقیعیەکانیشی بێت، بەڵام لە سیستمی ئیسلامی‌دا پێویستیە راستەقینەکانی خەڵك بنەمای کارکردنە"[248] ری شهری لە جێگایەکی دیکەدا تەئکیدی لەوە کردۆتەوە کە ئیسلام داوامان لێ دەکات کە دەبێ بەهاکان پیادە بکرێن هەتا ئەگەر زۆربەش دژی بوەستنەوە "ئەوەی ئیسلام داوای دەکات ئەوەیە کە دەبێ مرۆڤ لایەنگری بەهاکات بێت و لە ژیانی خۆی و خێزانی و کۆمەڵایەتی خۆی‌دا پیادەی بکات، هەرچەندە زۆربەش دژی بەهاکان بوەستنەوە"[249]

ئەم گروپە داوا لە خەڵك دەکات لەو کاتەدا کە دەنگ د ەدەن، بۆچوونی کاندیدەکان لەگەڵ: "نیازەکانی رابەری و بەرژەوەندییەکانی نیزامدا" تاوتوێ بکەن: "ئەوە خەڵکەکە دەبێ بۆچوونەکانی کاندیدەکان و باڵە سیاسیەکانی هەڵ بسەنگێنن‌و هەر کام لەو بۆچوونانەیان لەگەڵ نیازو بەرژەوەندییەکانی نیزامدا بە هاوئاراستە نەبینێ، مۆری پوچەڵ کردنەوەی لێ بدەن"[250] بەم پێیە لە روانگەی ئەم کۆمەڵەیەوە بنەمای شەرعیەتی نیزام رابەریی پێکی دێنێ "رابەری میحوەری یەکێتی نیزام و بنچینەی شەرعیەتی نیزامە"[251].

هەروەها ئەم گروپە باوەڕی وایە کە پێویستە ئیدارەی حکومەت و کۆمەڵ لەسەر بنەمای رێوشوێنەکانی ئاین بێ. محەممەدی ری شهری لەم بارەیەوە دەڵێت، "ئاین بەهەمان شێوەیە کە خاڵە گشتیەکانی مەسەلەی بەهاکانی روون کردۆتەوە، چۆتە ناو وردەکارییەکانیشەوەو دەربارەی تەواوی ئەو بەرنامانەی کە کامڵ بوونی مرۆڤی پێوە بەندە، حوکمی خۆی هەیە، هیچ بابەتێك نی‌یە ورد یان درشت -کە ئیسلام دەربارەی

---

[248] روزنامە اطلاعات، ٧٥/١٢/٥، ص٢.

[249] هفتەنامە ارزشها، شمارە ١، مهر ٧٥، ص١٣.

[250] هفتەنامە ارزشها، شمارە ١٣، ٧٦/١/١٨، ص٥.

[251] همان.

حوکمی خۆی لەسەر نەدابێ واتە بەو شێوەیە نییە کە بڵێین ئیسلام بەتەنها دەربارەی مەسەلە گشتیەکان رای خۆی دەربڕیوەو نەچۆتە وردەکارییەکانەوە. سەبارەت بە تەواوی ئەو رووداوانەی کە رەنگە بێنە رێی مرۆڤێك یان کۆمەڵگایەکی ئیسلام حوکمی خۆی هەیەو ئەوەی روون کردۆتەوە کە رێگەی بەها کامەیەو رێگای دژی بەهاش کامەیە"[252] ری شهری لە جێگایەکی دیکەدا دەڵێت: "لە حکومەتە دینییەکاندا ئەگەر ئاین و بەها بەرزەکانی ئیسلام.. بەدی نەیەن، پێویستیە مادیو مەعنەوییەکانی کۆمەڵ دابین ناکرێن"[253].

## ٢-حزب:

کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان باوەڕی بە چالاکی رێکخراوە سیاسیەکان هەیەو فرە حزبی پەسەند دەکات بەڵام فرە حزبیەك کە بتوانرێ جێگەی هەموو حزبەکانی لە قاڵبی حیزبوڵڵادا بکاتەوە. چالاکی حزب لە روانگەی ئەم باڵەوە بەم مەرجانەی خوارەوە بەندە:

١-دەستووریان قبوڵ بێ.

٢-رابەرییان قبوڵ بێ.

٣-لە بنەماکانی ئیسلام پاشگەز نەبنەوە.

ئێستا ئاماژە بۆ چەند خاڵێ دەکرێ سەبارەت بە هەڵوێستەکانی ئەم گروپە لە بواری چالاکی حزبایەتی‌دا. کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی لە بڵاوکراوەکەی خۆیدا بە راشکاوی فرە مینبەری سیاسی رەت کردۆتەوەو دەنووسێت "مەیلی فرە مینبەری سیاسی لە کۆمەڵدا پەیڕەوی کردنە لە پرانسیپەکانی لیبرالیزمی سیاسی. بەو مەعنایەی کە دەبێ هەل و مەرجی سیاسی کۆمەڵ بەشێوەیەك بگۆڕێ کە بواری چالاکی ئازاد بۆ خاوەنی هەر بیرو ئەندێشەیەك فەراهەم بێت بەبێ هیچ سنوور دانانێکی ئاینی و سیاسی. فرە مینبەری سیاسی باوەڕی وایە کە زۆربەی سنووردانانە سیاسیەکانی ئێستا لە کۆمەڵدا، بێ لۆجیك و بێ بەرنامەیەو بەم پێیە دەبێ خستنەڕوو و بایەخ پێدانی بیرە سیاسیە جیاجیاکان ئەگەر لە رووی

---

[252] همان، شماره ١، مهر ٧٥، ص١٢.
[253] همان، شماره ١٠، ٧٥/١٢/١٣، ص٦.

باوەڕیشەوە لەگەڵ بنەما پرانسیپی بەهاکانی نیزامدا ناکۆك بن، ڕێگەیان پێ بدرێ"[254] محەممەدی ری شهری لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ روون کردنەوەی ئەوەی کە لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا لایەنگرانی ناڕەوا مۆڵەتی بانگەشەی بۆچوونەکانی خۆیان نییە دەڵێت "لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا کەس مافی ئەوەی نییە بیرە ناڕەواکان کە بە دژی (بەهاکان) لە قەڵەم دەدرێن دەرخواردی کەسانی دی بدات بەڵام خۆی دەتوانێ باوەڕی تایبەتی خۆی هەبێ"[255].

بە ڕای ئەم گروپە گروپە جیاوازەکان دەتوانن لە چوارچێوەی حزبوڵڵادا چالاکی بنوێنن. بەپێی قسەی محەممەدی ری شهری "لە ئیسلام و قورئاندا یەك حزب زیاتر لە ئارادا نییەو ئەویش حزبی خوایە. بەڵام لەم چوارچێوەیەدا ڕەنگە حزب و گروپی جیاجیا سەرهەڵ بدەن. بەڵام سەلیقەو شێوازیان لە جێبەجێکردنی کاروبارەکاندا جیاوازبێ"[256] بە پێی ئەم رایە هەموو حزبەکان بەگشتی پێویستە لە قاڵبی "حزبوڵڵا" دابن. بەم پێیە چالاکی ڕێکخراوە سیاسیە جیاوازەکان کە لەلایەن خەڵك و رابەرییەوە پەسەند بن، تەواو پێویستە. محەممەد ری شهری لەم بارەیەوە دەڵێت: "حزب بە چەمکە ڕەسمیەکەی لە کۆمەڵگاکانی دیکەدا مەفهومی هەیە لە کۆمەڵگای ئیسلامی ئێمەدا مەفهومی نییە. لە ئیسلامدا یەك حزب لە ئارادایەو ئەویش حیزبوڵڵایە. بنەما ئسوڵیەکانی حزبی خودا یەکێکەو قابیلی گۆڕان نییە. جگە لە حزبوڵڵا قورئان هەموو حزبەکان بە حزبی شەیتان ناودەبات. ئەوەی کە لە نیزامی ئیسلامیدا بە ڕێکخراوی سیاسی ناودەبرێت لە پێناوی باشتر بەڕێوەبردنی وڵاتدایە. لە نیزامی ئیسلامیدا ڕێکخراوە سیاسیە جۆراوجۆرەکان کە مایەی پەسەندکردنی خەڵك و رابەری بن، پێویستییە"[257].

لەگەڵ ئەمەشدا گروپی ناوبراو هەمەڕەنگیو فرە مینبەری لەناو نیزامدا پەسەند دەکات و محەممەدی ری شهری سەرۆکی کۆمەڵە لە گفتوگۆیەکدا تەئکیدی لە کەڵك وەرگرتن لە توانا جۆراوجۆرەکان کردۆتەوە و دەڵێت "ئێمە باوەڕمان وایە لە چوارچێوەی نیزام و ویلایەتی فەقیهو بەهاکانی شۆڕشدا کەڵك لە هەموو وزەو

---

[254] هفتەنامە ارزشها، شمارە ۱، مهر ۷۵، ص۲.

[255] همان، ص۱۹.

[256] روزنامە اطلاعات، ۷۵/۱۰/۹، ص۳.

[257] همان، ۷۶/۱۲/۳، ص۱۵.

تواناكان وەربگیرێ بەهەموو ئەو سەلیقە جیاوازانەشەوە كە هەیانە و هەموویان بخرێنەگەڕ.. هەرجۆرە مامەڵەیەكی فەرامۆش كردن لەگەڵ هێزە سەرەكیەكانی شۆڕشدا.. پێچەوانەی بەرژەوەندی نیزامە"[258] كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان بە قەناعەت بە دیدگایەكی لەو جۆرە پشتگیری لە دروست بوونی حزب دەكات روحوڵڵای حسێنیان جێگری سەرۆكی كۆمەڵە دەڵێت: "كاتێ ئێمە بە كۆماری ئیسلامی قایل بووین بێگومان ئەم حكومەتە كۆمەڵێ پێویستی هەیە كە دەبێ لە گەڵیدا بێت ئەگەر ئەم پێویستیانە نەبن جەمهوریەت بەدی نایەت و ئەمەش لە دروست بوونی حزبدا خۆی دەنوێنێ"[259] ئەم كۆمەڵەیە لە بەیاننامەیەكدا پێشوازی لە چالاكی (سەلیقەی سیاسی جیاوازو هەتا دژ بەیەك) كردووە بەو مەرجەی كە "لە بنچینەكانی ئیسلام پاشگەز نەبووبێتنەوە" و دەڵێت "ئێمە لەو باوەڕەداین كە سەلیقەی جیاوازو هەتا دژ بەیەك مادام كە لە بنچینەكانی ئیسلام و شۆڕش پاشگەز نەبووبێتنەوە، نەك تەنها زیان بەخش نین. بەڵكو ئامادەبوون و بەشداری كردنیان لە مەیدانی سیاسی وڵاتدا پێویست بووەو دەتوانێت لە پیكادانی بۆچوونەكاندا فاكتەرێكی كاریگەر بێت"[260].

### ٣-ئازادی:

هەروەكو لە باسكردنی هەڵوێستی كۆمەڵەدا دەربارەی حزب ئاشكرابوو، ئەم گروپە لەناو نیزامدا فرە مینبەری قبوڵ دەكات. لەم چوارچێوەیەدا كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان باوەڕی وایە كە هەركەس ئازادە كە بۆچوونی خۆی باس بكات. محەممەد محەممەدی ری شهری لەم بارەیەوە دەڵێت "لە چوارچێوەی نیزامدا.. هەركەس ئازادە فیكرو سەلیقەی خۆی هەبێ. هەر كەسێ لایەنگری زۆرتری بۆ خۆی پەیدا كرد، با بێت و وڵات بەڕێوەبەرێت"[261] بڵاوكراوەی (ارزشها)ش لە وتارێكیدا تەئكیدی لە پێویستی چەسپاندنی ئازادی لە كۆمەڵدا كردۆتەوەو دەنووسێت "ئازادی بە بەنرخترین بەهرەی شۆڕشی ئیسلامی لە قەڵەم دەدرێت كە بە شێوەیەكی باش

---

[258] همان.

[259] همان، ١٦/١٠/٧٥، ص١٢.

[260] بیانیه شماره ١ جمعیت دفاع از ارزشهای انقلاب اسلامی.

[261] هفتەنامه ارزشها، شماره ٢، آبان ٧٥، ص٥.

خەڵکی ئێمە بەهرەمەند بوون لێی.. هەرچەندە نابێ لەم بارەیەوە هەندێ کەم و کورتی نادیدە بگیرین. هێشتا سنوور و بە یاسایی کردنی پێویست بەشێوەیەکی کارامەو هەمەلایەنە بۆ دروست بوون و سەقامگیرکردنی بنەمای ئازادی فەراهەم نەبووە"[262] محەممەدی ری شەهری یش لە لێدوانێکیدا تەئکیدی لە سنووردار نەکردنی بڵاوکردنەوەی هەواڵ کردۆتەوە لە کۆمەڵداو دەڵێت: "دەبێ خەڵك لە رەوتی هەموو مەسەلەکاندا بن و سنووردارکردن و لە قالب دانی هەواڵەکان کێشەیەك چارەسەر ناکات. دەبێ هەمووان بە روونکردنەوەی تەواوەوە سەبارەت بە راستی و دروستی هەواڵەکان، زانیارییان لە بەردەستدا بێت"[263] ری شەهری لە لێدوانێکی دیکەدا تەئکیدی لە پێویستی بوونی رەخنەی بنیاتنەر کردۆتەوە لە چاپەمەنیەکانداو دەڵێت "رەخنەی بنیاتنەر لە چاپەمەنیەکاندا یارمەتی پاراستنی سەلامەتی دەزگا جیاوازەکان دەدات و لە دەزگاکانی پەیوەندی و راگەیاندنی وڵاتدا چاوەڕوان دەکرێ کە لە کەش و هەوایەکی تەندروست و ئازاددا، رەخنە لە کردەوەی دەزگاکانی جێبەجێکردن و داوەری و یاسادانان بگرن"[264].

ری شەهری لە بەرنامەکانی خۆیدا بۆ سەرکۆماری لەگەڵ تەئکیدکردنەوەی پشتیوانی لە ئازادی رادەربڕین و رەخنەی دروستکەردا دەڵێت "بۆ ئەم مەبەستە دەبێت لەم بوارانەی خوارەوەدا هەنگاو هەڵبگیرێ:

١-سیستمی راگەیاندن و زانیاری گەیاندن چاك بکرێ.

٢-دوورکەوتنەوە لە سانسۆری هەواڵ.

٣-پشتیوانی لە بڵاوکردنەوەی بیرو ئەندێشەی جیاواز بکرێ.

٤-پشتیوانی لە رۆژنامەو بڵاوکراوەو مافی ریزەکانیان بکرێ.

٥-هەوڵ بۆ رەواج پێدانی فەرهەنگی رەخنەی بنیاتنەر بدرێ"[265].

**٤-بەشداری سیاسی:**

ئەم گروپە تەئکید لە بەشداری سیاسی خەڵك دەکاتەوەو هەڵبژاردن بە دیارترین دیمەنی بەشداری سیاسی خەڵك دەزانێت. بڵاوکراوەی بەهاکان لەم بارەیەوە

---

[262] همان، شماره ٨، ٧٥/١١/١٥، ص٥.

[263] روزنامه سلام، ٧٥/١٢/١٩، ص٣.

[264] روزنامه اطلاعات، ٧٥/١٠/٨، ص٣.

[265] هفتەنامه ارزشها، شماره ١٩، ٧٦/٢/٢٩، ص١١.

دەنووسێت: "یەکێك لە ئەنجامە گرنگەکانی بەشداری سیاسی، فێرکردن و ڕاهێنانی گشتییە لە پێناوی پاراستن و پەرەپێدانی بەرژەوەندی نیشتمانیدا. خەڵك لە پرۆسەی بەشداری سیاسیدا بەرەبەرە فێردەبن کە بەرژەوەندییان لە ناو بەرژەوەندی گشتی و وڵاتدایە و هیچ کەسێ نابێ حسابی بەرژەوەندییەکانی خۆی لەسەر چارەنووسی کۆمەڵی سەربەخۆ بکات. لە ڕاستیدا هەڵبژاردن دیارترین دیمەنی بەشداری سیاسی خەڵکە لە تەگبیرکردنی موقەدەراتی کۆمەڵایەتی داو هەرچەندە ڕەوتێکی باشتر لەخۆ بگرێ، هەستی دەور بینینی خەڵك لەم پرۆسەی بەشداری کردنەدا بەهێزترو جدی تر دەبێ"[٢٦٦] ئەم بڵاوکراوەیە لە جێگایەکی دیکەدا تەئکیدی لە زەمینە خۆشکردن کردۆتەوە بۆ بەشداری خەڵك لە گۆڕانکارییە سیاسیەکانداو دەنووسێت "ئێستا لە سەردەمێکدا دەژین کە ڕۆڵی خەڵك لە قالبی یەکە دەوڵەتیەکان و کەرتی تایبەتیو ئەم جۆرە شتانەدا لە دیاری کردنی چارەنووسی کۆمەڵدا چەند ئەوەندەی جاران زیاترو گرنگتر بووە. بەم پێیە دەبێ هەوڵ بۆ زیادکردنی ئاسانکاری ئەم بەشدارییە بدرێ. لەسەر ئەم بنەمایە حزبە سیاسیەکان بە کابەری خۆیان لە قالبی یاساو خەباتی دیموکراسیدا، چەند بەرابەر چالاکی و ئارەزوو، کەش و هەوای پڕ جموجوڵ بۆ بەشداری سیاسی و کۆمەڵ فەراهەم دەکەن. بەشدارییەك کە پەرەپێدان و گەشەپێدانی کۆمەڵ بەرەو ئامانجە مادی و مەعنەوییەکان مەیسەر دەکات"[٢٦٧].

### ٥-ناردنە دەرەوەی شۆڕش:

کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان پشتیوانی لە ناردنە دەرەوەی شۆڕش دەکات. و بە توندی ڕەخنە لەو کەسانە دەگرێت کە لە سیاسەتی دەرەوەدا ڕێبازی میانەڕەویان گرتۆتە بەر: "سازش و پێکهاتن لەگەڵ دنیاخۆران و مامەڵەکردن لە گەڵیاندا لەسەر بەرژەوەندی ستەم دیدەکان، بەشێوەیەکی تایبەت لە مەسەلەی فەلەستیندا و بەیەك قسە دورکەوتنەوە لەبیری شۆڕگێڕانەو ئەندێشەی جۆشدانی خەڵك لەژێر ناونیشانی فریودەری هاوژیانی نێودەوڵەتی یان نەرم و نیانی مەدەنی شوێن پێ هەڵگرتنی

[٢٦٦] همان، شماره ٢٢، ٧٦/٣/١٩، ص٣.
[٢٦٧] همان شماره ١٤، ٧٦/١/٢٥، ص١١.

ڕەوت و کەسانێکە کە بە دوای محاڵی شۆڕش و گەڕاندنەوەی وابەستەیی هەمەلایەنەی گەلدا وێڵن"[268] هەروەها بڵاوکراوەی (ارزشها)ش لەم بارەیەوە دەنووسێت: "شۆڕشی ئیسلامی بۆ ئەوەیە کە.. بەرگری لە ماف و بەرژەوەندی گەلانی چەوساوە بکات و سەبارەت بە سەرمایە نیشتمانیەکانی خۆیان، هوشیاریان بکاتەوەو لە زۆر لایەنەوە بەکردەوە یارمەتیان بدات"[269] ئەم بڵاوکراوەیە لە جێگایەکی دیکەدا تەئکیدی لە فراوانکردنی ئەندێشەی شۆڕشی ئیسلامی کردۆتەوە، تەئکیدی لە چاوپێداخشانەوە بە ڕێبازی سیاسەتی دەرەوەو دەست پێ کردنی جوڵانەوەیەکی هێرش بەرانە کردۆتەوە لە پێناوی فراوانکردنی بیری شۆڕشی ئیسلامیدا"[270] هەروەها درێژەی دەداتێ کە "شۆڕشی ئیسلامی لەشێوەی داواکردنی مافی گەلانی چەوساوەدا شارەزایە"[271] ارزشها لە وتارێکیدا بە گرنگیدان بە فراوانکردنی شۆڕش لە چوارچێوەی نیزامدا، دژی تیوری (جیاکردنەوەی نیزام لە شۆڕش) وەستاوەتەوەو دەنووسێت "بەپێی ئەو تیورە نیزام بۆ ئەوەی بتوانێت لە چوارچێوەی نەریت و دیسپلینە نێودەوڵەتیەکاندا درێژە بە بوونی خۆی بدات و لە کێشەی سیاسی و ناسیاسی هەڵوێستی شۆڕشگێڕانە بەدوور بێ، وا باشترە نیزام لە ڕێگەی کەناڵی ڕەسمی و بەپێی یاساو ڕێسای نێودەوڵەتی پەیوەندی لەگەڵ تەواوی وڵاتاندا هەبێ و شۆڕشیش بەرەو پەرەپێدانی ئامانجەکانی شۆڕشی ئیسلامی ڕێگەی خۆی بگرێتە بەر. هیچ یەکێ لەم دوانەش ئەوی تر هەراسان نەکەن و هەریەکەیان باری بەرپرسیاریی خۆیان هەڵگرن. بەرای ئێمە ئەم بۆچوونە زۆر ترسناکەو هەتا بێ بەرنامەشە. جیاکردنەوەی نیزام لە شۆڕش جگە لە محاڵی نیزام و گۆشەگیرکردنی شۆڕش ئەنجامێکی دیکەی نابێ. شۆڕش دەبێ لە پانتایی نیزامدا فراوان و سەقامگیر بکرێ و ئەگەرنا دەبێتە ئامانجێکی بەدی نەهاتوو"[272].

محەممەدی ری شەهری لە چاوپێکەوتنێکدا ئێرانی وەکو (ام القری- مەککە)ی جیهانی ئیسلام باسکردو تەئکیدی لە پشتیوانی جوڵانەوە ئازادیخوازەکانی جیهان

---

[268] بیانیه شماره ۱، جمع دفاع از ارزشها.

[269] هفتەنامه ارزشها شماره ۲/ آبان،۷۵، ص۵.

[270] همان، شماره ۳، ۷۵/۹/۱، ص۱

[271] همان، ژماره ۷، ۷۵/۱۱/۱ ص۵..

[272] همان، شماره ۸، ۷۵/۱۱/۱۵، ص۵.

کردەوە. "ئێرانی ئیسلامی وەکو (ام القری- مەککە)ی جیهانی ئیسلام دەبێ پشتیوانی لە جولانەوە ئیسلامیەکانی سەرانسەری جیهان و ڕاپەڕینە جەماوەرییەکان بکات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ڕژێمە دیکتاتۆرەکانی فەرمان ڕەوای وڵاتان"[٢٧٣]

## ٦-ئامانج گەرایی: (ئامانجداری)

روحوڵای حسێنیان لە گفتوگۆیەکدا بە تەئکیدکردنەوە لەسەر ئامانج گەرایی بوونی ئەم کۆمەڵەیە دەڵێت: "ئێمە بۆ.. ئامانجداری شۆڕشی ئیسلامیمان کردو تۆوی سەرەکی شۆڕشی ئیسلامی بە گیان و ئامانج خوازییەکی لەمجۆرەوە فۆرمەڵە بوو، دەسەڵاتی گرتە دەست و بەردەوام بوو. بەم پێیە ئێمە (کۆمەڵەی بەرگری) بۆ داکۆکیکردن لەم ئامانجدارییە هاتینە مەیدانەوەو دە توانین بڵێین کە جیاکەرەوەی سەرەکی کۆمەڵە.. هەمان ئامانج خوازییە کە پەیامی شۆڕش، کورتەو ناوەرۆکی شۆڕش لەمەدا دەبینین"[٢٧٤].

ئەحمەدی پورنجاتییش لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ڕەتکردنەوەی کارکردنی ئێستای کۆمەڵە لەجیاتی ئامانجداری دوپاتی کردۆتەوە "بۆچوونەکانی ئێمە بنەمایەکی ستراتیجی هەیەو ئێمە بە هیچ جۆرێ باوەڕمان بەکارکردنی بێ ئامانج نەبووەو گرەنتی جێبەجێکردنی ئەو ئامانج و مەبەستانە نادەین کە لەگەڵ دیدگای ئسولیدا تەبانین"[٢٧٥].

محەممەدی ری شهریش لە گفتوگۆیەکدا تەئکیدی لە ئامانجداری ئەم گروپە کردۆتەوە و دەڵێت "کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی لە سەدا سەد ڕەوتێکی ئارمانییەو پشتیوانی بەدیهێنانی بەها شۆڕشگێڕانەو خوداییە"[٢٧٦]

---

[٢٧٣] روزنامە کیهان، ٧٦/٢/٢٩، ص٧.

[٢٧٤] روزنامە اطلاعات، ٧٥/١٠/١٦، ص١٢.

[٢٧٥] هفتەنامە ارزشها، شمارە١٩، ٧٦/٢/٢٩، ص٩.

[٢٧٦] ماهنامە صبح، شمارە ٤٦، ٧٤/١٢/٨.

## ب-بۆچوونەکانی کۆمەڵە سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوە:

### ١- پرانسیپەکانی سیاسەتی دەرەوە:

بەڕای ئەم گروپە کۆماری ئیسلامی ئێران دەبێ لە سیاسەتی دەرەکیدا بایەخ بە بەهاو ئامانجەکانی شۆڕشی ئیسلامی بدات. ئەم باڵە سیستمی ئێستای جیهانی قبوڵ ناکات و تەئکید لە (گۆڕینی سیستمی نێودەوڵەتی ئێستاو) مامەڵەی شۆڕشگێڕانە لە سیاسەتی دەرەوەدا دەکاتەوە[٢٧٧]. محەممەدی ری شەهری لە چاوپێکەوتنێکدا لەم بارەیەوە دەڵێت "ئێمە هەر جۆرە مامەڵەیەکی شەرمەزارانەو سازشکارانە لەگەڵ بیانیەکاندا بەتایبەتی لەگەڵ نوێنەرانی دەوڵەتانی ئەوروپاییدا بە توندی ڕەت دەکەینەوەو بە نیشانەی لاوازی فیکرو باوەڕی دەزانین. نەرمی نیشاندان لە وتووێژە سیاسیەکاندا بۆ ڕاکێشانی سۆزی بیانیەکان لە ڕوانگەی ئێمەوە خیانەتە لە ئامانج و بەهاکان.. لە پەیوەندییەکانی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا، پەرەپێدانی پەیوەندییەکان لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ و دروست کردنی پەیوەندییەکی لۆجیکی لەگەڵیاندا ئەولەویەتی یەکەمەو لە قۆناغی دواییدا دەبێ بایەخ بە پتەوکردن و پەرەپێدانی پەیوەندییەکانی ئێران بدەین لەگەڵ وڵاتە ئیسلامیەکاندا لەهەر خاڵێکی جیهاندا بن. ئێمە نابێ لە پەیوەندییە بازرگانیەکانماندا یان لە بازاڕی ناوخۆدا تەواو پشت بە ئەوروپا ببەستین، چونکە خۆرئاوا هێشتا درێژە بە سیاسەتە کۆلۆنیالیەکانی خۆی دەدات و ئێمە بۆ پەیوەندییەکی پایەدارو دڵنیایی بەخش ناتوانین پشت بە وڵاتە خۆرئاواییەکان ببەستین. کۆماری ئیسلامی ئێران دەبێ ڕوانینی خۆی لە ئەوروپاوە بگۆڕێ بەرەو ئەو وڵاتە گەورانەی جێی متمانەن لە ئەمریکای باشوور، ئەفریقا، ئاسیای مەرکەزی و باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیاو ڕادەی هاتوچۆی سیاسی و مامەڵەی ئابووری و بازرگانی خۆی لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپیدا بەخێرایی کەم بکاتەوە[٢٧٨]

ری شەهری لە بەرنامەکانی خۆیدا بۆ هەڵبژاردنی سەرکۆمار تەئکیدی لە (دامەزراندنی شارستانیەتێکی نوێی ئیسلامی) کردۆتەوەو دەڵێت: "سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگیانی سەربەخۆیی خوازی و دژی ئیستکباری

---

[٢٧٧] هفتەنامە ارزشها، شمارە ١٠، ٧٥/١٢/١٣، ص٤.

[٢٧٨] روزنامە کیهان، ٧٦/٢/٢٨، ص٧.

شۆڕشی ئیسلامیەوە سەری هەڵداوە کە هەر جۆرە دەسەڵاتخوازی و دەسەڵات قبوڵ کردنێکی ڕەت کردۆتەوەو پێویستە لە پێناوی گەشەکردنی کۆمەڵگا مرۆییەکان و فراوانکردنی فەرهەنگ و بەها پاکژەکاندا بە مەبەستی دروست کردنی شارستانیەتێکی نوێ خەبات بکەین.. پێویستە تەئکیدکردنەوە لەسەر بەها ئیسلامیەکان و ڕێزگرتن لە مافی بەرامبەر لە پەیوەندی و بڕیارە سیاسیەکاندا لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی بنەمای دیپلۆماسی وڵات بێ. هەروەها پێویستە بەرقەراری و پەرەپێدان و پتەوکردنی پەیوەندی لەگەڵ هەموو وڵاتە دۆستەکاندا، بەپێی ئەولەویەتی میللەتە مسوڵمانەکان، دراوسێکان و وڵاتە بێلایەنەکان بێ لەسەر بنچینەی ڕێزگرتن و بەرژەوەندی هەردولا"[٢٧٩].

## ٢- پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا:

ئەم گروپە هەر جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ ئەمریکادا ڕەت دەکاتەوەو (نابوتی نیزامی دەست درێژکاری ئەمریکا) بە ئامانجی شۆڕشی ئیسلامی دەزانێت. بڵاوکراوەی ارزشها لەم بارەیەوە دەنووسێت "پەیوەندی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ ڕژێمی ئەمریکادا پەیوەندی دو وڵات نیە کە تەنها ناکۆکیان لەگەڵ یەکتریدا هەبێت، بەڵکو مەسەلەی شۆڕشێکە کە لە بنچینەدا بوونی نیزامی باڵادەست قبوڵ ناکات، لەبەرئەوە لەگەڵ ڕژێمی دەست درێژکاری ئەمریکادا ناکۆکی زاتی هەیە. ئەمریکا بەدوای پەرەپێدانی مەیدانی نفوزی خۆیدا وێڵە لەسەر سەرچاوە ئابوورییەکانی جیهانی سێیەم و شۆڕشی ئیسلامی لە پێناوی داواکردنی مافی میللەتە چەوساوەکانی جیهاندا هەوڵ دەدات. ئەم دوو نیزامە چۆن دەتوانن کێشەکانی خۆیان یەکلایی بکەنەوە؟.. شۆڕشی ئیسلامی جگە لە لەناوبردنی نیزامی دەست درێژکاری ئەمریکا ئامانجێکی دیکەی نیە"[٢٨٠] ئەحمەدی پورنجاتیش لە لێدوانێکدا هەر جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ ئەمریکادا ڕەت کردۆتەوەو داوای بەرنامەداڕشتنی کردوە لە پێناوی نەبوونی پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکادا. "هەر جۆرە نەرم و نیانی و زەمینە خۆش کردنێك بۆ نزیك خستنەوەی پەیوەندییەکانی ئێران و

---

[٢٧٩] هفتەنامە ارزشها، شمارە ١٩، ٧٦/٢/٢٩، ص١١.

[٢٨٠] همان، شمارە١٠، ٧٥/١٢/١٣، ص٤.

ئەمریکا، خیانەتە لە ئامانجەکانی شۆڕشی ئیسلامی. ئێمە هەر جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ حکومەتی ئەمریکادا بەوە دەزانین کە قابیلی پەسەندکردن نییەو دژی دەوەستینەوە وەکو ئاراستەیەکی ستراتیجی، باوەڕمان وایە کە بەرنامەڕێژی وڵات دەبێ لەسەر بنەمای نەبوونی پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا ئەنجام بدرێ"[281]. کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی لە پرۆگرامی خۆشیدا تەئکیدی لە سیاسەتی رووبەڕووبوونەوەی ئەمریکا کردۆتەوە "سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران دەبێ بەردەوام رووبەڕووی سیاسەتی فراوانخوازی و زیادەخوازی دەسەڵاتە ئیستکبارییەکان بێتەوە، بەتایبەتی ئەمریکا"[282].

## کورتەی بۆچوونە سیاسییەکانی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی

١-وەلی فەقیە لەلایەن خوداوە دانراوە. پەسەندکردنی جەماوەری بۆ جێبەجێکردنی حوکمی وەلی فەقیە پێویستە.

٢-دەسەڵاتەکانی وەلی فەقیە لە سەروو دەستوورەوەیە.

٣-باوەڕیان بەوە هەیە کە شمولی سیاسی نیزام تەواوی ئەو هێزو رەوتانە بگرێتەوە کە باوەڕیان بە نیزام هەیە.

٤-باوەڕیان بەوە هەیە کە پێویستە چالاکی رێکخراوەی سیاسی لە چوارچێوەی ویلایەتی فەقیهو دەستووردا بێ.

٥-حزبەکان نابێ لە پرانسیپەکانی ئیسلام پاشگەز ببنەوە.

٦-باوەڕیان بەوە هەیە کە دانوستاندن و مامەڵەی ئەندێشەیی لە مەیدانی سیاسی کۆمەڵدا لە چوارچێوەی نیزام و ویلایەتی فەقیهو بەهاکانی شۆڕشدا بێت.

٧-هەمەرەنگی و فرە مینبەری لەناو نیزامدا قبوڵ دەکرێ.

٨-حزب و تاکەکەس لە چوارچێوەی ویلایەتی فەقیهو نیزامدا لە خستنەڕووی بۆچوونەکانی خۆیاندا ئازادن.

٩-ئەم گرووپە پشتگیری لە ناردنە دەرەوەی شۆڕش دەکات.

١٠-ئەم گرووپە پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکادا رەت دەکاتەوە.

١١-ئەم گرووپە کاری ئێستا رەت دەکاتەوەو تەئکید لە ئامانجداری دەکاتەوە.

---

[281] هەمان، ویژه انتخابات، ٧٦/٢/٢٤، ص٢.

[282] مرامنامه جمعیت دفاع از ارزشهای انقلاب اسلامی، فصل چهارم.

## ٢-٢-بۆچوونــه ئابوورییــەکانی کۆمەڵــەی بــەرگری لــە بــەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی

### ١-تایبەتی کردن:

ئەم گروپە دژی پاوانکردنی ئابوورییە لە دەستی دەوڵەتدا، بەڵام پشتیوانی لە تایبەتی کردن ناکات و بەو شێوەیەی کە یەکە ئابوورییەکان بەگروپێك بسپێردرێن کە دەوڵەمەندن و خوازیاری چەند رێوشوێنێکە بۆ سپاردنیان بە خەڵك بە گشتی. ئەحمەدی پورنجاتی دەڵێت "تایبەتی کردن دەبێت بە مەبەستی فراوانکردنی کۆمپانیا هەرەوەزیەکان و رێکخستنی سامان بێت بە قازانجی چینە چەوساوەکان. لەبەرئەوە ناکرێ بواری ئەوە بدرێ کە تایبەتی کردن لە پێناوی فۆرمەڵەبوونی پاوانکاریدا بۆ ژمارەیەکی کەم بەکاربێ یان دروست بوونی چەند کۆمپانیایەکی لێ بکەوێتەوە، کەلە ناوەرۆکدا بە کانگای ئابووری گەندەڵ لە قەڵەم دەدرێن"[٢٨٣]
محەممەدی ری شهری یش لەم بارەیەوە دەڵێت "وەرگرتنی کۆمپانیا لە دەوڵەت و سپاردنی بەچەند کەسێك، کێشەی ئابووری وڵات چارەسەر ناکات و ئەم مەسەلەیە نابێتە هۆی یەکسانی ئابووری لە کۆمەڵدا.. کەرتی دەوڵەتی و هەرەوەزی و تایبەتی تەواوکەری یەکترین.. پاوانکاری لە مەسەلە ئابوورییەکاندا دەبێ لە دەوڵەتەوە بگوێزرێتەوە بۆ خەڵك و بۆ ئەم مەبەستە، دەوڵەت دەبێ زەمینەی پێویست بۆ رێکخستنی توێژە چەوساوەکان خۆش بکات لە کۆمپانیا هەرەوەزیەکانی بەرهەم هێنان و دابەشکردندا[٢٨٤]

کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی لە بەیاننامەیەکدا نووسیوویەتی:

"ئابووری نیشتمانی کاتێك دێتە بەر کە لە سەر بنەمای گەشەکردنی بەرهەمی نیشتمانی بنیات نرابێ و لەگەڵ بەشداری واقیعی خەڵکدا جڵەوگیری لە سەرهەڵدانی پاوانکاری لە کەرتی تایبەتیدا بکات"[٢٨٥]

---

[٢٨٣] روزنامه اطلاعات، ٧٥/١٠/١٢، ص٣.

[٢٨٤] همان، ٧٥/١٢/٨، ص٢.

[٢٨٥] بیانیه شماره ١ جمعیت دفاع از ارزشهای انقلاب اسلامی.

لەم بارەیەوە محەممەدی ری شهری دەڵێت: "ئەگەر ئینحسار لە دەستی دەوڵەت دەربێنین و بیگوێزینەوە بۆ توێژێکی تایبەتی، لە راستیدا کارێکمان بۆ خەڵك ئەنجام نەداوە. چونکە خەڵك بەگشتی دەبێ بتوانن لە ئابووری ئازادی دەوڵەت بەهرەمەندبن"[286] محەممەدی شەریعەتمەداری ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانیش بۆ بەشداری خەڵك بەگشتی لە ئابووریدا پێشنیازی (میکانیزمی هەرەوەزی) دەکات"[287].

هەروەها ئەم گروپە دژی سیاسەتی (تەعدیلە)، لەم بارەیەوە محەممەدی ری شهری دەڵێت: "سیاسەتی (تەعدیل) تەنها لە ١٧ وڵاتدا پەیڕەو کراوە کە ئەوەش جۆرێك دیکتاتۆری لەگەڵدا بووە"[288] سپاردنی پیشەسازی قورسیش بە کەرتی تایبەتی لە روانگەی ئەم گروپەوە رەت کراوەتەوە. پورنجاتی لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئێمە بە توندی دژی هەراج کردن و سپاردنی بێ بەرنامەی پیشەسازی قورسین بە کەرتی تایبەتی و زیاتر گۆڕینی کەرتی دەوڵەتی بە کەرتی هەرەوەزی بە باش دەزانین و باوەڕمان وایە کە دەبێ بە شێوەیەکی جدی مامەڵە لەگەڵ سەرمایەداری کەرتی تایبەتیدا بکرێ"[289].

## ٢- پەرەپێدان:

ئەم گروپە تەئکید لەسەر پەرەپێدان دەکاتەوە بە مەرجێ لەسەر بەهاکان بنیات نرابێ، بەپێی بۆچوونی ئەمانە، بەهاکان لە پێش پەرەپێدانەوەیە. دەربارەی ئەم بابەتە محەممەدی ری شهری بەم شێوەیە ڕای خۆی دەردەبڕێ: "ئەگەر داکۆکی لە بەهاکان بکەین.. دەگەینە پەرەپێدانیش بەڵام بە بەدواداچوونی پەرەپێدان ناگەینە بەهاکان"[290] بەپێی ئەم بۆچوونە کۆمەڵەی بەرگری لە بەیاننامەیەکدا مۆدیلی ئابووری بازاڕی ئازادو مەرکەزی کۆن رەت کردۆتەوەو دەڵێت:

---

[286] هفتەنامه ارزشها، ویژه انتخابات، ٧٦/٢/٢٤، ص٤.

[287] همان، شماره ١٥، ٧٦/٢/١، ص٩.

[288] دو هفتەنامه عصرما، شماره ٦٦، ٧٦/١/٢٣، ص٧.

[289] هفتەنامه ارزشها، شماره ١١، ٧٤/١٢/٢٠، ص٢.

[290] ماهنامه صبح، شماره ٤٧، ٧٤/١٢/١٥، ص٨.

"بە هەمان شێوە کە مۆدیلی پەرەپێدانی کۆمەڵگا بەناو گەشەکردووەکان، چ خۆرئاوایی و خۆرئاواخواز، ناتوانێ نموونەی پێویست بێ، ڕێگەچارەی شێوە دروشمی تایبەت بە نموونەی پەرەپێدانی ئابووری مەرکەزی دەوڵەتیش لە بابەتی ئەوەی لە بلۆکی خۆرهەڵاتی پێشوودا هەبوو، هەروەها ڕێگە چارەو پێشنیازە ئابوورییەکانی تایبەت بە سەردەمی قاجار گرێی کێشە ئابوورییەکانی ئێمە ناکاتەوە"[291].

ئەم گروپە بۆ بەدیهێنانی پەرەپێدانی ئابووری وڵات پێشنیازی مۆدیلێکی ئابووری تایبەتی ناکات "بەڕای ئێمە نە سەقامگیرکردنی ڕەهاو نە هاوسەنگ کردنی ڕەها هیچیان ڕاست نین و دەبێ بەپێی دەستوور لە چوارچێوەی ڕێنماییەکانی مەقامی ڕەهبەریدا کار بکرێ بۆ ئەوەی بگەینە بەرنامەیەکی دیاریکراو بۆ پەرەپێدان"[292].

### ٣- نموونەی ئابووری:

ئەم گروپە پشتگیری لە نموونەی (پشت بەخۆبەستنی ئابووری) و (ئیکتفای زاتی) دەکات و بۆ بەدەست هێنانی سەربەخۆیی ئەم دوانە بە پێویست دەزانێت. بڵاوکراوەی ارزشها لەم بارەیەوە دەنووسێت "ئەگەرچی مەفهومی سەربەخۆیی ئابووری بچڕانی پەیوەندی ئابووری لەگەڵ دنیای دەرەوە و گۆشەگیری نییە لەسەر گۆڕەپانی ئابووری نێودەوڵەتی، بەڵام بەگشتی دەبێ پشت بەخۆبەستنی ئابووری وەکو یەکێك لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی سەربەخۆیی لێك بدرێتەوە"[293] ارزشها درێژەی دەداتێ و دوپاتی دەکاتەوە "ئێستا ئەگەر کەمێك فشارمان بخرێتە سەر، لەم بارەیەوە دەتوانێت ببێتە پێشەکیەك بێ بۆ سەربەخۆیی زانستی و پیشەسازی و پشت بەخۆبەستنمان و ئەمەش بۆ خۆی بەهایەکی خودایە کە ئێمە بتوانین بە پشت بەخۆبەستن، نەك تەنها بەهەموو ئەوانە بگەین کە خۆرئاواییەکان بەدەستیان هێناوە، بەڵکو لەو قۆناغەش زیاتر پێ هەڵگرین"[294]

---

[291] بیانیه شماره ١، جمعیت دفاع از ارزشهای انقلاب اسلامی.

[292] هفتەنامه ارزشها، شماره ٢، ابان ٧٥، ص٩.

[293] هفتەنامه ارزشها، شماره ٨، ٧٥/١١/١٥ ص٥.

[294] همان، شماره ١، مهر ٧٥، ص١٣.

هەروەها کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی لە بەیاننامەیەکدا تەئکیدی لە سیاسەتی "پشت بەخۆبەستنی ئابووری" کردۆتەوەو دەڵێت "ئەگەر سیستمی پیرۆزی کۆماری ئیسلامی ئێران دەستی لە تایبەتمەندییە هەرە رەسەنەکانی خۆی واتە، ئاین پەروەری، میحوەری خودا، ئسولیەت، دژایەتی ئیستکبار، سروشت ئازاد، دادپەروەری خوازی، رەت کردنەوەی دەسەڵاتی سەرمایە، پشت بەخۆبەستنی ئابووری لە بەرهەمی نیشتمانی‌دا هەڵدەگرت؛ بێگومان زۆر لە کێشەو کەم و کورپیە ئابوورییەکانی لە رێگەدا نەبوو"[٢٩٥] روحوڵلای حسێنیانیش تەئکید لە گەیشتن بە خۆبژێوی ئابووری کردۆتەوەو دەڵێت "ئەگەر ئێمە.. سیاسەتی خۆبژێوی و سەربەخۆیی ئابووری پەیڕەو بکەین و سەرمایە گوزاری بۆ بەرهەمی زیاتر بکەین، چونکە شۆڕشەکەی ئێمە پەیامێکی شۆڕشگێڕانەی هەیە، رەنگە هەر رۆژە رووبەڕووی کێشەیەکی دەرەکی ببینەوە، بۆیە حکومەتی دوایی دەبێ بەرنامە بۆ خۆبژێوی دابنێت و کاربکات"[٢٩٦] هەروەها محەممەدی ری شەهری‌ش بە تەئکید کردنەوە لە سیاسەتی (پشت بە خۆ بەستن) دەڵێت "ئەوە بەها نی‌یە کە ئێمە موچەخۆری پیشەسازی خۆرئاوا بین، کۆمەڵگای ئیسلامی دەبێ پشت بەخۆی ببەستێ"[٢٩٧]

٤-سوود وەرگرتن لەسەرچاوەی دەرەکی:

ئەم گروپە بەتەواوەتی کەڵك وەرگرتن لەسەرچاوەی دەرەکی رەت ناکاتەوەو لە حاڵەتێکدا کە ئەم سەرچاوانە لە پێناوی پتەوکردنی ژێرخانی ئابووری وڵاتدا خەرج بکرێن، بە شتێکی جایزی دەزانێت، ئەحمەدی پورنجاتی لەم بارەیەوە دەڵێت "قەرزکردن، کاتێك پێویستە کە لە پێناوی پتەوکردنی ژێرخانی ئابووری وڵاتدا بەکاربێ. بەم پێیە ئەگەر قەرز بۆ پەرەپێدانی بازاڕی بەکاربردن و پەرەپێدانی پیشەسازی مونتاژ، بەسەرەتایی ترین شێوەی بەکاربێ، ئەم مەسەلەیە بە زیانی وڵات تەواو دەبێ"[٢٩٨].

---

[٢٩٥] بیانیه شماره ١ جمعیت دفاع از ارزشهای انقلاب اسلامی.

[٢٩٦] ماهنامه صبح، شماره ٦٦، بهمن ٧٥، ص٢٠.

[٢٩٧] هفتەنامه ارزشها شماره١، مهر ٧٥، ص١٣.

[٢٩٨] همان، شماره ٦، ٧٥/١٠/١٥، ص٣.

### ٥-دادپەروەری کۆمەڵایەتی:

ئەم گروپە باوەڕی وایە کە دادپەروەریی کۆمەڵایەتی "گوێزانەوەی دەسەڵات و توانا" نیە لە چینێکەوە بۆ چینێکی دیکە، بەڵکو مەبەست لە گەیاندنی "مافە بە خاوەن ماف". بڵاوکراوەی ارزشها ئاماژەی بۆ فۆرمەڵە بوونی چینێکی تازە کردووە لە نیزامی کۆماری ئیسلامیداو دوپاتی دەکاتەوە کە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم ئافاتە گەورەیە دەبێ تا (زۆر درەنگ) نەبووە "چارەیەکی کارساز" بدۆزرێتەوە.. ".. ڕەوەندی دادپەروەری کۆمەڵایەتی لە نیزامی ئێمەدا.. گیرۆدەی ئافاتێکی ترسناك بووە. ئەم ئافاتە ترسناکە لەژێر ناونیشانی سەرهەڵدانی چینێکی نوێدا خۆی دەنوێنێ کە نەك تەنیا بە نیشانەی دەسەڵاتی ئابووری بەڵکو بە نیشانەی دەسەڵاتی سیاسی و ئابووریش قابیلی ناسینەوەیە. دەبێ نیزام بۆ بەربەرەکانیی لەگەڵ ئەم ئافاتە گەورەیەدا ئەندێشەی شۆڕشی ئیسلامی وەکو چارەیەکی کارساز ببینێ و ئەگەر نا ڕەنگە لە ئایندەدا زۆر درەنگ بێ"[299] محەممەدی ری شەریش لەم بارەیەوە دەڵێت "یەکێك لە ئەولەویەتە ئابوورییەکانی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان، ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ چینی دەوڵەمەندی نوێدا کە لە ڕێگەی نامەشروعەوە، دەوڵەمەند بوون مامەڵەی بێ چەندو چون و یاسایی و شەرعی لەگەڵ سامانی بەتاڵان براو لە (بيت المال) و ئەو سامانانەی کە بە شێوەی ناشەرعی بەدەست هاتوون. لە ئەولەویەتەکانی دیکەی ئەم کۆمەڵەیەن"[300].

## کورتەی بۆچوونە ئابوورییەکانی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی

١-ڕازی نەبوون بە پاوانکردنی ئابووری لە دەستی دەوڵەت و کەرتی تایبەتیدا، تەئکید کردنەوە لەسەر بەشداری خەڵك بە گشتی لە چالاکی ئابووریدا لە ڕێگەی کۆمپانیا هەرەوەزییەکانەوە.

٢-ناڕازی بوون بە سیاسەتی تەعدیلی ئابووری.

---

[299] ماهنامه صبح، شماره ٦٩، اردبهشت ٧٦، ص١٣.

[300] ماهنامه صبح، شماره ٦٩، اردبهشت ٧٦، ص١٣.

٣-تەئكیدكردنەوە لەسەر پەرەپێدان بەمەرجێ لەسەر بەهاكان بنیات نرابێ.
٤-پشتیوانی لە نموونەی پشت بەخۆبەستن و خۆبژیوی ئابووری.
٥-كەڵك وەرگرتنی مەرجدار لەسەرچاوەی دەرەكی.
٦-دادپەروەری كۆمەڵایەتی بە گەیاندنی ماف بە خاوەن ماف دەزانێت نەك بە جێگۆڕكێی تواناو دەسەلات.

## ٣-٢-بۆچوونە فەرهەنگیەكانی كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكانی شۆڕشی ئیسلامی.

### ١-سانسۆر لەسەر چالاكیە فەرهەنگیەكان:

ئەم گروپە پشتیوانی لە سانسۆر دەكات بەر لە بلاوكردنەوەی بەرهەمە فەرهەنگیەكان. بلاوكراوەی ارزشها پشتیوانی لە سانسۆری چاپی كتێب كردووەو چەند پێشنیازێكی لە پێناوی باشتر ئەنجام دانی ئەم كارەدا خستۆتە روو: "لێكۆڵینەوەی كتێب بە حسابكردن بۆ جۆری بابەت، ئاستی فەرهەنگی بەرهەمەكە، پێشینەو توانای نووسەر یان وەرگێڕ، پێویستیەكانی خوێنەری بەرهەمەكەو لە هەمووشی گرنگ تر لە چوارچێوەیەكی پراكتیكیدا لەگەڵ دیسپلیندا، تەنها لەدەست تیمێكی لێكۆڵەرەوە دێت و مەفهومی ئەم بۆچوونە جگە لە پسپۆڕی لە لێكۆڵینەوەی كتێبدا شتێكی دیكە نییە"[301].

### ٢-ئەولەویەت بۆ فەرهەنگ:

ئەم گروپە بە بەراورد لەگەڵ مەسەلە سیاسی و ئابوورییەكان ئەولەویەت بە مەسەلە فەرهەنگیەكان دەدات "مەسەلە فەرهەنگیەكان گرنگترین مەیدانی مەسەلەكانی نیزامەو دەبێ لە پێشەوەی ئەولەویەتەكانیەوە دابنرێ"[302].

ئەحمەدی پورنجاتیش لە لێداونێكدا تەئكیدی لەم بۆچوونە كردۆتەوەو دەڵێت: "گۆڕانی بنەڕەتی لە فەرهەنگدا، ئامانجی بنچینەیی شۆڕشی ئیسلامی بوو.. ئەنجامدانی هەر جۆرە گۆڕانكارییەك لە بنەمای سیاسیدا، هەروەها ریفۆرمی

---

[301] هفتەنامە ارزشها، شمارە ٢، ابان ١٣٧٥.

[302] همان، شمارە ٦، ٧٥/١٠/١٥، ص٢.

ئابووری لە دوای گۆڕانێکی بنەڕەتی فەرهەنگی لە تواناداپەو ئەم گۆڕانە دەبێ لەهەر سێ بواری گۆڕانی بەهاکان، گۆڕانی بۆچوونەکان، چاکردنی رەفتارو شێوازەکاندا روو بدات"[302].

### ٣-ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی:

کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان باوەڕی بە ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی نییە لەگەڵ خۆرئاواداو سەبارەت بە هێرشی فەرهەنگی نیگەرانیەکی زۆر دەردەبڕێ. محەممەد ری شەهری لەم بارەیەوە دەڵێت "سەرەنێزەی هێرشی دوژمن ئەمڕۆ ئاراستەی فەرهەنگێ کراوە کە شۆڕشی ئیسلامی هێنایە ئاراوە.. پیلانی نەخشە داڕێژراوی دوژمن ئەوەیە کە فەرهەنگی بەهاداری ئەم شۆڕشە بداتە بەر هێرش. لەم هێرشەدا، ئەمریکا وەکو شەیتانی گەورە بەتەنیا نییە بەڵکو هێزە وەسوەسەگەرەکانی ناوخۆش هاوڕێیەتی دەکەن"[304].

ئەحمەد پورنجاتیش لەم بارەیەوە دەڵێت "هێرشی فەرهەنگی لە دژی ئێرانی ئیسلامی مەسەلەیەکی جدی و راستەقینەیەو سەرنجدان لە ماهیەتی فەرهەنگی شۆڕشی ئیسلامی، گۆتەی هێرشی فەرهەنگی بە تەگبیرێکی تایبەتی دوژمنانی ئیسلام دەزانین لە دژی گەلی شۆڕشگێڕی مسوڵمانی ئێران"[305]. کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان لە بەیاننامەیەکدا دەنووسێت "گوێ نەدان بە هێرشی فەرهەنگی و بایەخ دان بە گرووپی بێ ناسنامە لە بواری فەرهەنگ و ئەندێشەدا چەند جێگایەکی هەڵخلیسکانن کە پەرلەمانی خولی پێنجەم دەبێ بە شێوەیەکی جدی لێیان دووربکەوێتەوە"[306].

ئەم کۆمەڵەیە لە بەیاننامەیەکی دیکەدا تەئکیدی لە رووبەڕووبوونەوەی هێرشی فەرهەنگی دوژمن کردۆتەوەو دەڵێت: "باوەڕی عەمەلی بە رووبەڕووبوونەوەی هێرشی

---

[303] همان، شماره ٧، ١/١١/ ٧٥/ ص٣.

[304] همان، شماره ٨، ٧٥/١١/١٥، ص٦.

[305] همان، ویژه انتخابات ٧٦/٢/٣١، ص٣.

[306] بيانيه شماره ١، جمعيت دفاع از ارزشهای انقلاب اسلامی.

فەرهەنگی دوژمن و بەیەك قسە پارێزگاری ئازایانە لە سنوورەکانی باوەڕی شۆڕشی لە بەرامبەر شەپۆلە ژەهراویە فکری و نیمچە فەرهەنگیەکاندا لە تایبەتمەندیە گرنگەکانی نوێنەری پێویستی ئێمەیە"[٢٠٧]

بڵاوکراوەی ارزشهاش دەنووسێت "هێرشی فەرهەنگی، جوڵانەوەیەکی ڕێکخراوی ئیستکباری دنیای خۆرئاواو بەتایبەتی ئەمریکایە بۆ سڕینەوەی ناسنامەی فەرهەنگی کۆمەڵگا سەربەخۆو خاوەن فەرهەنگە خۆماڵیەکان، بەتایبەتی بە ئاراستەی بەربەرەکانیی شەپۆلەکانی فەرهەنگی شۆڕشی ئیسلامی. گرنگترین ڕێگا دیارەکانی هێرشی فەرهەنگی بریتین لە: هەوڵی بەردەوام و هەمەلایەنە بۆ ڕەت کردنەوەی سەرەتای ئەندێشەی شۆڕش و کارامەیی و توانای سیستمی کۆمەڵایەتی بنیات نراو لەسەر باوەڕی ئاینی (پاکژی ئیسلام) بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵگای ئەمڕۆ. مەیدانی سەرەکی هێرشی فەرهەنگی بریتییە لە بواری بەرهەم هێنان و بڵاوکردنەوەی ئەندێشە "تیورو تیورکاری" بە تایبەتی لە بواری روناکبیری و راگەیاندندا"[٢٠٨] لە پرۆگرامی کۆمەڵەشدا بە تەئکیدکردنەوە لەسەر هێرشی فەرهەنگی خۆرئاوا هاتووە "هێرشی فەرهەنگی لە دژی بەها فەرهەنگیە پاکژەکانی ئیسلام، راستیەکە و نکوڵی لێ ناکرێ. ئەنگێزەو ئامانجی سەرەکی فەرهەنگی (دژی دین) لە بواری پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکاندا، بریتییە لە دروست کردنی قەیرانی ناسنامە لە پێناوی یەکسان کردنی فەرهەنگی، ڕووبەڕووبوونەوەی تایبەتمەندی شۆڕشی خاوێنی ئیسلامی، رەواج دان بە بیری جیایی دین لە سیاسەت و بڵاوکردنەوەی گەندەڵی ئەخلاقی و فەرهەنگی نزمی خۆرئاوایی و دزێوییەکانی لەناو لاوانی کۆمەڵگاکاندا بەتایبەتی لە کۆمەڵگا ئیسلامیەکاندا"[٢٠٩].

## ٤-ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشی فەرهەنگی:

بە باوەڕی ئەم گروپە یەکگرتنی فەرهەنگی باشترین شێوەی ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشی فەرهەنگیيە.

---

[٢٠٧] بیانیە شمارە ٢، جمعیت دفاع از ارزشهای انقلاب اسلامی

[٢٠٨] هفتەنامە ارزشها، شمارە ٦، ١٥/١٠/٧٥.

[٢٠٩] مرامنانە جمعیت دفاع- فصل دوم.

بەپێی بڵاوکراوەی ارزشها "گرنگترین و کاریگەرترین شێوەی ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشی فەرهەنگی بریتی‌یە لە ئاشکراکردنی ئامانج و شێوازەکانی و وەڵامدانەوەی فەرهەنگی‌ی هەموو ئەو مەسەلە بنەڕەتیانەی کۆمەڵ کە دەشێ دوچاری هێرش بێن"[310]

ڕوحوڵڵای حسێنیان بە تەئکیدکردنەوە لە پارێزگاری "جۆش و خرۆش و چالاکی سەرەتایی شۆڕش" لەنێو خەڵکدا دەڵێت:

"هەتا ئامۆژگاری رادیو و تەلەفزیۆن کە دەکرێ سود لەو بەرنامانە وەربگرن کە لە مێشکی خەڵکدا جۆرێك لەخۆ فەرامۆش کردن یان شۆڕشی فەرامۆش کردن دروست دەکەن بۆ ئەوەی روو لە ژیانی ئاسایی خۆیان بکەن. حکومەتی ئایندە دەبێ سەرمایەگوزاری بۆ ئەوە بکات تا هەمان جۆش و خرۆش و چالاکی سەرەتای شۆڕش دروست بێتەوە"[311].

## ٥-سانسۆری روحانیەکان بەسەر چالاکیە فەرهەنگیەکانەوە:

ئەم گروپە پشتیوانی لە سانسۆری روحانیەکان دەکەن بەسەر چالاکیە فەرهەنگیەکانەوە. روحوڵڵای حسێنیان لەم بارەیەوە دەڵێت "چ کێشەیەکی تیایە کە ئێمە لەجیاتی ئەو سەرمایە گوزارییە گەورانەی لە مەڵبەندە فەرهەنگیەکاندا دەیکەین ئەم سەرمایەگوزارییانە بەرەو مزگەوتەکان ئاراستە بکەین، بۆ ئەوەی مەرکەزیەتی مزگەوت بۆ کۆبوونەوەی لاوان لەناو نەچێت"[312].

کورتەی بۆچوونە فەرهەنگیەکانی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی

١-پشتیوانی لە سانسۆر دەکەن بەر لە بڵاوکردنەوەی بەرهەمە فەرهەنگیەکان.

٢-ئەولەویەت دان بە مەسەلە فەرهەنگیەکان بە بەراورد لەگەڵ مەسەلە سیاسی و ئابوورییەکاندا.

٣-هێرشی فەرهەنگی وەکو مەترسیەك بۆ شۆڕشی ئیسلامی لێك دەدەنەوە.

٤-یەکگرتنی فەرهەنگی وەکو باشترین شێوەی ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشی فەرهەنگی.

٥-پشتیوانی لە سانسۆری روحانیەکان دەکەن بەسەر چالاکیە فەرهەنگیەکانەوە.

---

[310] هفتەنامە ارزشها، شمارە ٦، ٧٥/١٠/١٥، ص٤.

[311] ماهنامە صبح، شمارە ٦٦، بهمن ٧٥.

[312] همان، ص٢٠.

## هەڵوێستە سیاسی و ئابووری و فەرهەنگیەکانی گروپی پەیامی خوێندکار

### ١-٢-هەڵوێستە سیاسیەکانی یەکێتی ئەنجومەنە ئیسلامیە خوێندکاریەکان و خوێندکارانی زانکۆو مەڵبەندەکانی خوێندنی باڵا.

### "پەیامی خوێندکاران"

**ئەلف: تێڕوانینیان سەبارەت بە حکومەت:**

بە درێژایی کات چەند گۆڕانکاریەك لە تێڕوانینی ئەم گروپەدا سەبارەت بە رابەری و ویلایەتی فەقیە بەدی دەکرێ. بە جۆرێك کە ئەم گروپە لە سەرەتای کارکردنی‌دا، رۆڵێکی گەورەی بۆ رابەری دادەنا لە نیزامی سیاسی‌دا و بە (سیاسەت داڕێژەری واقیعی) نیزامی دەزانی. بڵاوکراوەی (پیام دانشجو)ی ئۆرگانی یەکێتی لەم بارەیەوە نووسیوویەتی: "چ لە رووی شەرعی و چ لەرووی یاسایی‌یەوە، مەسئولی سەرەکی کۆمەڵگای ئیسلامی و سیاسەت داڕێژەری واقیعی هەمان مەقامی شکۆداری ویلایەتە"[٣١٣] بەڵام ماوەیەك دوای ئەوە حیشمەتوڵلای طبرزدی سەرۆکی یەکێتی، بە پیرۆز زانینی کەسێك یان گروپێکی تایبەتی رەت کردۆتەوەو دەڵێت: "بەشێك لە کۆمەڵ فەرمان رەوایی و دەسەڵات بە پیرۆز دەزانن بەو مەعنایەی کە فەرمان رەوایی، مەسەلەیەکی خودایی‌یەو خواوەند بە کەسێك یان گروپێکی تایبەتی بەخشیووە و کەسانی دیش شەرعیەتی خۆیان لەوانەوە وەردەگرن ئەم دەربڕینە کاتێك بە کردەوە جێبەجێ کرا؟ پاوانکاری لێکەوتەوەو هەموو مەسەلەکانی دەسەڵات و فەرمان رەوایی کەوتە دەست کۆمەڵێکی تایبەتی"[٣١٤] هەروەها بڵاوکراوەی (پیام دانشجو) لە بارەی هەمان بابەتەوە دەنووسێت "هیچ کەسێك یان گروپ و چین و باڵ و رەوتێك.. ناتوانێت ئیدیعای هەڵبژێردراوی یان نوێنەرایەتی خودا بەسەر خەڵکدا بکات. بەتایبەتی ئەگەر بیەوێت ئەم نوێنەرایەتیە وەکو مافێکی پاوانکراوی تایبەتی بۆ حکومەت کردن بەسەر خەڵکدا بەکاربێنێ"[٣١٥]

---

[٣١٣] هفتەنامە دانشجو، شمارە ٧، ٧٣/٧/١٨، ص١١.

[٣١٤] اظهارات طبرزدی در ٧٦/٢/١٦.

[٣١٥] هفتەنامە پیام دانشجو شمارە ٤٧، ٧٤/١٢/١٠، ص١٤.

طبرزدی پێشان گوتبووی "ئێمە باوەڕمان بە ئیمامەت هەیە، واتە هەمان ئەو ئیمامەتەی کە ئیمامی عەلی (د.خ) پێکی ێنا. وەلی فەقیهیش دەتوانێت هەمان ئەو دەسەلاتانەی هەبێت"[314] بەلام کەمێك دوای ئەوە "دەسەلاتەکانی وەلی فەقیهی لە چوارچێوەی دەستووردا" بینی، طبرزدی دەلێت "رای ئیمام ئەوەبوو کە سنووری دەسەلاتەکانی حکومەتی ئیسلامی رەهایە نەك ئەوەی کە دەسەلاتەکانی تاکە کەس بێ سنوور بێ. دەسەلاتەکانی وەلی فەقیه لە سنووری مادەکانی دەستووردایە"[315] هەروەها درێژەی دەداتێ: "نیزامی کۆماری ئیسلامی لە رای خەلکەوە شەرعیەتی بەدەست دێنێ و مەقامی رابەریش بە دەنگی خەلك هەلدەبژێردرێ و شەرعیەت پەیدا دەکات"[316].

ئەم گروپە لە رابردوودا، باوەڕی بە جۆرێك لە پیرۆزی هەبوو بۆ رابەریی بەشێوەیەك هەتا رەخنەی رۆژنامەی (سلام)یشی قبول نەبوو سەبارەت بەوەی کە دەشێ رەخنە لە رابەریش بیگرێ و ئەویش بێگوناهو بێ هەلە نیە"، باسکردنی ئەم مەسەلانەشی بەوە دەزانی کە دەبنە مایەی (خۆشحالی ئەمریکا)[317]، بەلام پاشان (پیام دانشجو) دەنووسێت ".. ئیمام (د.خ) فێری کردین و فەرمووی هەتا ئەگەر منیش پێم خوار دانا، دەبێ میللەت چاودێربێ"[318].

بە شێوەیەکی گشتی سەبارەت بە دەوری خەلکیش لە حکومەتدا تێڕوانینی جیاواز لەم گروپە بەدی دەکرێ. تا ئەو شوێنەی کە رۆژگاری (پیام دانشجو) نووسیوویەتی "خواست و ئیرادەی خەلك بە قالبی شەرعی هەلدەسەنگێنرێ"[319] کە بە پێی ئەم بۆچوونە رای خەلك هەتا ئەو شوێنە قابیلی قبولە کە لەگەل شەرعدا بگونجێ. بەلام پاش ماوەیەك، لە جێگایەکی دیکەدا (رای میللەتی بە مەسەلەیەکی

---

[314] همان شماره ٥٠، ٧٥/١/١٤، ص١٢.

[315] اظهارات طبرزدی در ٧٦/٢/١٦.

[316] دوهفته نامه شلمچه، پیش شماره دوم، نیمه اول دی ٧٥، ص٢.

[317] هفتەنامه پیام دانشجو، شماره ١٨، ٧٣/١٠/٦، ص١٦.

[318] همان شماره ٤٧، ٧٤/١٢/١٠، ص٦.

[319] همان شماره ٤، ٧٣/٦/٢٨، ص٣.

ئاینی" هەڵسەنگاندووەو دەنووسێت "بنچینەی خواست و رای میللەت مەسەلەیەکی رەسەنی ئایینی و یاسایی‌یە کە لە دەسکەوتە بنچینەییەکانی شۆڕشی ئیسلامی دەژمێردرێ"[320] ئەم بڵاوکراوەیە بۆچوونەکانی خەڵك بەمافی خۆیان و بە بنچینەی کۆمەڵایەتی ئیسلام دەزانێت"[321] بە پێچەوانەی بۆچوونی یەکەمەوە ئاماژە بۆ ئەم بابەتە دەکات کە حەزرەتی عەلیش (ر.خ) خواستی خەڵکی بە بنەمای حکومەتەکەی خۆی زانیووە. بۆ تەئیدکردنی ئەم بابەتە دەنووسێت: "لە سەرەتای ئیسلامدا کەسێکی کامڵ تر لە عەلی (ر.خ) نەبووە. بەڵام هەمان ئەم مرۆڤە کامڵە هیچ کاتێ بە تەواوی کامڵیەکەی خۆی، بە مۆڵەتێك نازانێ بۆ حکومەت کردن بەسەر کەسانی دی‌دا، بەڵکو رازی بوون و خواستی خەڵکی بە بنەمای حکومەتی مەدەنی خۆی زانیوە"[322].

### ٢-حزبایەتی:

ئەم گروپە پشتیوانی لە یاسایی کردنی چالاکی سیاسی دەکات لە چوارچێوەی حزبەکاندا. سەرنووسەرو دەستەی نووسەرانی هەفتەنامەی پیام دانشجو لە نامەیەکدا بۆ سەرکۆمار ئاماژە بۆ ئەو خاڵە دەکەن کە "لەبەر نەبوونی حزب و رێکخراو، خەڵك بیروڕای خۆیان سەبارەت بە مەسەلەکانی وڵات لە ریزی وەرگرتنی خواردەمەنی و لە پاس و تەکسی و دانیشتنی ناوماڵدا.. دەردەبڕن"[323] بڵاوکراوەی (پیام دانشجو)ش تەئکیدی لەوە کردۆتەوە کە (خەڵك دەبێ لە قاڵبی ئەو حزب و گروپانەی کە لەناو خۆیانەوە هەڵقوڵاوەو (هیچ پەیوەندییەکیان بە دەوڵەتەوە نی‌یە) بیروڕاکانی خۆیان دەربڕن"[324].

بە قسەی طبرزدی "ئەگەر گروپە و حزبی چالاك لە کۆمەڵدا نەبن.. رەوتێکی زیان بەخش لە ئارادایە کە لە ناسیاسی بوونەوە سەرچاوە دەگرێ"[325] هەروەها

---

[320] همان شماره ٤٧، ٧٤/١٢/١٠، ص١٦.

[321] همان شماره ٥٦، ٧٥/٢/٢٥، ص١٢.

[322] همان شماره ٤٧، ٧٦/١٢/١٠، ص١٤.

[323] هفتەنامە پیام دانشجو، شماره ٤٧، ٧٤/١٢/١٠، ص٢.

[324] همان، شماره ٤٨، ٧٤/١٢/١٥، ص٣.

[325] همان، ص١٢.

بڵاوکراوەی (پیام دانشجو) دەنووسێت "سەرپەرشتیارانی هەڵبژاردن دەبێ زەمینە خۆش بکەن. بۆ بەشداری کردنی تەواوی ئەو گروپ و باڵانەی کە باوەڕیان بە شۆڕشی ئیسلامی و دەستوور هەیە، دەبێ کورت بینی و روانینی یەکلایەنە بخرێنە لاوە"[326].

## ٣-بەشداریی سیاسی:

بڵاوکراوەی (پیام دانشجو) بە ئامارە بۆ پێویستی بەشداریی سیاسی خەڵك، یەکێك لەو کەم و کورتیە سەرەکیەکانی بەرنامەی پەرەپێدانی" بە دیارنەبوونی شوێنی خەڵك "واتە بەشداری خەڵك لە گۆڕەپانە سیاسیەکان" لە قەڵەم داوە"[327] ئەم بڵاوکراوەیە بۆ هاندانی بەشداری سیاسی خەڵك، داوای "بەکارهێنانی دام و دەزگای کاراو کاریگەرتری کرد وەکو چاپەمەنیەکان"[328] هەروەها پیام دانشجو بەشداری سیاسی خەڵکی وەکو (مافی خەڵك) لە ئیسلامدا باس کردووەو دەنووسێت "بەپێی بنەماکانی ئیسلام بەشداری خەڵك لە چارەنووسی وڵاتدا مافێکی گشتی. (واتە حق الناس)ە کە دەبێ لەسەر بنەمای پرانسیپی بەش و عەدل و بەمەبەستی گەیشتن بە کەماڵی مەعنەوی و مادی ئەم مافە جێبەجێ بکرێ"[329] ئەم گروپە ئامادەبوون و بەشداری سیاسی خەڵك تەنها لە (بەشداری لە رێپێوان یان لە هەڵبژاردندا" نابینێتەوە و "رەنگدانەوەی ئامادەبوونی واقیعی خەڵك لە گۆڕەپاندا، بەرادەربڕین دەربارەی سیاسەتی ئێستا" دەزانێت و لە قەڵەم دەدات[330].

## ٤-ئازادی:

ئەم گروپە تەئکید لە بوونی ئازادی لە کۆمەڵدا دەکاتەوەو چوارچێوەکەی لە کۆمەڵدا بە "ئەمنی قەومی و بەها ئیسلامیەکان" دەست نیشان دەکات کە دەبێ "بە وردی گرنگی و بایەخی پێ بدرێ"[331] و لە نامەیەکی کراوەدا بۆ سەرکۆمار تەئکید

---

[326] هەمان، شمارە ٤٧، ٧٤/١٢/١٠، ص٣.

[327] هەمان، شمارە ٤١، ٧٤/٣/٣٠، ص٣.

[328] هەمان، شمارە ٤٨، ٧٤/١٢/١٥، ص٣.

[329] هەمان، شمارە ٥٢، ٧٥/١/٢٨، ص١٢.

[330] هەمان، شمارە ٣٧، ٧٤/٣/٢، ص٣.

[331] هفتەنامە پیام دانشجو، شمارە ٢٧، ٧٣/١٢/٩، ص٦.

لەوە دەکاتەوە کە "دەبێ خەڵك بتوانن ئازادانە بۆچوونی راشکاوانەی خۆیان دەربارەی سیاسەتە جۆراوجۆرەکان دەربڕن"[332] طبرزدی‌ش لە پێناسەی ئازادی‌دا دەڵێت: "ئازادی بریتی‌یە لە دەربڕینی راست و رەوان و بێ‌ترسی بۆچوونە لۆجیکی‌یەکان"[333] ئەم گروپە تەئیدی بەرپەرچدانەوەی فیزیایی نەیاران ناکات.

بەرپرس و ئەنجومەنی نووسەرانی هەفتەنامەی (پیام دانشجو) لە نامەیەکدا بۆ سەرکۆمار رەخنەیان لە قسە بەیەك گوتن لە زانکۆی تاران و ئاگر تێبەردانی کتێب فرۆشی گرت"[334]. هەروەها تەئکیدیان لە بنەڕەتی "یاسا کردەوە نەك ئارەزوو و سەلیقەی) تاکە کەس لە کۆماری ئیسلامی‌دا"[335] جەختیشیان لە رۆڵی رەخنەگرانەی رۆژنامە لە دام و دەزگاکانی جێبەجی‌کردنی دەوڵەت کردەوە.[336]

هەروەها پیام دانشجو دەنووسێت "سەرپەرشتیارانی هەڵبژاردن دەبێ زەمینە خۆش بکەن. بۆ بەشداری کردنی تەواوی ئەو گروپ و باڵانەی کە باوەڕیان بە شۆڕشی ئیسلامی و دەستوور هەیە، دەبێ کورت بینی و ڕوانینی یەك لایەنە بخرێنە لاوە"[337]

### ٥-ناردنە دەرەوەی شۆڕش:

هەڵوێستی ئەم گروپە سەبارەت بە ناردنە دەرەوەی شۆڕش بەپێی رۆژگار گۆڕاوە تا ئەو شوێنەی کە ماوەیەك پشتیوانی لە ناردنە دەرەوەی شۆڕش دەکردو رەخنەی لە سیاسەتی حکومەتەکەی رەفسنجانی دەگرت لەوەدا کە بایەخی بەناوخۆ دەدا "خەتی مەیل بەلای خۆرئاوادا دروشمی ئێرانی ئاوەدانی لە شوێنی ناردنە دەرەوەی شۆڕش داناوە"[338] بەڵام ئەمڕۆ طبرزدی دەربارەی ناردنە دەرەوەی شۆڕش راشکاوانە دەڵێت "ئێستا دەبێ بایەخ بە مەسەلەکانی ناوخۆ بدەین" لەگەڵ ئەوەشدا کە بە

---

[332] همان، شماره ٤٧، ٧٤/١٢/١٠/ ص٢.

[333] اظهارات طبرزدی، ٧٦/٢/١٦.

[334] هفتەنامە پیام دانشجو، شمارە ٤٧، ٧٤/١٢/١٠، ص٢.

[335] همان، شماره ٤٢، ٧٤/٤/٦، ص١.

[336] همان.

[337] همان، شماره ٤٧، ٧٤/١٢/١٠، ص١٣.

[338] همان، شماره ٤٩، ٧٤/١٢/٢٢، ص١٣.

شێوەیەکی گشتی پشتیوانی لە بێ بەشانی جیهان بە پێویست دەزانێت[339]. ئەم هەڵوێستە لە کاتێکدایە کە بڵاوکراوەی ئەم گروپە تەئکیدی لە ناردنە دەرەوەی شۆڕش کردبووەو نووسیبووی: "بەرنامەکانی پەرەپێدان و بیناکردن دەبێ بەشێوەیەك ڕێك بخرێن کە شۆڕش بتوانێ چەند دروشمێکی وەکو بەربەرەکانی دەسەڵاتی جیهانی، پشتیوانی لە چەوساوەکان، پشتیوانی لە ئازادکردنی قودس، بەربەرەکانی سەرمایەداری، یارمەتی بێ بەشان و.. پیادە بکات نەك ئەوەی کە بارودۆخەکە بەشێوەیەك بێ کە هەموو شتەکان بکەونە ژێر ڕەحمەتی پەرەپێدان و دروست کردنەوە"[340].

## ب-بۆچوونەکانیان سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوە:

### ١- پرانسیپەکانی سیاسەتی دەرەوە:

ئەم گروپە لە ماوەیەکدا لە سیاسەتی دەرەوەدا توندڕەو بوو. یەکپارچە خۆرئاوای لە حاڵی پیلانگێڕیدا لە دژی کۆماری ئیسلامی دەبینی و ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکانیشی بەوابەستەی خۆرئاوا دەزانی. بەپێی نووسینی پیام دانشجو: "ئەوروپاو نەتەوە یەکگرتووەکان و نموونەکانیان بەدوای بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا دەگەڕێن و لە هیچ کاتێکدا ئامادە نین ئەمریکا بە ئێران بگۆڕنەوە"[341] ئەم بڵاوکراوەیە "ڕێکخراوو کۆمەڵە نێودەوڵەتیەکانی بە دەسکردی وڵاتە ئیستکبارییەکان دەزانی و پێی وابوو کە لە جیهاندا پارێزگاری لەبەرژەوەندی نارەوای ئەوان دەکات" و "چاوەڕوانی ئەوەی کە ئەم دەزگایانە بیانەوێ لە پێناوی بەدیهێنانی مافی وڵاتە ستەم دیدەکاندا لەوانەش ئێران هەنگاوێکی گونجاو هەڵ بگرن، بەبێهودەو ساویلکانە" لە قەڵەم دەدا[342]. ئەم گروپە هەتا سەبارەت بە هەنگاوە کۆمەڵایەتی و ئابووریەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانیش ڕەش بین بوو. لەم بارەیەوە بڵاوکراوەی (پیام دانشجو) نووسیوویەتی: "مەعلوم نییە ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی کە لەبەر

---

[339] مصاحبه نگارنده با طبرزدی، ٧٦/٤/١٥.

[340] هفتەنامه پیام دانشجو، شماره ٤، ٧٣/٨/٢٦، ص١.

[341] همان، شماره ٤٩، ٧٤/١٢/٢٢، ص١٣.

[342] همان، شماره ٤٣، ٧٤/٤/١٣، ص٨.

نەدانی حەقی ئەندامەتی، خاوەن کار، واتە ئەمریکا، لەبەردەم تێکشکاندایە، چۆن دەتوانێ کە بۆ بەربەرەکانێی هەژاری، یارمەتی وڵاتانی دی بدات"[٣٤٣].

ئەو گروپە باوەڕی بە قبوڵکردنی نەزمی حاکم نەبوو بەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکاندا. حیشمەتوڵڵای طبرزدی لەم بارەیەوە گوتی: "کاتێ ئێمە هەوڵ بدەین پەیوەندی جیهانیمان بەشێوەیەك ڕێك بخەین کە لەگەڵ بیرکردنەوەی نوێی جیهانیدا بگونجێ، بۆ ئەوەی جیهان ئێمە قبوڵ بکات، ئاساییە ناچارین مەرجەکانی ئەوان قبوڵ بکەین.. نەزمی نوێ و نەتەوە یەکگرتووەکان سەربەخۆ نین لە ئەمریکا. ئەگەر ئێمە لەم پەیوەندییەدا ورد نەبین، مەسەلەی سەربەخۆییمان دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە"[٣٤٤] هەروەها گوتی "سیاسەتی دەرەوەی وڵات سەرکەوتوو نەبوو، ڕەوەندی جوڵەی زیاتر لەسەر بنەمای پشت بەستنی لە ڕادەبەدەر بووە بە کۆمەڵگای جیهانی و خۆرئاواییەکان"[٣٤٥] بەڵام طبرزدی لە هەڵوێست گۆڕینێکی ئاشکرادا بە نیسبەت هەڵوێستەکانی ڕابردوویەوە لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت "لە حاڵی حازردا باوەڕی بەشتی عەمەلی هەیە لە سیاسەتی دەرەوەداو دەبێ واقیع بینانە لەگەڵ گۆڕانکارییە نێودەوڵەتیەکاندا مامەڵە بکرێ" لەم ماوەیەدا طبرزدی بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە هەڵوێستی خۆی گۆڕی"[٣٤٦].

## پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا:

سەبارەت بە پەیوەندیش لەگەڵ ئەمریکادا گۆڕانکاری لە بۆچوونەکانی ئەم گروپەدا بەدی دەکرێ. لە سەرەتادا هەر جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ ئەمریکادا بە توندی ڕەت دەکردەوە و خوازیاری (مامەڵەی شۆڕشگێرانە) بوو لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە ئەم بابەتە باس دەکەن. بەڵام لێدوانەکانی طبرزدی لە ساڵی (١٣٧٦-١٩٩٧)دا باس لە گۆڕانی بۆچوونەکانی ئەم باڵە دەکات کە پاشان ئاماژەیان بۆ دەکرێ.

(پیام دانشجو) نووسیوویەتی "دەبێ ئەمریکا لەگەڵ نابووتی، زەبوونی، گەندەڵی، تاوان، غەش، ستەم، زۆربڵێیدا بەیەکسان بزانین و بەیەك وشە بە دیمەنی

---

[٣٤٣] همان، شماره ٥٦، ٧٥/٢/٢٥، ص١٢.

[٣٤٤] همان.

[٣٤٥] سغندانی طبرزدی در ٧٦/١/٢٨.

[٣٤٦] مصاحبه نگارنده باطبرزدی، ٧٦/٤/١٥.

راستەقینەی شەیتانی بزانین. کەواتە ئەی چۆن هێشتا هەندێك لە تۆقیوانی ناوخۆ چاوەڕێی هەلێکن بۆ پەیوەندییان وتووێژ لەگەڵ ئەمریکادا؟..

میللەتی ئێران هەرگیز کارەسات و تاوانە بێ شومارەکانی ئەمریکا لە بەرامبەر خۆیدا فەرامۆش ناکات و مامەڵەی شۆڕشگێڕانە لەگەڵ ئەوانەدا دەکات کە بیانەوێ لەگەڵ دوژمنانی شۆڕشدا پەیوەندی یان وتوێژ بکەن"[٣٤٧] هەروەها ئەم گروپە تەئکیدی لەوە دەکردەوە کە "ئێمە هیچ پێویستیەکمان بە شەیتانی گەورە نییەو دەبێ پشت بە توانا ناوخۆییەکانیخۆمان ببەستین و تەئکیدی لێبکەینەوە"[٣٤٨] پیام دانشجو بۆ مامەڵە لەگەڵ ئەمریکادا سیاسەتی "باشترین بەرگری هێرشەی" پێشنیاز دەکرد[٣٤٩]، ئامادەیی خۆی بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ ئەم (دێوی پیلان و دەست درێژییە"دا رادەگەیاند[٣٥٠].

بەلام لە ساڵی (١٣٧٦-١٩٩٧)ەوە گۆڕانێکی بەرچاو لە تێڕوانین و بۆچوونەکانی ئەم گروپەدا سەبارەت بە خۆرئاواو ئەمریکا بەدی دەکرێ. طبرزدی لەم بارەیەوە دەڵێت "سەبارەت بە ولاتە خۆرئاواییەکان پێم وانییە کێشەیەکی تایبەتی هەبێ و دەبێ پەیوەندییەکان بە باش لە قەڵەم بدرێن و لە هەمان کاتدا بەر لەو مەسەلانە بیگرێ کە دەبنە هۆی گرژی. سەبارەت بە ئەمریکا.. (حکومەتەکەی) ئێمە بە ئاستێکی دەسەلات گەیشتووە، کە کێشەیەکی نەبێ و بتوانێ لەگەڵ حکومەت و خەڵکی ئەمریکادا لە چوارچێوەی گفتوگۆ لەسەر بنەمای بەرژەوەندی هەردولا وتووێژ بکات"[٣٥١].

طبرزدی لە لێدوانێکی دیکەدا پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکادا رەت نەکردۆتەوەو دەڵێت "ئەرکی سەرشانی سەرکۆمارە کە بۆ دروست کردنی پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتانی دیکەدا چەند مەرجێك دیاری بکات لە حاڵەتی بەدیهاتنی ئەم مەسەلەیەدا

---

[٣٤٧] هفتەنامە پیام دانشجو، شمارە ٤٣، ٧٤/٤/١٣، ص٨.

[٣٤٨] همان، شمارە ٤٤، ٧٤/٤/٢٠، ص٨.

[٣٤٩] همان، شمارە ٤، ٧٣/٦/٢٨.

[٣٥٠] همان، شمارە ٧، ٧٣/٧/١٨، ص١١.

[٣٥١] گفتوگۆی طبرزدی بابخش فارسی رادیو بی بی سی، بخش شامگاهی، ٧٦/٣/١٧.

دەتوانین پەیوەندیمان لەگەڵ ئەمریکاشدا هەبێ"[352] هەروەها لە لێدوانێکی دیکەدا "پەیوەندی سیاسی لەگەڵ تەواوی وڵاتانی جیهاندا ڕەت نەکردۆتەوە جگە لە ئیسرائیل" لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ "پێویستە سیاسەتی دەرەوە لەسەر بنەمای ئاشتی و دۆستایەتی و پتەوی بێت و بەهانەیەك نەدات بەدەست وڵاتە خۆرئاواییەکانەوە کە لە ڕێگەیەوە بتوانن وڵات بخەنە ژێر فشارەوە"[353] ئەم یەکێتی‌یە لە شیکردنەوەی بەیاننامەیەکدا لە بواری پەیوەندییەکانی ئێران لەگەڵ عێراق و عەرەبستاندا، بە ڕەخنەگرتن سەبارەت بە هەندێ لە سیاسەتەکانی پەیوەندی دەرەکی حکومەتی خاتەمی دەنووسێت "مەیلی لە ڕادە بەدەری ئێران بەلای عەرەبستاندا کە دەوری دەست نیشانکراوی حکومەتی ئەمریکاشی بینیووە. هەمان ئەو زیانانەی دەبێت کە دوژمنایەتی (٢٠) ساڵی ڕابردوو لە نێوان هەردوولا هەیبووە"[354].

## کورتەی هەڵوێستە سیاسیەکانی گروپی "پیام دانشجو"

١-سنوورداریی دەسەڵاتەکانی وەلی فەقیه بەپێی مادەکانی دەستوور.

٢-خواستی خەڵك بنەمای پێکهێنانی حکومەتی ئیسلامی‌یەو ڕای ئەوان مەسەلەیەکی دینی‌یە.

٣-پشتیوانی لە یاسایی کردنی چالاکیە سیاسی‌یەکان لە چوارچێوەی حزبدا.

٤-بەشداری خەڵك لە چالاکی سیاسی‌دا مافێکی ڕەوایە.

٥-تەئکید کردنەوە لە بوونی ئازادی لە کۆمەڵداو لەوەی کە خەڵك بتوانن ئازادانە بۆچوونی خۆیان سەبارەت بە سیاسەتە جۆراوجۆرەکان دەربڕن.

٦-پشتیوانی لە ڕۆڵی ڕەخنەگرتن لە دەزگاکانی جێبەجێکردن و دەوڵەت.

٧-پشتیوانی نەکردن لە ناردنە دەرەوەی شۆڕش.

٨-ڕەت نەکردنەوەی گفتوگۆ لەگەڵ ئەمریکادا.

---

[352] سخندانی طبرزدی در ٧٦/٢/١٦.

[353] سخندانی طبرزدی در ٧٦/١/٢٨.

[354] بیانیه اتحادیه انجمن های اسلامی دانشجویی و دانش آموختگان دانشگا هما و مراکز آموزشی عالی، ٧٧/١/١٧.

## هەڵوێستە ئابوورییەکانی گروپی پەیامی خوێندکار

### ١-تاییەتی کردن:

ئەم گروپە دژی تایبەتی کردنی یەکەکانی بەرهەم هێنانە. بڵاوکراوەی پیام دانشجو لەم بارەیەوە دەنووسێت "بەداخەوە ژمارەیەکی زۆر لە نوێنەران، لە جیاتی ئەوەی بیر لە بێبەشان بکەنەوە، پشتیوانیان لە کەرتی تایبەتی کردووە بە دروشمی سەرەکی خۆیان"[٣٥٥] هەروەها ئەم گروپە باوەڕی وایە کە بەشداری خەڵك لە چالاکی ئابووریدا نابێ بۆ توێژە دەوڵەمەندەکان قۆرغ بکرێ و دەبێ خەڵك بە گشتی لەم بوارەدا چالاکی بنوێنن. بڵاوکراوەی پیام دانشجو رەخنەی لە شێوەی تایبەتی کردنی دەوڵەت گرتووە وەکو "تایبەتی کردنی پشت بەستوو بە پاوانکاری" باسی دەکات و لە جێگای ئەوە پێشنیازی "راکێشانی بەشداری خەڵك و سەرمایە سەرگەردانەکانیان دەکات"[٣٥٦] بەشێوەیەکی گشتی ئەم گروپە تەئکید لە دەستێوەردانی دەوڵەت لە ئابووری دەکاتەوەو بڵاوکراوەی پیام دانشجو لەم بارەیەوە دەنووسێت: "وڵاتی ئێمە.. کە خاوەنی ئابوورییەکی داهێنراوی سەردەمی رابردوو جەنگی داسەپاوە.. دەبێ بە دەستێوەردانی دەوڵەت بەرەبەرە کێشەکانی سەرمایەگوزاری بەرهەم هێنان و مەسەلەی نرخ و پارە چارەسەر بکات"[٣٥٧] ئەم بڵاوکراوەیە لە جێگایەکی دیکەدا دەستێوەردانی دەوڵەتی لە ئابووری بە "مەسەلەیەکی پێویست و عەقڵانی" وەسف کردووەو دەنووسێت "دەستێوەردانی دەوڵەت لە هەل و مەرجێکدا کە بەهای دراوی نیشتمانی وڵات گەیشتۆتە نزمترین ئاست و باری هەڵئاوسان و زیادبوونی جڵەو بۆ شل کراوی بەهاکانی بەسەر وڵات زاڵ کردووە. بە مەسەلەیەکی پێویستی و عەقڵانی دەزانێت"[٣٥٨]

---

[٣٥٥] هفتەنامە پیام دانشجو، شمارە ٥، ٧٣/٧/٤، ص١.

[٣٥٦] همان، شمارە ٤٨، ٧٤/١٢/١٥، ص٥.

[٣٥٧] همان، شمارە ٣٦، ٧٤/٢/٢٦، ص٦.

[٣٥٨] همان، شمارە ٣٧، ٧٤/٣/٢، ص٤.

هەروەها ئەم بڵاوکراوەیە تەئکیدی لە "چاودێری دەوڵەت کردۆتەوە بەسەر بەشە جیاوازەکانی ئابووری‌داو دەنووسێت "ئەوەی کە لە ئارادایە چاودێری دەوڵەتە لە بەشە جیاوازەکانی ئابووری خزمەت گوزاری‌دا"[٣٥٩].

ئەم گرووپە بۆ زاڵ بوونی بەسەر کێشە ئابوورییەکاندا تەئکید لە کەڵك وەرگرتن لە (سزادان) دەکاتەوە. بڵاوکراوەی پیام دانشجو دەنووسێت "دەوڵەت لە هەر جێگایەکدا بە دەسەڵاتەوە چووبێتە ناوەوەو بێ چەندو چوون مامەڵەی لەگەڵ تێکدەرانی ئابووری و قاچاخچییانی پارەو کاڵادا کردبێ، هەمیشە کاریگەری ئیجابی خۆی بەجێ‌هێشتووە.. دەبێت بە بەدواداچوونی بەردەوام و جێ‌بەجێ‌کردنی سزای پێشبینی کراو هەتا رادەی ئیعدامیش بۆ ئەو کەسانەی هەوڵ دەدەن ئابووری وڵات تێك بدەن و بەرەو شکستی بەرن (مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ)"[٣٦٠] ئەم بڵاوکراوەیە لە جێگایەکی دیکەدا بۆ رووبەڕووبوونەوەی گران فرۆشان داوای سزای ئیعدامی کرد"[٣٦١] ئەم گرووپە لە شەرح کردنی فاکتەرەکانی گرانی‌دا وای لێك دایەوە کە لە چەند فاکتەرێکەوە دروست دەبێت کە "نەبوونی کۆنترۆڵی دەوڵەت و چاودێری‌یەتی بەسەر بازاڕو جڵەو شل کردن بۆ سەرمایەداران و بازرگانان و تۆڕی دابەشکردن" لەو فاکتەرانەی دەست نیشان کرد[٣٦٢]. طبرزدیش لە دژایەتی بەرنامەی تەعدیلدا دەڵێت "دەبێ بەرنامەی تەعدیلی (ئابووری) رابگیرێ"[٣٦٣]. ئەم گرووپە پشتیوانی لە تەرخان کردنی یارمەتی (زیان بژاردنی) دەوڵەت دەکات بۆ کاڵاکان. پیام دانشجو دەربارەی کۆمەکەکانی دەوڵەت بۆ نان و وزەو لەو بابەتە دەنووسێت. ئەو کۆمەکانە وەکو دەرزی لێدانێك وایە کە پەیکەری لاوازی بەشێکی فراوانی لەکۆمەڵ بەسەر پێوە راگرتووەو لابردنی بەمەعنای برینی خۆراکی پێویستە بۆ درێژەدان بە نیوە ژیانی ئەم توێژە.. کۆمەك بۆ بەردەوام بوونی ژیانی بێ‌بەشانە"[٣٦٤].

---

[٣٥٩] همان، شماره ٥١، ٧٥/١/٢١، ص٧.

[٣٦٠] همان، شماره ٣٦، ٧٤/٢/٢٦، ص٦.

[٣٦١] هفته‌نامه پیام دانشجو، شماره ١٥، ٧٢/٩/١٥، ص٧.

[٣٦٢] همان، شماره ٧، ٧٣/٧/١٨، ص٢.

[٣٦٣] اظهارات طبرزدی در ٧٦/٢/١٧.

[٣٦٤] هفته‌نامه پیام دانشجو، شماره ٥٠، ٧٥/١/١٤، ص٤.

### ٢-خۆبژێوی نموونەی ئابووری‌یانە:

ئەم گروپە پشتیوانی لە نموونەی ئابووری خۆبژێوی دەکات و باوەڕی بە تەئکیدکردنەوە لە پەیڕەوی کردنی "قەناعەت" هەیە: "فەرهەنگی پەرەپێدان لەم ولاتەدا، فەرهەنگی.. قەناعەت دەبێ"[٣٦٥] ئەم بلاوکراوەیە لە جێگایەکی دیکەدا تەئکیدی لە وازهێنان لە پیادەکردنی پرۆژەی گەورە کردۆتەوە کە تێچوونیان زۆرەو دەنووسێت "لە بەرنامەیەکی پەرەپێدانی هەمەلایەنەدا، پشت بەستن بە سەرچاوەی ناوخۆ ئەولەویەتی جدی هەیە.. دوورکەوتنەوە لە پرۆژەی گەورەو ماوەدرێژ کە تێچوونی زۆر لە خاسیەتەکانی ئەم پرۆژە گەورانەیەو حسابکردنی بۆ سەرچاوەی نیشتمانی دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەشێکی گەورە لە سەرمایەکانی ولات بە هەدەر نەچێت"[٣٦٦] هەروەها ئەم بلاوکراوەیە پێشنیاز بۆ کەناڵەکانی راگەیاندن دەکات کە "پاشەکەوت کردن هان بدەن لە خەرجی‌دا و لەم بارەیەوە دەنووسێت "پەیامی مەزنی دەزگاکانی راگەیاندنی ولاتی ئێمە بریتی‌یە لە هاندانی رۆشنبیری پاشەکەوت و دوورکەوتنەوە لە خەرجی بێ بەرنامە و هاندانی خێزانەکان بۆ پاشەکەوت کردن لە خەرجی‌دا"[٣٦٧].

ئەم گروپە خوازیاری داخستنی بازاڕە لەڕووی هاوردەکاندا. بلاوکراوەی پیام دانشجو دەنووسێت: "کاربەدەستانی کاروباری ئابووری. بەپێی کام بەرنامە یان نموونە، بازاڕی ولاتێکی شۆڕشگێڕیان لەبەردەم کالای دەرەکی‌دا کردەوە؟.. بەم هەنگاوە هەم گورزیان لە رێکخستنی بەهایی ولات وەشاندو هەم لە رێکخستنی بەرهەمی ناوخۆو هەم ولاتیشیان بەرەو کەمالیات و زیادە مەسرەفی برد"[٣٦٨].

### ٣- پەرەپێدان:

بەرای ئەم گروپە پەرەپێدان پێویست بوو بە بایەخ دان بە (بەهاکان) بایەخی پێ‌بدرایە. پیام دانشجو لەم بارەیەوە دەنووسێت "پەرەپێدان و بیناکردن کارێکی

---

[٣٦٥] همان، شماره ٣٦، ٧٤/٥/٣، ص٦.

[٣٦٦] همان، شماره ٤٩، ٧٤/١٢/٢٢، ص١٤.

[٣٦٧] همان، شماره ٥٤، ٧٥/٢/١١، ص٥.

[٣٦٨] هفتەنامه پیام دانشجو، شماره ٢٠، ٧٣/١٠/٢٠، ص١٠.

باشن بەڵام نەك بە بەهای روخاندنی بەهاكان"[٣٦٩] هەر لەم پێناوەدا لەگەڵ رەت كردنەوەی پەرەپێدان بەبێ مەعنەویەت دەنووسێت: "پەرەپێدان بەبێ مەعنەویەت و فەرهەنگ و شۆڕشگێڕیی، پەرەپێدان نابێ.. فەرهەنگی پەرەپێدان لەم وڵاتەدا فەرهەنگی شەهیدبوون و قوربانیدان و جیهادو بەتوانایی و تەقواو قەناعەت دەبێ"[٣٧٠] لەم رووەوە باوەڕی بەوە نییە كە سیستەمە ئابوورییەكانی ئێستای جیهان بكات بە نموونە و باوەڕی وایە لەم بوارەدا دەبێ دەربارەی مەسەلە ئابوورییەكان پەیڕەوی لە فەرمانەكانی ئیسلام بكرێ.. بەم پێیە چ پێویست بەوە دەكات كە جارێ.. دەست بە كۆپی كردنی سیستەمە ئابوورییەكانی بێگانە بكەین"[٣٧١]

٤-كەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەكی:

بە سەرنجدان لە ستراتیجی خۆبژێوی كە بەلای ئەم گروپەوە پەسەندە و بەحسابكردن بۆ ئەو نموونەی پەرەسەندنەی كە قبوڵیان كردووە، گروپی پەیامی خوێندكار دژی كەڵك وەرگرتنە لە سەرچاوەی دەرەكی. بڵاوكراوەی پیام دانشجو لەم بارەیەوە دەنووسێت "وەرگرتنی قەرز لە بانكی جیهانی و سندوقی دراوی نێودەوڵەتی.. بە قازانجی وڵات و شۆڕش نەبووەو نابێ. كەواتە باشتر وایە كە بەرپرسان بە سەرچاوەكانی ناوخۆ قەناعەت بكەن"[٣٧٢].

٥-داد پەروەری كۆمەڵایەتی:

ئەم گروپە بۆ بەرقەراری دادپەروەری كۆمەڵایەتی باوەڕی بە دەستێوەردانی دەوڵەت و وەرگرتنەوەی سامانی گشتی لە دەوڵەمەندەكان هەیە. بڵاوكراوەی پیام دانشجو روو لە دەوڵەت دەكات و دەنووسێت: "بەجۆرێك كاربكەن كە سامانی گشتی لە قورگی دەوڵەمەندان دەربێنن"[٣٧٣]

---

[٣٦٩] همان.

[٣٧٠] همان، شماره ٣٦، ٧٤/٥/٣، ص٦.

[٣٧١] همان، شماره ٥٣، ٧٥/٢/٤، ص٨.

[٣٧٢] همان، شماره ٣٢، ٧٤/١/٢٩، ص٨.

[٣٧٣] همان، شماره ٥٠، ٧٥/١/١٤، ص٤.

## کورتەی بۆچوونە ئابوورییەکانی گروپی پەیامی خوێندکار

١-دژایەتی تایبەتی کردنی یەکەکانی بەرهەم هێنان.

٢-دژایەتی سیاسەتی تەعدیلی ئابووری.

٣-گروپی پەیامی خوێندکار خوازیاری بەشداری خەڵکە بەگشتی لە چالاکیە ئابوورییەکاندا.

٤-پشتیوانی لە دەستێوەردانی دەوڵەت لە کاروباری ئابووری‌دا دەکات.

٥-پشتیوانی لە سیاسەتی ئاگادارکردنەوە دەکات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بێ سەرو بەرییە ئابووری‌یەکان.

٦-نموونەی ئابووری ئەم گروپە خۆبژێوی‌یەو پێشنیازی سیاسەتی پاشەکەوت کردن دەکات.

٧-ئەم گروپە خوازیاری سنووردارکردنی هاوردەکانە.

٨-لە پەرەپێداندا بەهاکان بە بنچینەیی دەزانێت.

٩-پشتیوانی لە بەخشینی کۆمەك (قەرەبوو)ی کالاکان دەکات.

١٠-ناڕازی بوون بە کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی.

١١-باوەڕیان بە دەستێوەردانی دەوڵەت هەیە بۆ بەرقەراری دادپەروەری کۆمەلایەتی لە کۆمەڵدا.

## ٣-٢-هەڵوێستە فەرهەنگیەکانی گروپی پەیامی خوێندکار

### ١-هێرشی فەرهەنگی:

ئەم گروپە باوەڕی وایە کە دەبێ بەرپەرچی (فەرهەنگی بێ‌بەهای خۆرئاوا) بدرێتەوە و بەر لەهاتنە ناوەوەی بۆ ناو ولات بگیرێ. بلاوکراوەی پەیامی خوێندکار لەم بارەیەوە دەنووسێت "فەرهەنگی بێ بەهای خۆرئاوا دزەی کردۆتە ناو ولاتەکەمانەوە. لەسەر نوێنەران پێویستە کە بەربەرەکانی لەگەڵ فەرهەنگی خۆرئاوادا بە جدی بگرن. دەبێ بەربەرەکانی لەگەڵ ئەو فەرهەنگەدا بە جدی بگیرێ. نوێنەرانی پەرلەمان (ئەندام پەرلەمانەکان) دەبێ هێزە سەربازییەکان و (انتظامی) و بەتایبەتی

هێزەکانی (بەسیجی) خەڵك هان بدەن و پشتیوانیان لێ بکەن لە پێناوی خێراتر هەڵکەندنی ڕەگ و ڕیشەی فەرهەنگی خۆرئاوادا"[٣٧٤] لەم بارەیەوە (پیام دانشجو) بە تەئکیدکردنەوە لە سەر بەرپەرچ دانەوەی "نیشانەی دیاری هێرشی فەرهەنگی" دەنووسێت: "لەبەر چی نابێ ئێمە هەرچی زووتر هەنگاوی گونجاو و پێویست بۆ بەرپەرچدانەوەی نیشانە دیارەکانی هێرشی فەرهەنگی هەڵبگرین؟ بەهانە هێنانەوە هەتا کەی؟"[٣٧٥]

لەگەڵ ئەمەشدا دەربارەی هێرشی فەرهەنگی چەند گۆڕانکاریەك لە ڕوانگەی ئەم گروپەدا بەدی دەکرێ. هەروەکو ئەوەی ماوەیەك پشتیوانی لە قەدەغەکردنی بەکارهێنانی سەتەلایت دەکات و لە ماوەیەکی دیکەدا دژی ئەو قەدەغەکردنەیە. بڵاوکراوەی پیام دانشجو نووسیوویەتی "پلانی قەدەغەکردنی سەتەلایت داوایەکی زۆر ڕاستە و لە سنووری چاوەڕوانیەکانی حزبوڵلا دایە" بەڵام باوەڕی وایە کە نابێ بە تەنها بە قەدەغەکردنی سەتەلایت وازبهێنێ بەڵکو دەبێ (بە جڵەوگیری هونەری و بەرنامەکانی ڕێنمایی، بەرهەمی فراوانی فەرهەنگی و هونەری، زیاتر لە جاران خەڵك لە زیانەکانی سەتەلایت هوشیار بکرێتەوە"[٣٧٦] طبرزدیش ماوەیەك دوای ئەوە لە لێدوانێکدا دەربارەی بەکارهێنانی سەتەلایت کە باس لە گۆڕانی بۆچوونی ئەم گروپە دەکات، دەڵێت: "ئەگەر کەسێك بیەوێت سەتەلایتی هەبێت یان نەیبێت پەیوەندی بەخۆیەوە هەیەو دەوڵەت نابێ تا ئەو ڕادەیە دەست لە بواری ژیانی تایبەتی خەڵك وەربدات"[٣٧٧]

## ٢-حساب کردن بۆ رووکەش:

ئەم گروپە ماوەیەك حسابێکی زۆری بۆ ئەو فۆرمانە دەکرد کە لای خۆی پەسەند بوو، بە جۆرێك کە هەفتەنامەی پیام دانشجو بە ناڕەزایی لەوەی کە پەیامنێری تەلەفزیۆنی CNN کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەکبەر هاشمی ڕەفسنجانی سەرکۆماری

[٣٧٤] هفتەنامە پیام دانشجو، شمارە ٤٩، ٧٤/١٢/٢٢، ص٥.

[٣٧٥] همان، شمارە ٤، ٧٣/٦/٢٨، ص٢.

[٣٧٦] همان، شمارە ٥، ٧٣/٧/٤، ص١.

[٣٧٧] گفتوگۆی طبرزدی بابخش فارسی، رادیو فرانسە، ٧٦/٣/١٧.

ئەوکاتە ئەنجام داوە "بێ حیجاب" بووە، ڕەخنەی لە ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکە گرتووە لەگەڵ ئەو پەیامنێرەدا[٢٧٨]. بەڵام وا دیارە هەڵوێستی ئەم گروپە تاڕادەیەك تەعدیل بووە. چونکە طبرزدی لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت، "مامەڵەی توندوتیژ لەگەڵ ژناندا سەبارەت بە مەسەلەی حیجاب ڕاست نی‌یە.. دەوڵەت لەم بارەیەوە دەبێ ڕۆڵی ڕێنمایی ببینێ"[٢٧٩]

### ٣-سانسۆر لەسەر بڵاوکردنەوەی بەرهەمە فەرهەنگیەکان:

ئەم گروپە دژی کۆنترۆڵی دەوڵەتە بەسەر بەرهەمە فەرهەنگیەکاندا بەر لە بڵاوکردنەوەیان. طبرزدی لە چاوپێکەوتنێکدا ڕایدەگەیەنێ کە دوای بڵاوکردنەوەیان باوەڕی بە سانسۆری دەوڵەت هەیە بەسەر بەرهەمە فەرهەنگیەکانەوەو بە کۆنترۆڵی دەوڵەت بەسەر بەرهەمە فەرهەنگیەکانەوە ڕازی نی‌یە. بەپێی قسەی طبرزدی. "زیانی کرانەوەی کەش و هەوای فەرهەنگی لەو زیانانە کەمترە کە لە داخستنی کەش و هەوای فەرهەنگی‌یەوە دروست دەبێت"[٢٨٠]

## کورتەی بۆچوونە فەرهەنگیەکانی گروپی پەیامی خوێندکار

١-پشتیوانی لە سیاسەتی سانسۆر بەسەر بەرهەمە فەرهەنگیەکان لەدوای بڵاوکردنەوە.

٢-دژایەتی کردنی کۆنترۆڵی بەرهەمە فەرهەنگیەکان بەر لە بڵاوکردنەوە.

٣-دژایەتی کردنی مامەڵەی توندوتیژ بۆ پۆشینی حیجاب.

٤-ئەم گروپە ڕێنمایی کۆمەڵ لە پێناوی فەرهەنگی پێویستدا، سیاسەتی ڕێنمایی دەوڵەت پێشنیاز دەکات.

٥-بە ڕای ئەم گروپە نابێ دەوڵەت لە مەسەلەی فەرهەنگی دەست لە بواری ژیانی تایبەتی وەربدات.

٦-باوەڕیان بە بوونی هێرشی فەرهەنگی هەیە.

---

[٢٧٨] هفتەنامە پیام دانشجو، شمارە ٤٤، ٧٤/٤/٢٠، ص٨.

[٢٧٩] گفتوگۆی طبرزدی بابخش فاریسی رادیو فرانسە، ٧٦/٣/١٧.

[٢٨٠] مصاحبە نگارندە با طبرزدی، ٧٦/٤/١٥.

٧-ڕێگەی ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشی فەرهەنگی سیاسەتی سزادان نی‌یە بەڵکو دەبێ هۆشیاری خەڵك بەرزبکرێتەوە.

## هەڵوێستە سیاسی و ئابووری و فەرهەنگیەکانی باڵی پشتیوانانی حزبوڵڵا

تایبەتمەندی بۆچوونە سیاسیەکانی باڵی پشتیوانی حزبوڵلا دەتوانرێ لە ئامانجداری و تێڕوانینی بەهایی و ئایدیۆلۆژیدا کورت بکرێتەوە بۆچوونەکانی ئەم باڵە دەربارەی مەسەلە جیاوازەکان لەژێر کاریگەری ئەم چوارچێوە گشتی‌یەدایە.

ئەلف: تێڕوانینیان سەبارەت بە حکومەت:

### ١-ویلایەتی فەقیهو ڕابەری و خەڵك:

پشتیوانانی حزبوڵڵا باوەڕیان وایە کە خەڵك لە هەڵبژاردنی وەلی فەقیە دەوریان نی‌یە، وەلی فەقیە "لەلایەن خوداوەندەوە دانراوە" و "هەموو دەسەڵاتەکانی لەلایەن خوداوە پێ دراوە" بۆیە ئەم باڵە دەنگ دانی خەڵك لە "ڕاگەیاندنی ئامادەیی‌و قبوڵ کردن و هاودەنگی و مل کەچی" بۆ وەلی فەقیە دەردەبڕێ[٣٨١]. بەڕای پشتیوانانی حزبوڵلا "خبرگان وەلی فەقیە دانانێن بەڵکو بەهۆی شارەزایی‌و ئاگاداریی‌یانەوە لە مەسەلەکان، وەلی فەقیهیان کەشف کردووەو بە خەڵکی دەناسێنن"[٣٨٢] بەڕای پشتیوانانی حزبوڵلا لەبەرئەوەی وەلی فەقیە لەلایەن خوداوە دانراوە، خەڵك لە (هەڵبژاردن و دەسەڵاتەکانی) وەلیدا دەوریان نی‌یەو وەلی تەنها لە بەرامبەر خوداوەندا بەرپرسیارە.

ئەم باڵە بە حساب کردن بۆ بەهانەی ناوبراو "ئامادەبوونی وەلی فەقیە لە تەواوی کاروبارەکانی وڵاتی ئیسلامی‌دا بە پێویست دەزانێت و دەستێوەردانی بەشێوەی (ڕاستەخۆو ناڕاستەوخۆ) بە مەرجی شەرعیەتی کاروبارەکان" دەزانێت"[٣٨٣] حسێن

---

[٣٨١] ماهنامه یالثارات الحسین، شماره ٢٥، ٧٤/١٢/٢٥، ص٣ همچنین نگاه کنید به شماره ٢١، ص٣.

[٣٨٢] روزنامه کیهان، ٧٥/٨/٢١، ص٢.

[٣٨٣] ماهنامه یالثارات الحسین شماره ٢٠، ٧٤/٨/١٥، ص٢٠.

ئەڵلاکەرەم کە یەکێکە لە سەرانی پشتیوانانی حزبوڵلا بە ڕەخنەگرتن لەو کەسانەی کە ویلایەتی فەقیهیان لە چوارچێوەی دەستووردا قبوڵە، دەڵێت "هەندێك لە چوارچێوەی دەستووردا وەلی فەقیە قبوڵ دەکەن، ئەمەش لە کاتێکدایە کە وە لی فەقیە بۆ پاراستنی ئیسلام دەتوانێت هەندێ بنچینەی ئیسلام دوابخات"[384] ئەم باڵە لە سیاسەت دارشتنی نیزامدا دەوری سەرەکی لە ئەستۆی وەلی فەقیهدا دەبینێت. یەکێك لە ئەندامەکانی پشتیوانانی حزبوڵلا لەم بارەیەوە دەڵێت: "بڕیاردان لەسەر بەرژەوەندی نیشتمانی و ستراتیجی وڵات پێویستە تەنهاو تەنها لەلایەن مەقامی شکۆداری رابەرییەوە بێ"[385] لەم ڕووەوەوە ئەنجومەنی شورای ئیسلامی (پەرلەمان) بە شتێکی کارتۆنی دەزانێت کە تەنها ئەوەی لەسەرە (فەرمان و ڕێنماییەکانی) رابەری شۆڕش پەسەند بکات. پشتیوانانی حزبوڵلا لە بەیاننامەیەکدا بە بۆنەی هەڵبژاردنی خولی پێنجەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامیەوە دەنووسێت: "ئایدیال لای ئێمە بوون بە ئەندام پەرلەمانی کەسانێکە کە.. نەك تەنها فەرمانەکانی مەقامی شکۆداری رابەری بەڵکو ڕێنماییەکانیشی عاشقانە جێبەجێ بکەن"[386] هەروەها لە بەیاننامەیەکی دیکەدا چالاکی باڵەکان بەکارێکی ڕێ پێدراوو بەکەڵك دەزانێت "بەمەرجێك لەسەدا سەد ملکەچی ڕێنماییەکانی مەقامی شکۆداری رابەری بێت"[387].

ئەم باڵە (مۆڵەتی) چالاکی دەزگاکان لەوەدا دەبینێتەوە کە قسەکانی ئیمام و جێنشینەکەی بە (شەرعی و راست)[388] لەقەڵەم بدات. حسێن ئەڵلا کەرەمیش "کۆمەڵگای هەڵبژێر" لە بەرامبەر ئەو کۆمەڵگایەدا دادەنێت کە خودا دەکەن بە میحوەری خۆیان[389].

---

[384] اظهارات الله کرم در ٧٦/١/٣١.

[385] ماهنامه یالثارات الحسین شماره ٢٣، ٧٤/١١/١١، ص٧.

[386] همان شماره ١٠، ٧٤/١٢/١٠، ص٥،٦.

[387] همان، شماره ٢٩، ٧٥/٤/٧، ص٦.

[388] همان، شماره ٣٦، ٧٥/١٢/٢٢، ص١٣.

[389] اظهارات الله کرم در ٧٦/١/٣١.

## ٢-حزبی سیاسی:

باڵی پشتیوانانی حزبوڵڵا دژی چالاکی حزبی سیاسی‌یەو سەرنجدان لە تێڕوانینی ئەم باڵە بۆ ویلایەتی فەقیە -بەو شێوەیەی کە باسکرا- ئەم باڵە زەمینەیەك بۆ چالاکی حزبی سیاسی نابینێ بە دیدگای جیاواز و هەتا دژ بە یەکیشەوە. حسێن ئەڵلا کەرەم لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئەگەر ئێمە فرە مینبەری قبوڵ بکەین و بڵێین کە فەرمانڕەوایی لە ڕێگەی مرۆڤەکانەوەیە دەبێ ویلایەتی فەقیە بخەینە دوای رای خەڵکەوە"[٢٩٠] مەهدی نەصیری بەڕێوەبەری بڵاوکراوەی (صبح)یش دەنووسێت: "پێکادانی راکان.. نەك تەنها بایەخی نی‌یە، بەڵکو دژی بەهایەو دەبێتە هۆی توندبوونی ئاڵۆزیو گومڕایی"[٢٩١] پشتیوانانی حزبوڵڵا لەبەر تێڕوانینی سلبی خۆی بۆ دیمەنەکانی شارستانیەتی خۆرئاوا، ئەو حزبانەش رەت دەکاتەوە کە زادەی دیموکراسی خۆرئاوان. بڵاوکراوەی صبح لە نووسیندا ئەو کەسانەی بەبێ ئاگایی لە (ناپاکی و خیانەتی حزبە سیاسیەکانی خۆرئاوادا لە بەرامبەر میللەتەکانی خۆیاندا" تاوانبار کردووە "کە هەڵبژاردنی نموونەیی تەنها لە چوارچێوەی حزبە سیاسیەکانی نموونەی وڵاتە خۆرئاواییەکاندا دەبینن"[٢٩٢]

## ٣-بەشداریی سیاسی:

پشتیوانانی حزبوڵڵا لەبەرئەوەی باوەڕیان بە چالاکی حزب نی‌یە. بایەخێکی ئەوتۆش بە بەشداری خەڵك نادەن لە چوارچێوەی حزب و ڕێکخراوەکاندا بەشێوەیەکی ڕێك و پێك. بەڵام ئەم گروپە بایەخ بە ئامادەبوونی خەڵك دەدات لە هەڵبژاردن و ڕێپێوانەکاندا بەشێوەیەکی یەکپارچەو بە (کارێکی پێویستی)[٢٩٣] دەزانێت.

---

[٢٩٠] هەمان.

[٢٩١] هفتەنامە صبح، شمارە ٣٨، ٧٤/١٠/١٢، ص١.

[٢٩٢] هفتەنامە صبح، شمارە ٤٢، ٧٤/١١/١٠، ص١٤.

[٢٩٣] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٣٢، ٧٥/٩/١٥، ص١٠.

## ٤-ئازادی:

به حساب کردن بۆ (تێڕوانینی ڕەها)ی پشتیوانانی حزبوڵلاو ئەوەی کە خۆیان بە (ڕاست) و کەسانی دی بە (هەڵە) دەزانن، ئەوە بە ئەرکێکی شەرعی خۆیان دەزانن کە بەکردەوە ڕووبەڕووی (هەڵە) ببنەوە. بەم پێیە ئەم باڵە، ئازادیە سیاسی و یاسایییەکان قبوڵ ناکەن و لایەنگرانی ئەم باڵە بۆ جڵەوگیری لە چالاکی کەسانی تر دەست بەکار دەبن. پشتیوانانی حزبوڵلا لە بەیاننامەیەکدا بە ڕاشکاوی نووسیوویانە "ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە بە شەرتی ڕێ پێدانەوە نەبەستراوەتەوە، چونکە دەستور ئەم ئەرکە شەرعیەی بە ئەرکێکی میللی و جەماوەری لە قەڵەم داوە نەك بە ئەرکێکی (حکومەتی و دەوڵەتی)"[394] بڵاوکراوەی (یالثارات الحسین)یش بە ڕاشکاوانە دەنووسێت "بە هوشیاری و ئامادەبوونی کوت و پڕی ئومەتی حزبوڵلای زنجان جڵەوگیری لە بەڕێوەچوونی مەراسیمی یەکەمین ساڵڕۆژی مردنی موهەندیس مەهدی بازرکان کرا"[395] بۆ مەسەلەی دیکەی لەم بابەتە دەتوانرێ ئاماژە بۆ ڕێگەگرتن لە لێدوانی کۆمەڵێ کەس بکرێ، لەوانەش عەتا ئەڵلای موهاجیرانی جێگری سەرکۆمار لە سەردەمی هاشمی ڕەفسنجانیدا لە مەشهەد دەربارەی سەید جەمالەدینی ئەسەد ئابادی[396]. هەروەها پشتیوانانی حزبوڵلا لە بەیاننامەیەکدا بە بۆنەی دەست بەکاربوونی خولی پێنجەمی پەرلەمانەوە دەنووسێت "حزبوڵلا لە دوای ناسینی کەسانی لیبراڵ لە پەرلەماندا، ئەو کەسانە دەردەکات"[397] ئەم گروپە لە بەیاننامەیەکی دیکەدا تەئکیدی کردەوە کە "بەنیازە پەیمان شکێنان و دەست درێژکاران بۆ سەر ماف و هیواکانی مەزهەب و باوەڕی میللەت ئاگادار بکاتەوەو تەمێیان بکات"[398] بە سەرنجدان لە تێڕوانینی ڕەهای ئەم باڵە، دژی پەرەپێدانی چەندایەتی بڵاوکراوەکان و ئەنجامەکانی لە ساڵانی ١٩٨٩-١٩٩٢دا (بە گورز وەشاندن.. لە فەرهەنگی ئاینی و شۆڕشگێڕانە"ی وڵات وەسف دەکەن[399].

---

[394] دومین بیانیه انصار حزب الله.

[395] ماهنامه یالثارات الحسین شماره ٢٧، ٧٥/٢/١٣، ص٤.

[396] همان، شماره ٣٦، ٧٥/١٢/٢٢/ ص١٠.

[397] همان، شماره ٢٩، ٧٥/٤/٧، ص٦.

[398] همان، شماره ٣٣، ٧٥/٩/١٦/ ص٩.

[399] ماهنامه یالثارات الحسین، شماره ٣٧، ٧٦/٢/١١، ص١٠.

### ٥- پسپۆڕی:

ئەم باڵە لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتدا بایەخێکی ئەوتۆ بە پسپۆڕی نادات. پشتیوانانی حزبوڵڵا لە بەیاننامەیەکدا بە بۆنەی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی‌یەوە لە بەشی تایبەت بە سیفەتەکانی ئەندام پەرلەماندا ئاماژەی بۆ بوونی پسپۆڕی نەکردو ئەم سیفەتانەی لە "پەیڕەوی کردن لە رابەری، ژیان و تێکەڵی لەگەڵ هەژاران و بێ بەشانی کۆمەڵ، بە سادەیی ژیان، پشتیوانی لە دەوڵەتی ئیسلامی و شۆڕشگێڕ لە خەتی ویلایەت"[400]دا کورت کردەوە. جگە لەمەش تێڕوانینێکی رەش بینانەی هەیە بۆ بیانیەکان و باوەڕی بە "تیوری پیلانگێڕی" هەیە، هەروەها تێڕوانینێکی سلبیان هەیە بۆ پسپۆڕان کە زۆربەیان لە خۆرئاوا خوێندنیان تەواو کردووەو ئەم پسپۆڕانە بە وابەستەی بێگانە دەزانن کە لە پێناوی ئامانجەکانی ئەوان دەبزوێن.

### ٦-ئامانج گەرایی، ئامانجداری:

باڵی پشتیوانانی حزبوڵڵا لە بەرامبەر "کاری ئێستادا" باوەڕی بە ئامانجداری هەیەو تەئکید لە پاراستنی بەهاکان دەکاتەوە، هەفتەنامەی "صبح" لەم بارەیەوە دەنووسێت: "ئەوانەی کە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بە ئامانجداری ناتوانرێ کێشەکانی وڵات چارەسەر بکرێ لەبەرئەوە باس لەوە دەکەن کە کاری ئێستاو تەسلیم بوون بە واقیعی بێ بەها کارسازەو گرێی کێشەکان دەکاتەوە، هەم باوەڕی شۆڕشگێڕانە لەناو دەبەن، هەم دوژمنان زاڵ و جەسوور دەکەن و هەم لە کۆتاییدا کێشەکانی وڵات زیاتر دەکەن"[401].

### ٧-ناردنە دەرەوەی شۆڕش:

باڵی پشتیوانانی حزبوڵڵا پارێزەری "ناردنە دەرەوەی شۆڕشە" و لە بەرامبەر "بەرژەوەندی نیشتمانی‌دا" باوەڕی بە (بەرژەوەندی ئیسلامی) هەیەو پێی وایە کە

---

[400] بیانیە شمارە١، انصار حزب الله بە مناسبت انتخابات دورە پنجم مجلس شورای اسلامی.

[401] هفتەنامە صبح، شمارە ٤٢، ٧٤/١١/١٠، ص٢.

پێویسته تواناکانی ولات لەم پێناوە خەرج بکرێن و یارمەتی دارایی بە "شانەکانی بەربەرەکانی جیهانی حزبوڵلا" بدرێ[402]. یەکێ لە پشتیوانانی حزبوڵلا لەم بارەیەوە دەڵێت "بنەمای دژایەتی و رووبەڕووبوونەوەی ئێمە لەگەڵ نیشتمانیەکاندا لەوەدایە کە ئەوان دەیانەوێ تواناکان لە پێناوی بەرژەوەندییە نیشتمانیەکاندا خەرج بکرێت و ئێمەش دەمانەوێ لە پێناوی بەرژەوەندییە ئیسلامیەکاندا بێ، نیشتمانیەکان لە چوارچێوەی سنوورەکان و نیشتمانیانە بیردەکەنەوە، بەلام ئێمە لە چوارچێوەی سنوورەکانی جیهانی ئیسلام بیردەکەینەوە.. ئێمە کاتێك لە لوبنان و بۆ سنیا ئامادە دەبین دەڵێین بەرژەوەندییەکانی ئێمە لەوێیە. ئەم بەرژەوەندیانە ناشێ نیشتمانی بن بەڵکو لە روانگەی ئێمەوە ئیسلامیە. سنووری درزەکانی ئەم بەرژەوەندیانە لە سنووری تواناو سەرچاوەکاندایە.. ئامانجی نیشتمانی ناتوانێت ژیانی درێژخایەنی شۆڕش دابین بکات"[403].

ئەگەرچی ئەم باڵە پشتی بە ناردنە دەرەوەی شۆڕش بەستووە، بەلام "لەکاتی هێرش و هەڕەشەدا بۆ سەر ولات باوەڕی بە پیادەکردنی شێوازی پاراستنی میحوەر هەیە" بەلام لەم حاڵەتەش لە ناردنە دەرەوەی شۆڕش خافڵ نییە"[404].

## ب-بۆچوونەکانیان سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوە:

### ١- پرانسیپەکانی سیاسەتی دەرەوە:

دژایەتی کردنی خۆرئاوا (ئەمریکاو ئەوروپا)، لە سیاسەتی دەرەوەدا باوەڕیان بە سوودوەرگرتن لە ئامرازە دیپلۆماسییەکان نییە، پشتیوانی کردن لە موسوڵمانەکان لە بەرامبەر غەیری موسوڵمانەکاندا، ئەمانەی سەرەوە پرانسیپە گشتیەکانی ئەم باڵەیە لە سیاسەتی دەرەوەدا. ئەم گروپە باوەڕی بە کەڵك وەرگرتن لە ئامرازەکانی دیپلۆماتیك نییە لە سیاسەتی دەرەوەداو سەبارەت بە چالاکی لە چوارچێوەی دام و دەزگا نێودەوڵەتیەکاندا بە مەبەستی دابین کردنی بەرژەوەندییەکانی ولات نائومێدە.

---

[402] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٢٣، ٧٤/١١/١١، ص٧.

[403] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٢٥، ٧٤/١٢/٢٧، ص٧.

[404] همان.

رۆژنامەی (کیهان) روو لە عەلی ئەکبەر ویلایەتی وەزیری دەرەوەی سەردەمی سەرکۆماریی هاشمی رەفسنجانی دەکات و دەنووسێت:

ئەگەر تۆ.. بتەوێ سەر لە هاوکێشە جیهانیەکان دەربکەیت و سەرت لەناو سەراندا بێ نەك تەنها سەرکەوتوو نابیت بەڵکو لەناو بازنەی شارەزایی ئەواندا گیرۆدە دەبێت کە لە پڕ خۆت دەبینی بە تەواوی چەك کراویت و بەرەبەرە دەکەوی. ئێمە لەو فشارانە ئاگادارین کە چنگ لە شانەکانت دەدەن، بەڵام رێگەچارەی رووبەڕووبوونەوەی ئەو فشارانە ئەوە نییە کە وەکو خوێندکارێ پەنجە هەڵبڕین و بڵێین گەورەم ئیجازە هەیە؟[٤٠٥].

## ٢- پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکادا:

ئەم باڵە بە توندی پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکادا رەت دەکاتەوەو هەتا "داوای پەسەندکردنی چەند یاسایەکی کردووە بۆ ئەوەی ئەوانەی کە باس لە پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا دەکەن، بە (قورسترین سزا) سزا بدرێن. هەتا هەڕەشەیان کردووە کە ئەگەر وا نەکرێ "حزبوڵلا ئەرکی سەرشانی جێبەجێ دەکات"[٤٠٦].

## کورتەی بۆچوونە سیاسیەکانی باڵی لایەنگرانی حزبوڵلا

١-باوەڕیان بە چڕکردنەوەی دەسەڵاتە لە دەستی تاکە کەسدا (وەلی فەقیه).

٢-لە هەڵبژاردنی وەلی فەقیهدا خەڵك دەوریان نییەو وەلی لەلایەن خوداوە دانراوە.

٣-ئەرکی خەڵك بە پەیرەوی کردن لە وەلی فەقیهو قبوڵکردنی دەزانێ.

٤-باوەڕیان بە چالاکی سیاسی نییە لە چوارچێوەی دام و دەزگا یاساییەکاندا.

٥-لە کاروباری سیاسیدا خەڵك (ئەرك)یان لە سەرشانە و (ماف)یان نییە.

٦-بەشداری سیاسی خەڵك تەنها لە سنووری بەشداری لە رێپێوانەکان و هەڵبژاردن و بەرنامە رەسمیەکانی دیکەدا دەبینن.

---

[٤٠٥] روزنامه کیهان، ٧٥/١١/٦، ص٢.

[٤٠٦] ماهنامه یالثارات الحسین، شماره ٢٣، ٧٤/١١/١١، اظهارات یکی از انصار حزب الله.

٧-ئەم گرووپە بە یاساوە پابەند نی‌یەو بە ئەرکی شەرعی خۆی دەزانێت کە رووبەڕووی هەر شتێ ببێتەوە کە بەهەڵەی دەزانێت.

٨-لە بۆچوونە سیاسییەکانی ئەم باڵەدا ئامانجداری ئاشکرایە و بایەخی پێ دەدرێ.

٩-ئاراستەی سیاسی ئەم گرووپە بەهایی و ئایدیۆلۆجییەتە.

١٠-بەو پێیەی کە باوەڕی بەناردنە دەرەوەی شۆڕش هەیی پێی وایە کە دەبێ دریغی لە یارمەتی دانی دارایی گرووپە مسوڵمانە خەباتگێڕەکان نەکرێ.

١١-باوەڕی بە ئامرازەکانی دیپلۆماسی نی‌یەو لە پەیوەندی نێو دەوڵەتی‌دا.

١٢-تەئکید لە بەڵێن و پێشینەی شۆڕشگێڕی کەسەکان دەکاتەوەو بایەخێکی ئەوتۆ بە پسپۆڕی نادات.

١٣-بە توندی پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا رەت دەکاتەوەو داوای سزادانی ئەو کەسانە دەکات کە باسی ئەو مەسەلەیە دەکەن.

## ٢-٢-بۆچوونە ئابوورییەکانی باڵی لایەنگرانی حزبوڵڵا

### ١-تایبەتی کردن:

پشتیوانانی حزبوڵڵا دژی تایبەتی کردنی یەکەکانی ئابووری‌یە. ئەم گرووپە خوازیاری (دەستێوەردانی دەوڵەتە) لە ئابووری‌دا لە پێناوی "پشتیوانی لە توێژە چەوساوەکان)ی کۆمەڵدا. یەکێك لە ئەندامانی پشتیوانانی حزبوڵڵا دەڵێت: "پێویستە دەوڵەت لەگەڵ چاوپێداخشانەوەی وەرگرتنی داراییەکان و چاکردنی (نرخ)ی بەرهەمە نەوتیەکان و لابردنی یارمەتیەکاندا.. پشتیوانی لە توێژە چەوساوەکان بکات بە شتێکی عەمەلی"[٤٠٧] یەکێکی دیکە لە ئەندامانی ئەم گرووپە دەڵێت: "لە زەمانی شەڕدا حکومەت داوای لە ئیمام (ر.خ) کرد کە یارمەتی لابرێ، ئیمام لە وەڵامدا فەرمووی: "با دەوڵەمەندەکانیش لەسەر سفرە وەکو چەوساوەکان بن و درێژەی دایە بۆچی پارەدارو دەوڵەمەندەکان لە ریزی خۆراك دەوەستن؟ ئەگەر

---

[٤٠٧] هەمان.

ئێمە بمانەوێ وەزعی ئێستا بگۆڕین[٤٠٨]. بەم شێوەیە ئەم باڵە باوەڕی بە ئابووری ڕکابەری نی‌یەو دوژمنی سەرسەختی چاکردنی ئابووری‌یە[٤٠٩].

### ٢-خۆبژێوی نموونەی ئابووری ئەم گرووپەیە:

بە حسابکردن بۆ تێڕوانینی سلبی ئەم باڵە بۆ بیانیەکان بەتایبەتی تێڕوانینیان بۆ خۆرئاواو لەبەرئەوەی باوەڕیان وایە بیانیەکان هەمیشە لە دژی کۆماری ئیسلامی ئێران پیلان دەگێڕن، ئەم باڵە یەکێك لە ڕێگاکانی بە دەست هێنانی ئامادەیی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بیانیەکان بە وەدی‌هێنانی خۆبژێوی دەزانێت و لەم پێناوەدا پێشنیازی پیادەکردنی سیاسەتی خۆڕاهێنانی ئابووری دەکات و بە (سەرەکی‌ترین سیفەتی ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ دەسەڵاتی دوژمندا لە قەڵەمی دەدات)[٤١٠] لەم بارەیەوە یەکێك لە ئەندامانی پشتیوانانی حزبوڵڵا دەڵێت: "پێویستە خۆ ڕاهێنانی ئابووری لەسەری سەرەوەی مەسەلەکانەوە دابنرێ" ئەم ئەندامە بۆ جێبەجێکردنی ئەم خۆڕاهێنانی ئابوورییە ڕێگەچارەی "نموونەی خەرجی ڕاست و کۆنترۆڵی خەرجی، سنوور دارکردنی هاوردەکان بە دانانی تەعریفە و پشتیوانی لەبەرهەمی ناوخۆ" دەخاتەڕوو[٤١١].

### ٣-کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی:

باڵی پشتیوانانی حزبوڵڵا بە حسابکردن بۆ ئەوەی کە باوەڕی بەتیوری پیلانگێڕی‌و نموونەی ئابووری خۆبژێوی هەیە، کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی بە پێویست نازانێت و تیوری ستراتیجی ئابووریشی "کەم کردنەوەی خەرجی و بڕینی هاوردەیە"[٤١٢]، باوەڕی وایە کە پێویستی بە سەرچاوەی دەرەکی نابێ. سەرەڕای ئەوەی کە ئەم باڵە لە چالاکیە ئابوورییەکاندا (پاراستنی بەهاکان) بە پێویست دەزانێت[٤١٣] و کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی بەو سەرچاوانە دەزانێت کە بەهاکان پێشێل دەکات"

---

[٤٠٨] همان شماره، ٢٣، ٧٤/١١/١١، ص٦.

[٤٠٩] ماهنامه یالثارات الحسین، شماره ٢٢، ٧٤/١٠/٣، ص٧.

[٤١٠] همان، ص٥.

[٤١١] همان، ص٧.

[٤١٢] همان شماره ٢٣، ٧٤/١١/١١، ص٦

[٤١٣] همان.

## ٤- پەرەپێدانی ئابووری:

دادپەروەری کۆمەڵایەتی بەلای باڵی پشتیوانانی حزبوڵڵاوە ئەولەویەتی یەکەمی هەیەو "پەرەپێدانی ئابووری بەبێ دادپەروەری کۆمەڵایەتی و باسکردنی بیناکردن بەبێ پاراستنی بەهاکان مەحکومە"[٤١٤] لەگەڵ ئەمەشدا ئەم باڵە رەخنە لە سیاسەتی ئابووری دوای جەنگ دەگرێت و دەڵێت "لە دوای جەنگ دەبوایە بەشوێن دادپەروەری کۆمەڵایەتی‌دا بچووینایە نەك خۆشگوزەرانی"[٤١٥] پشتیوانانی حزبوڵڵا لە بەیاننامەی ژمارە (١)ی خۆیدا رەخنەی لەو بۆچوونە گرتووە کە پێی وایە پەرەپێدانی ئابووری خۆی لە خۆی‌دا دەبێتە هۆی دادپەروەری کۆمەڵایەتی و دەنووسێت: "ئەم بۆچوونە لەگەڵ بنچینەکانی بیری ئیسلامی‌دا ناکۆکە"[٤١٦].

## ٥-حسابکردن بۆ کێشە ئابوورییە هەست پێکراوەکان:

پشتیوانانی حزبوڵڵا بە حسابکردن بۆ ئەوەی کە تەئکید لە چارەسەرکردنی کێشە ئابوورییەکانی توێژە چەوساوەکان دەکاتەوە، بۆ رووبەڕووبوونەوەی کێشە ئابوورییەکان لە بەرامبەر ئەو بۆچوونەدا کە ئەولەویەت بە گۆڕانی بنەما ئابوورییەکان دەدات، تەئکید لە چارەسەری کێشە ئابوورییە هەست پێکراوەکان دەکاتەوە. بەم پێیە "کۆنترۆڵی هەڵئاوسان، کۆنترۆڵ و رێکخستنی ئاستی دەرامەتەکان بە پارە، پشتیوانی لە بەرهەمی ناوخۆ" لەو رێگایانەن کە بەلای ئەم گروپەوە پەسەندن"[٤١٧]

## کورتەی بۆچوونە ئابوورییەکانی باڵی پشتیوانانی حزبوڵڵا

١-پشتیوانی لە سیاسەتی دەوڵەت دەکات لە کاروباری ئابووری‌دا.

٢-نموونەی ئابووری پەسەندی ئەم باڵە، ئابووری داخراوو خۆبژێوی‌یەو بۆ گەیشتن بەمەش سیاسەتی خۆڕاهێنانی ئابووری پێشنیاز دەکات.

---

[٤١٤] هەمان.

[٤١٥] هەمان.

[٤١٦] هەمان، شمارە ٢٤، ٧٤/١٢/١٠، ص٥.

[٤١٧] هەمان، شمارە ٢٢، ٧٤/١٠/٣، ص٧.

٣-ئەم باڵە بەبێ دادپەروەری کۆمەڵایەتی سیاسەتی پەرەپێدانی ئابووری قبوڵ نی‌یە.

٤-کەم کردنەوەی خەرجی و بڕینی هاوردەکان، ستراتیجی ئابووری پشتیوانانی حزبوڵڵایە.

٥-ئەم باڵە بەتوندی دژی کەڵك وەرگرتنە لە سەرچاوەی دەرەکی.

٦-لە روانگەی پشتیوانانی حزبوڵڵاوە رووبەڕووبوونەوەی ئەو کێشە ئابوورییانەی کە لە ماوەیەکی کورتدا لە توانادایە، لەجیاتی رووکردنە ئەو کێشانەی کە بنچینەیین لە پێشترە.

## ٣-٢-بۆچوونە فەرهەنگیەکانی باڵی پشتیوانانی حزبوڵڵا

دەتوانین بۆچوونە فەرهەنگیەکانی پشتیوانانی حزبوڵڵا لە حسابکردن بۆ رووکەش، پشتیوانی لە سیاسەتی قەدەغەکردن و ئاگادارکردنەوەو رازی بوون بە سنووردارى‌دا کورت بکەینەوە، کە دەتوانرێ لەم میحوەرانەی خوارەوەدا ریزبەندی بکرێن.

### ١-سانسۆر دانان لەسەر بەرهەمە فەرهەنگیەکان بەر لە بڵاوکردنەوە:

پشتیوانانی حزبوڵڵا خوازیاری سانسۆری توندە لەسەر بەرهەمە فەرهەنگیەکان بەر لە بڵاوبوونەوەیان. یەکێك لە ئەندامانی ئەم گروپە روو لە وەزیری فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی دەکات و دەڵێت: "لە پاسەوانیی سنوورەکانی ئایدیۆلۆجی ئیسلام و شۆڕشدا.. تۆ نوێنەری یاساییت، بە وردی کۆنترۆڵی سیناریۆکان بکە.. بوار بەوانە مەدە کە بەشێوەیەکی دیکە بیردەکەنەوە، سانسۆری وردو پسپۆڕانە دەبێ تایبەت بێ بە ناواخن و ناوەرۆکی کتێبەکان. متمانە بە ناشر بەس نی‌یە" هەروەها درێژەی دەداتێ: "چاپەمەنی نابێ ئەم خاڵانەی تێدابێت.. سەرلەبەری رەخنە بێت، هێزە چەکدارەکان بخاتە ژێر پرسیارەوە، نووسین بە پێچەوانەی ئیسلام و پاکژیی گشتی‌یەوە، نووسین بە پێچەوانەی رێڕەوی میللەت و وڵاتە ئیسلامیەکان و کەرامەتی کۆماری ئیسلامیەوە. بڵاوکردنەوەی نووسینی گومڕاکەرو ئەو نووسینانەی کە خەریکی بڵاوکردنەوەی گەندەڵی ئەخلاقین، هەروەها ناونیشانی لاوازکردن و یان مایەی فیتنە کە هەموو ئەمانە رەت کراونەتەوە"[٤١٨].

---

[٤١٨] هەمان، شمارە ٢٣، ٧٤/١١/١١، ص٧.

## ٢-دژایەتی کردنی هەمەجۆری و زیادکردنی بەرهەمی فەرهەنگی:

پشتیوانانی حزبوڵڵا دژی زیادکردنی بەرهەمی فەرهەنگی و هەمەجۆری فەرهەنگی‌یە. تا ئەو شوێنەی کە بڵاوکراوەی یالثارات الحسین "یەکێك لە زەمینە دیارەکانی هێرشی فەرهەنگی بەسەرهەڵدانی چەند سەد بڵاوکراوەیەك لەم ساڵانەی دواییدا" لە قەڵەم دەدات"[419].

## ٣-هێرشی فەرهەنگی:

بە حسابکردن بۆ باوەڕی ئەم باڵە بە (تیوری پیلانگێڕی) ئەم باڵە دژی هەر جۆرە ئاڵوگۆڕێکی فەرهەنگین تا ئەو رادەیەی کە بڵاوکراوەی یالثارات الحسین بە رەخنەگرتن لەو کەسانەی کە باوەڕیان وایە "بۆ گەشەپێدان و پەرەپێدانی فەرهەنگی وەکو پێویست دەبێ دانوستاندنی فەرهەنگیمان لەگەڵ خۆرئاوادا هەبێ" بە مەعنای ئەوە لێك دەدەنەوە کە "تا ڕادەیەك بەشێوەیەکی یەکلایەنە سنوورەکانی بیروباوەڕی خۆمان لابەرین"[420] تێڕوانینی سلبی ئەم گروپە تاڕادەیەکە کە هەتا دژی وەرگێڕانی وتارو نووسینەکانی بڵاوکراوەکانی خۆرئاواشەو بە (یەکێك لە زەمینە دیارەکانی هێرشی فەرهەنگی) وەسفی دەکات. بڵاوکراوەی یالثارات الحسین دەنووسێت "یەکێك لە بوارە دیارەکانی هێرشی فەرهەنگی.. وەرگێڕان و دەنگدانەوەی بابەتی بڵاوکراوەو نەنگین نامەکانی خۆرئاوایە کە بێئەوەی بمانەوێ لە خزمەتی رەواج پێدانی بانگەشەی دژی دینی و دژی فەرهەنگیی دوژمنانی جیهانیدان"[421]

## ٤-حسابکردن بۆ رووکەشی فەرهەنگی:

پاراستنی شکڵ لە روانگەی باڵی پشتیوانانی حزبوڵڵاوە گرنگی‌یەکی زۆری هەیە کە جۆری بەرگ پۆشین، جۆری حیجابی ژنان، جیاکردنەوەی ژنان و پیاوان لە شوێنە گشتیەکاندا لەوانەن. یەکێك لە پشتیوانانی حزبوڵڵا ئەو کەسانە ئاگادار دەکاتەوە کە جل و بەرگی ناپەسەندی خۆرئاوایی دەپۆشن و بوینباخ و یەخە دەبەستن ئەو جل و بەرگانە لەبەر نەکەن. هەروەها هەڕەشە دەکات کە حزبوڵڵا رووبەڕوویان دەبێتەوەو

---

[419] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٣٠، ٧٥/٥/٧، ص٦.
[420] همان، شمارە ٢٧، ٧٤/١٢/٢٧، ص٨.
[421] همان، شمارە ٣٠، ٧٥/٧، ص٦.

ناودەمی ئەو کەسانە دەکوتێتەوە کە رەواج بە ناپەسەندی دەدەن"[٤٢٢] لە لایەکی دیکەوە بڵاوکراوەی یالثارات الحسین روو لە ژنان دەکات و دەنووسێت "جگە لە چارشێوەی رەش هیچ جۆرە چارشێوێك شایستەی ژنی ئێرانی نییە"[٤٢٣] ئەم گرووپە ئاگاداری (صداو سیما) (تەلەفزیۆن) دەکاتەوە کە واز لە (پەخشی ئەو پێشبڕکێ وەرزشیانە بێنن کە یاریکەرانیان بەرگی تەواو ئیسلامیان لەبەردا نییە بەتایبەتی سەبارەت بە پێشبڕکێی کە تەماشاکردنی بۆ نیوەی کۆمەڵ حەرامە"[٤٢٤] بڵاوکراوەی ئەم باڵە رەخنە لەوە دەگرێ کە (پەیکەری ژنانی پاڵ کەوتوو.. لە کەناری مۆزەخانە هونەرییە هاوچەرخەکانی تاران"ەوە هێشتا بەدی دەکرێ"[٤٢٥].

بەشێوەیەکی گشتی پێشنیازەکانی پشتیوانانی حزبوڵڵا بۆ ریفۆرمی فەرهەنگی کۆمەڵایەتی گرنگی پاراستنی شکڵ لە روانگەی ئەم باڵەوە نیشان دەدات کە بەپێی بڵاوکراوەی یالثارات الحسین بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١-دەبێ حەفتەیەك وەکو حەفتەی بەربەرەکانی فەرهەنگی ناپەسەندی خۆرئاوا ناوبەرین و هەڵمەتێکی فراوانی بۆ بکەین.

٢-لەهەر حەفتەیەکداو لە سەعاتێکی دیاری کراودا، لە تەلەفزیۆندا لە هێرش بکۆڵرێتەوە.

٣-بەربەرەکانی هێرشی فەرهەنگی خۆرئاوا بەهەموو شێوەکانیەوە بکرێ بە شتێك لەوانەی رەسمی خوێندکاران.

٤-بەربەرەکانی لەگەڵ فەرهەنگی خۆرئاوادا شێوەیەکی یاسایی لەخۆ بگرێ، پەرلەمان بەیەك دەنگی، مادەی پێویست پەسەند بکات بێ چەندو چون کاری پێ بکرێ.

٥-حیجابی ئیسلامی لە هەموو رەهەندە فیقهی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و سیاسی و هتد. بکرێ بە بەشێك لە دەرسی خوێندکارە کچەکان لە هەموو قۆناغەکانی خوێندندا.

---

[٤٢٢] همان، شماره ٢٣، ٧٤/١١/١١، ص٥.

[٤٢٣] همان، شاره ٢٧، ٧٤/١٢/١٢، ص١١.

[٤٢٤] همان، ص١٨.

[٤٢٥] همان، شماره ٢٥، ٧٤/١٢/٢٧، ص١٧.

٦-حەفتەیەك بەناوی حیجابی ئیسلامیەوە دیاری بکرێ و رابگەیەنرێ.

٧-جیاکردنەوەی ژن و پیاو بەتایبەتی خوێندکارانی زانکۆ.. جگە لە حاڵەتە ناچارییەکاندا بە پشتیوانی یاسا ئەنجام بدرێ[٤٢٦].

٨-لێدانی کاسێتی گۆرانی ناپەسەند لە ماشینەکاندا دەبێ وەکو سەرپێچی یاسا قابیلی لێپێچینەوە بێ.

٩-شۆفێرانی تاسکی و قەمەرەو پاس دەبێ بەپێی یاسا ژنانی بەد حیجاب سوار نەکەن لەکاتی سەرپێچیدا سزا بدرێن[٤٢٧].

### ٥-ئەولەویەت دان بە مەسەلە فەرهەنگیەکان:

باڵی پشتیوانانی حزبوڵلا ئەولەویەتی یەکەمی کۆماری ئیسلامی بە مەسەلە فەرهەنگیەکان دەزانێت و بەشێوەیەکی گشتی شۆڕشی ئیسلامی بە شۆڕشێکی فەرهەنگی لە قەڵەم دەدات. بەم پێیە باوەڕی وایە دەبێ لە سیاسەت دارشتنیشدا بایەخ بەم ئەولەویەتە بدرێ. بڵاوکراوەی ئەم باڵە دەنووسێت "دەبێ پرۆژە فەرهەنگیەکانی وڵات.. دوو ئەوەندەی پرۆژە ئابوورییەکان بن"[٤٢٨].

### ٦-چالاکیە فەرهەنگیەکان لەژێر چاودێری روحانیەکاندا بێ:

بەشێوەیەکی گشتی ئەم باڵە لەبەر ئەو حەساسیەتەی کە سەبارەت بە مەسەلە فەرهەنگیەکان هەیەتی باوەڕی وایە کە دەبێ ئەم جۆرە چالاکیانە "هەتا لە توانا بێ لەژێر چاودێری ویلایەتی کاروباری مسوڵمانەکان"دا بێو (سەرۆکایەتی دام و دەزگا فەرهەنگیەکان بە زانا ئاینیەکان بسپێردرێ" بۆ ئەوەی رێگە لە سەرهەڵدانی لادان بگیرێ[٤٢٩].

### ٧-دژایەتی کردنی چالاکی کۆمەلایەتی ژنان:

پشتیوانانی حزبوڵلا دژی جیانەکردنەوەی مەیدانەکانی چالاکی ژنان و پیاوانەو بەشێوەیەکی گشتی هێندە باوەڕی بەچالاکی کۆمەلایەتی ژنان نیەو ئەرکی ژنان تەنها بە "خزمەتی مێردو منداڵ بەخێوکردن" دەزانێت. مەهدی نەسیری بەڕێوەبەری

---

[٤٢٦] ماهنامه یالثارات الحسین، شماره ٢٠، ٧٤/٨/١٥، ص٨.
[٤٢٧] همان، شماره ٣٣/ ٧٥/٩/١٥، ص١٨.
[٤٢٨] ماهنامه یالثارات الحسین، شماره ٢٠، ٧٤/٨/١٥، ص٨.
[٤٢٩] هفتەنامه صبح، شماره ٤٢، ١-/٧٤/١١، ص١.

بڵاوکراوەی (صبح) دەنووسێت "ئیسلام.. بۆ هەریەکە لە ژن و پیاو باوەڕی بە مەیدانی چالاکی جیاواز هەیەو کەمال و نیزامی کۆبوونەوە لەم کۆبوونە نیسبیەدا بە ئەرك دەزانێت.. ئەوەی کە دەشێ مایەی شانازی ژن بێ ئەوەیە کە بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ سروشت و هەل و مەرجی سروشتی و بوونی خۆیدا -کە بەلای خوداشەوە پەسەندە ڕەفتار بکات. نصیری بۆ سەلماندنی بۆچوونەکەی خۆی ئاماژە بۆ دوو بەسەرهات دەکات کە یەکێکیان (جیهادی ژن و باش ژنێتی کردنە)و ئەوی دیکەیان ئەوەیە کە فاتمە لە وەڵامی پێغەمبەردا (د.خ) دەربارەی ئەوەی کە باشترین حاڵەت و مەوقیعی ژن کامەیە وەڵامی داوەتەوە (ئەو کاتەیە کە لە ماڵەوە سەرقاڵی ژن و مێردایەتی و بەخێوکردنی منداڵە"[٤٣٠] شێوەی ڕەنگدانەوەی هەواڵی تایبەت بە بەشداری کچان لە پێشبڕکێی بازدانی ئەسپ بەسەر بەربەستەکاندا لە بڵاوکراوەی (صبح)دا نموونەیەکی دیکەی دژایەتی ئەم باڵەیە بۆ ئەم چالاکیانە. "بەدەست پێشخەری یاریدەدەری کۆمەڵایەتی بەڕێوەبەری شارەوانی تاران لە پێناوی بەرزکردنەوەی ئاستی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی کچانی وڵات و بەشداری زیاتریان لە پەرەپێداندا، یەکەمین خولی پێشبڕکێی بازدانی ئەسپ بەڕێوەچوو"[٤٣١]

٨-خەڵوەکێشی:

پشتیوانانی حزبوڵلا باوەڕیان وایە بۆ دوورنەکەوتنەوە لە مەعنەویات و خودا تا ڕادەی پێویست دەبێ لە "ئیمکانیاتی خۆشگوزەرانی" دنیا دورەپەرێز بێ. بەم پێیە دەتوانرێ بگوترێ کە حەزیان لە جۆرێك خەڵوەکێشی هەیە. ئەم گروپە بە تەئکیدکردنەوە لەسەر دەرکردنی ئەو کەسانەی کە خەڵك بەرەو وەزعێکی لەو جۆرە دەبەن دەنووسێت "کەسانێك کە ئامانجە سەرەکیەکانیان مەسەلەی مادی" هاندان بۆ خەرج کردن، خۆشگوزەرانیو..)یەو بە خستنەڕووی دروشمی سەرگەرم کەر لە ئاستی پێویستی ڕۆژانەدا، بەندەکانی خودایان گیرۆدەی غەفڵەت کردووە لە خوداو مەعنەویەت و دوارۆژو لە ژیانیاندا بەرەو لێدانی فیکری -عەمەلی دەیانبەن، ئەو کەسانە سەبەبکاری دروست کردنی مەترسین ئەگەر لەلایەن خەڵك و بەرپرسانە ترۆ نەکرێن، میللەت وڵات و شۆڕشەکەمان بەرەو ئاوات و ئامانجی خۆرئاوا دەبەن"[٤٣٢]

---

[٤٣٠] هفتەنامە صبح، شمارە ٤٢، ٧٤/١١/١٠، ص١.

[٤٣١] همان، شمارە ٣٨، ٧٤/١٠/١٢، ص٩.

[٤٣٢] همان، شمارە ٤٢، ٧٤/١١/١٠، ص١٤.

## کورتەی بۆچوونە فەرهەنگیەکانی
## باڵی پشتیوانانی حزبوڵڵا

١-ئەم باڵە باوەڕی بە سانسۆری بەرهەمە فەرهەنگیەکان هەیە بەر لە بڵاوکردنەوەیان.

٢-باڵی پشتیوانانی حزبوڵڵا دژی زیادکردنی و هەمەڕەنگی بەرهەمی فەرهەنگین.

٣-ئەم باڵە دژی ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی‌یەو خوازیاری ڕووبەڕووبوونەوەی توندە لەگەڵ هێرشی فەرهەنگی‌دا لە دژی کۆماری ئیسلامی.

٤-ئەم باڵە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشی فەرهەنگی خۆرئاوا باوەڕی بە سیاسەتی قەدەغەکردن و سزادانە.

٥-پشتیوانانی حزبوڵڵا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوەی کە بە لادانی دەزانن خۆی بەشێوەی ڕاستەو دەست لە مەسەلەکە وەردەدات و هەندێ جار توندوتیژیش بەکاردێنێ.

٦-ئەم باڵە بایەخێکی زۆر بە پاراستنی ڕووکەشی فەرهەنگی دەدات.

٧-بەڕای پشتیوانانی حزبوڵڵا چالاکیە فەرهەنگیەکان پێویستە لەژێر سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی ڕوحانیەکاندا ئەنجام بدرێ.

٨-بەڕای ئەم باڵە مەسەلە فەرهەنگیەکان لە شۆڕشی ئیسلامی‌دا ئەولەویەتی یەکەمیان هەیەو لە سیاسەت دارشتندا دەبێ بایەخ بەم خاڵە بدرێ.

٩-پشتیوانانی حزبوڵڵا لە کاروباری فەرهەنگی‌دا بە توندی کۆن خوازن و لە گۆڕینی دەزگاکان و پەیوەندییەکانی لەم بەشەدا دەترسن.

١٠-ئەم باڵە دژی چالاکی کۆمەڵایەتی ژنانە.

١١-پشتیوانانی حزبوڵڵا بۆ جڵەوگیری لە ئارەزووی مادی باوەڕیان بەجۆرێك خەڵوەکێشی هەیە.

## هەڵوێستە سیاسی و ئابووری و فەرهەنگیەکانی گروپی کارگوزارانی سازندەگی ئێران

### ٢-١-بۆچوونە سیاسیەکانی گروپی کارگوزاران:

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەم گروپە کە دەتوانرێ لە هەڵوێستە سیاسیەکانیاندا بەدی بکرێ "تێڕوانینی پراگماتی"یە. تایبەتمەندی دیکەی ئەم گروپە کە دەتوانرێ بە ئەنجامی هەمان تێڕوانینی سەرەوە لێك بدرێتە بریتییە "بیرکردنەوە لە بەرژەوەندی" و "میانەڕەوی" لە مامەڵە لەگەڵ گۆڕانکارییە سیاسیەکاندا.

دەتوانین بۆچوونە سیاسیەکانی ئەم باڵە لە کاروباری ناوخۆدا، لەم میحوەرانەی خوارەوەدا ریزبەندی بکەین.

ئەلف- تێڕوانینیان سەبارەت بە حکومەت:

**١-ویلایەتی فەقیهو رابەری و خەڵك:**

ئەم گروپە باوەڕی وایە کە "لە نیزامی کۆماری ئیسلامی ئێراندا، شەرعیەتی هەموو دەزگاکان لە ویلایەتی رەهای رابەرییەوە سەرچاوە دەگرێ و بەم پێیە ویلایەتی رەهای فەقیە، بەردی بناغەو میحوەری هەرجۆرە جوڵەیەکی نیزامە"[٤٣٣] لەگەڵ ئەوەشدا تەئکید لە رۆڵی خەڵك لە کۆماری ئیسلامیدا دەکاتەوەو باوەڕی وایە نیزامی بنیات نراو لەسەر ویلایەتی فەقیە، رۆڵی خەڵك لەو ویلایەتەدا رەت ناکاتەوە. لەم پێناوەدا ئەم باڵە (هەڵبژاردنی کەسێکی باشتر) بۆ سەرکۆمار لە ئەستۆی خەڵکدا دەبینێ و بەوە قایلە کە تەنها لە رووی زانستیەوە "بنەماکان" شیبکەنەوە، بەڵام دەبێ خەڵك "بەپێی بۆچوون و شیکردنەوەی خۆیان سەرکۆمار هەڵبژێرن"[٤٣٤].

---

[٤٣٣] روزنامە همشهری، ٧٦/٢/٢٦، ص١.

[٤٣٤] همان.

### ٢-حزبایەتی:

ئەم گروپە باوەڕی بە چالاکی سیاسی هەیەو باوەڕیشی بەوە هەیە کە چالاکیە سیاسیەکان لەناو ولاتدا دەبێ لە چوارچێوەی حزبدا رێك بخرێن. عەتا ئەڵڵای مهاجرانی کە یەکێکە لە ئەندامە سەرەکیەکانی گروپی کارگوزاران لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت: "بەداخەوە ئێمە لە ئێراندا رێکخراوی سیاسیمان نی یە.. ئەو رێکخراوە سیاسیەمان نی یە کە هەڵوێستی خۆی ئاشکرا بکات.. بە پشتیوانی خوا دەبێ هەوڵ بدەین رێکخراوی سیاسی دیاریکراو لە ناونیشان و گەشەی تایبەتی خۆیانەوە، لەکۆمەڵدا فۆرمەڵە ببێ"[٤٣٥] هەفتەنامەی (بهمن) لەم بارەیەوە دەنووسێت: "پێویستە هەڵبژاردن لە حاڵەتی رکابەریی نێوان کەسەکانەوە بگۆڕدرێ بۆ رکابەریی نێوان پلان و بەرنامەکان.. ئەم کارەش لە زاڵبوونی رێکخراوێکی رەسمیو دیاری کراودا لە توانادایە"[٤٣٦].

ئەم گروپە لە چوارچێوەی یاسادا باوەڕی بە چالاکی سیاسی هەیە و "بەکارهێنانی شێوازی نایاسایی و توندوتیژی بۆ لە مەیدان دەرکردنی رکابەران" رەت دەکاتەوە[٤٣٧]. مهاجرانی لە چاوپێکەوتنێکی دیکەدا تەئکید لە پێویستی دروست کردنی حزبی سیاسی کردۆتەوەو دەڵێت: "لە حاڵی حازردا مەیدانی چالاکی سیاسی گروپەکان هێندە رۆشن نی یەو بۆ چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە پێویستە ئەو گروپانەی کە لە گۆڕەپانەکەدان بەشێوەیەکی رەسمی، بەرنامەو چۆنیەتی رێکخستن و ئامانجەکانیان لە قالبی حزبی سیاسیدا رابگەیەنن" مهاجرانی ئەو مەسەلەیەی رەت کردۆتەوە کە سەرهەڵدانی حزبی سیاسی رەنگە ولات توشی ململانێ و کێشەی سیاسی بکات[٤٣٨] و لە گفتوگۆیەکدا بە تەئکیدکردنەوە لە دەزگاکان و حزبی سیاسی دەڵێت "پێویستە باوەڕمان بە خەڵك هەبێ و ئەوە بزانین کە خەڵکی ئێران هەرگیز تووشی هەڵە نابن، پێویستە بە رێکخستنی دەزگاکان و

---

[٤٣٥] روزنامە ابرار، ٧٥/٩/١٣، ص٢.

[٤٣٦] هفتەنامە بهمن، شمارە ١٠، ٧٤/١٢/١٤، ص٢.

[٤٣٧] همان، شمارە ١٤، ٧٥/١/٢٥، ص١٤.

[٤٣٨] روزنامەهای ٧٤/٩/٢٢.

حزبی سیاسی زەمینەی ئامادەبوونی خەڵك لە مەیدانی کردەوە سیاسیەکاندا ئامادە بکەین، بۆ ئەوەی کۆمەڵ لە هەورازو نشێوەکانی خۆیدا بینەری گۆڕانکاری سەرسوڕهێنەر نەبێت"[٤٣٩].

***بەشداری سیاسی:**

گروپی کارگوزاران تەئکید لە گرنگی بەشداری خەڵك لە چالاکیە سیاسییەکاندا دەکاتەوەو باوەڕی وایە "دابین کردنی مافە بنەڕەتیەکانی هاوولاتیان لە کارکردندا" یارمەتی (ئامادەبوون و بەشداریی کاریگەری خەڵك دەدات لە گۆڕەپانی سیاسەتدا) لەم بارەیەوە کارگوزاران ئاماژە بۆ کۆمەڵێ مافی بنچینەیی هاوولاتیان دەکات وەکو (نەبوونی ترس لە بەندکردن و گرتنی بێ حساب، ئازادی قسەکردن و بلاوکردنەوەو کۆبوونەوە (مافی کۆبوونەوەو گفتوگۆکردن لەسەر مەسەلە سیاسییەکان)، ئازادی داواکردنی گروپ بەندی (مافی دروست کردنی حزب و یەکێتیەکان و کۆمەڵەکانی دیکە) بوونی دەزگای داوەری و دادگای سەربەخۆ کە هەرکەسێ بۆ داخوازی دەستی پێیان بگات"[٤٤٠] ئەم گروپە تەئکید لەوە دەکاتەوە کە بۆ بەشداریی سیاسی خەڵك پێویستە کۆسپەکانی بەردەم پەرەپێدانی سیاسی لابرێن. ئەو کۆسپانەی کە لەم بارەیەوە ئاماژەیان بۆ دەکات بریتین لە "ئەو ڕێوشوێنانەی کە دەبنە هۆی زیاتر چڕبوونەوەی سەرچاوەکانی دەسەلات، ئەو تێڕوانینانەی کە بە ڕێگایەك لەسەر ڕێگەی ململانێی ئاشتیخوازانەی سیاسیدا کۆسپ دروست دەکەن، هەموو ئەو ئارەزووانەی کە هەوڵ دەدەن بۆشاییە کۆمەلایەتیەکانی ئێمە بە شێوەی ناکۆکی ئاشتی قبوڵ نەکەر لێك بدەنەوە"[٤٤١] ئەم گروپە باوەڕی بە بەشداری سیاسی خەڵك هەیە لە چوارچێوەی دەستووریداو دژی ئەو بۆچوونانەیە کە هێزە سیاسیە چالاکەکان لە چوارچێوەی نیزامدا بۆ شۆڕشگێرو دژی شۆڕش جیادەکەنەوە، بەو بەهانەیەی کە دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی بەشداری سیاسی خەڵك، هەروەها تەئکید لەوە دەکاتەوە کە "هیچ کێشەیەك بۆ نیزامێکی سیاسی و جەماوەری لە دەرکردنی بەشێك لە خەڵك لە گۆڕەپانی سیاسەت مەترسیدار تر نی یە"[٤٤٢]. کارگوزاران هێندە گرنگی بە بەشداری سیاسی خەڵك دەدات بۆیە ڕەخنە لە (ئەنجومەنی نگهبان) دەگرێ

---

[٤٣٩] روزنامه ایران، ٧٦/٥/١٧، ص٣.
[٤٤٠] هفتەنامه بهمن، شماره ٨، ٧٤/١٢/٥، ص٢.
[٤٤١] هفتەنامه بهمن، شماره ٢، ٧٤/١٠/٢٣، ص١٢.
[٤٤٢] همان، شماره ١، ٧٤/١٠/١٦، ص٦.

بەشـداری سیاسـی خـەڵك دەدات بۆیـە رەخنـە لـە (ئەنجومـەنی نگـهبان) دەگـریٚ لەبەرئەوەی سەڵاحیەتی هەندێ لە داواکارانی رەت کردۆتەوە بۆ خۆ هەڵبژاردن بۆ نوێنەرایەتی لە ئەنجومەنی شورای ئیسلامیدا. بەپیٚی هەفتەنامـەی بـهمن: "زۆری ژمارەی ئەو کەسانەی کە سەڵاحیەتیان تەئید نەکراوە، سنووردار تر کردنی بازنەی هـەڵبژاردنی خەڵکـە. لـە هـەل و مـەرجێکی لـەو جـۆرەدا دەنگـدەران هـەلێکی سـنووردارتریان لەبەردەسـتدایە بـۆ هـەڵبژاردنی مـەیل و بەرنامـە جیاوازەکـانی ئابووریو کۆمەلایەتی. هەر بۆیە ئەو کەسانەی کە سەلیقەو هەستی خۆیـان لـەناو فەهرەستە تەئیدکراوەکاندا نابیننەوە، ئارەزوویەکی کەمتریان دەبێت بۆ بەشداری لە (هەڵبژاردندا) ئەم بڵاوکراوەیە لە درێژەی نووسینەکەیدا ئەم هەنگاوەی بە "کـەم و کورتـی لـە رەوتـی پـەرەپێدانی سیاسـی و کۆسـپێك لەسـەر رێگـەی پـەرەپێدانی هەمەلایەنەی ئێران" وەسف کردووەو درێژەی دەداتێ ئەوەی کە (٤٠٪)ی داواکارانی خۆ هەڵبژاردن بۆ پەرلەمان لەلایـەن (شـورای نگـهبان)ەوە پەسـەند نـەکران "مایـەی نیگەرانی و ئاراستەکردنی پرسیاری جدییە لەم بارەیەوە"[443] عەتا ئەڵڵای مهاجرانی بە ئاماژە بۆ ئەوەی کە بەشداریی خەڵك لە پێکهاتـەی سیاسـی ولاتدا نابێ بەشێوەی رووکەش بێ، بۆ بەشـداری خـەڵك بەسـێ خـاڵ قایلـە، کـە بـەم شـێوەیەی خـوارەوە ریزبەندیان دەکات:

ئەلف: هوشیاری خەڵك دەربارەی مەسەلەی بەشداریی، بۆ نموونە رۆڵی پەرلەمان، ئـەرك و دەسـەلاتەکانی پەرلـەمان بـە باشـی بزانێـت و لـە دەرفـەتێکی لۆجیکـی و گونجاودا ئەوە دەست نیشان بکەن کە چ کەسانێ سەڵاحیەتی نوێنەرایەتیان هەیە.

ب-دەسەلات و توانای هەڵبژاردنی کەسانی باشتر، بەشێوەیەك کە خەڵك گومان لەوە نەکەن کە داواکارانی شایسـتە نـاتوانن خۆیـان هـەڵبژێرن، یـان ئەگـەر خۆیـان هـەڵبژارد بیرۆکراسـی لێکۆڵینـەوەی سـەلاحیەتی کـاندیدا، بـواری دەنگدانـی خەڵك تەسك دەکاتەوە.

ج-دڵسۆزی و چاودێری کردن بۆ مەسەلەی بەشداریی[444].

---

[443] همان، شماره ۹، ۷٤/۱۲/۱۲، ص۳.

[444] همان، شماره ۸، ۷٤/۱۲/٥، ص۲.

## ٤-ئازادی:

عەتا ئەڵلای مهاجرانی باوەڕی بە مامەڵە هەیە شان بە شانی ئاسانکاری لەگەڵ بۆچوونە جیاوازەکان و بە دروست بوونی کەش و هەوایەك قایلە کە "حورمەت و متمانەی خاوەن بۆچوون و ئەندێشە بپارێزرێ" و بواری خستنە رووی بۆچوون و ئەندێشەکان هەبێ "لە هەمان کاتدا رەنگە ڕای بەرامبەر رەت بکرێتەوە" مهاجرانی دژی ئەوەیە کە "جیاوازی بۆچوون و سەلیقە بکرێت بە بنەمای داوەری و هەر رۆژەی کەسێك یان گرووپێك بخرێتە کەنارەوە" و تەئکید لە کەڵك وەرگرتن لە توانای "هەموو کەس و گرووپەکان لە پەرەپێدانی بیناکردنەوە"دا دەکاتەوە[٤٤٥]. هەفتەنامەی بهمن یش لەم بوارەدا تەئکیدی لە پاراستنی (حەرەمی خاوەن بۆچوون و بیرمەندانی کۆمەڵ" کردۆتەوەو (شکاندنی ئەم حەرەمەی هەر رۆژە بە بیانویەکەوە" بە فاکتەرێك زانیووە کە (بەدی هێنانی) پەرەپێدان و دادپەروەری کۆمەلایەتی و جێگایەکی پێویست لە جیهاندا بۆ ئێران دەکات بە خەیاڵێکی مەحال"[٤٤٦]. ئەم گرووپە باوەڕی بە ئازادی خستنەرووی بۆچوونە جیاوازەکان هەیە لە کۆمەڵدا. هەفتەنامەی (بهمن) "هەوڵدان بۆ تاك بیری و.. گەڕانەوە بۆ کۆمەڵگای سەرەتایی بەبیری قاڵبی ستانداردکراو" رەت دەکاتەوە"[٤٤٧].

گرووپی کارگوزاران تەئکید لە ئازادی چاپەمەنی دەکاتەوەو دژی بەکارهێنانی فشارو سنووردارکردنی چاپەمەنیەو رەخنە لە پوچەڵ کردنەوەی مۆڵەتی بلاوکردنەوەی چاپەمەنی دەگرێت. هەفتەنامەی بهمن دەنووسێت: "یاسای چاپەمەنی رای لەسەر مانەوەی بلاوکردنەوەی بلاوکراوەکان داوەو جگە لە دوو حاڵەتی تایبەتی ئەگەری پوچەڵ کردنەوەی دوسێی بلاوکردنەوەی بلاوکراوەکانی نەهێشتۆتەوە. فراوانکردنی پوچەڵ کردنەوەی ئیمتیازی بلاوکراوەکان، نەریتێکی باش نیەو لەگەڵ بنچینەو رێگاکانی مافی چاپەمەنی و مافی پاداشت وەرگرتن نەك تەنها ناگونجێ بەڵکو دژیشی دەوەستێتەوە"[٤٤٨].

---

[٤٤٥] هفتەنامە بهمن، شمارە ١، ٧٤/١٠/١٦، ص٢.
[٤٤٦] همان، شمارە ١٧، ٧٥/٢/٨، ص٢.
[٤٤٧] همان.
[٤٤٨] همان، شمارە ٧، ٧٤/١١/٢٨، ص٩.

هەروەها ئەم گروپە خوازیاری ئامادەبوونی بەهێزی چاپەمەنییە لە مەیدانی سیاسی ولآتدا و باوەڕی بەوە هەیە کە دەزگاکانی ڕاگەیاندن دەوری چاودێر ببینن نەك هەرشتەکان عەکس بکەنەوە.

هەفتەنامەی بهمن دەنووسێت "لە کۆمەڵدا، هێشتا دەزگاکانی ڕاگەیاندن توانای پێویست یان بەدەست نەهێناوە.. دەزگاکانی ڕاگەیاندن بۆچوونیان سەبارەت بە خۆیان ئەوەیە کە دەبێ دەوری عەکس کردنەوە ببینن بەڵام کەمتر خۆیان بە بەرپرس لە لێکۆڵینەوە دەزانن کە دەتوانن سەبارەت بە مەسەلە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵ لێکۆڵینەوە بکەن و کەم و کورتیەکان ئاشکرا بکەن. بۆچوونی دەزگاکانی جێبەجێکردن سەبارەت بەم جۆرە ڕاگەیاندنە، ئەوەیە کە چالاکیەکانی ئەوان عەکس بکاتەوە. دەزگاکانی جێبەجێکردن کۆسپێکی زۆر لە ڕێگەی گەیشتنی هەواڵ بە دەزگاکانی ڕاگەیاندن دروست دەکەن"[٤٤٩].

**٥-ناردنە دەرەوەی شۆڕش:**

گروپی کارگوزاران لە جیاتی ناردنە دەرەوەی شۆڕش بایەخ بە ناوخۆ دەدات و باوەڕی بە بیناکردنی ولآت و نیشاندانی ئەو نموونەیەیە بە جیهان، هەفتەنامەی بهمن لەم بارەیەوە دەنووسێت: "کاریگەرترین ڕێگە بۆ کاریگەری لەسەر هەموو ولآتەکان لە جیهانی ئێستادا نموونەکارییە. تەنها ولآتێك لە هەل و مەرجی فیعلیدا دەتوانێت ئامانج و بەهاکانی خۆی بەجیهاندا بلآوبکاتەوە کە بتوانێ ئەوە نیشان بدات لەبەر ڕۆشنایی بەدیهاتنی بەهاکانیدا، گەل بە ئاستێکی باش لە خۆشگوزەرانی گەیشتووە و ئاسایشی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی، بەشداری سیاسی و ئازادییەکانی تاکەکەس بەدی هاتوون"[٤٥٠]

## ب-بۆچوونەکانی سەبارەت سیاسەتی دەرەوە:

١-پرانسیپەکانی سیاسەتی دەرەوە:

بە حسابکردن بۆ ئەوەی کە گەشەکردن و پەرەپێدانی ئابووری لە ئامانجە سەرەکیەکانی گروپی کارگوزارانی سازندەگییە. ئەم باڵە وەکو وەسیلەیەك بۆ

---

[٤٤٩] همان، شماره ٨، ٧٤/١٢/٥، ص٣.

[٤٥٠] هفتەنامه بهمن، شماره ٩، ٧٤/١٢/١٢، ص٢.

بەدەسـت هێنـانی ئامانجـەکان لـە سیاسـەتی دەرەکـی دەڕوانـن. لـەم پێنـاوەدا "نەهێشتنی گرژی لە پەیوەندی دەرەکیدا، باشکردنی رەفتاری سیاسی بۆ راکێشانی سەرمایە، هەوڵدان بۆ گۆڕینی مامەڵەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لە بەرامبەر رەفتارە سیاسیەکانی ئێرانداو گۆڕینی روخساری نێودەوڵەتی ئێران" ئەمانە بە سەرەتاکانی سیاسەتی دەرەوەی ئەم باڵە دەژمێردرێن"[451]

٢- پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا:

ئەم گروپە خراپیەك لە دروست کردنی پەیوەندی ئابووری لەگەڵ ئەمریکادا نابینن. مەرعەشی کە یەکێکە لە ئەندامانی ئەو گروپە دەڵێت "پەیوەندی ئابووری لەگەڵ ئەمریکادا بە قازانجی ئێمەیە چونکە ناتوانین بە ئاسانی نەوتەکەمان بە وڵاتانی دەرەوە بفرۆشین.. پەیوەندی بازرگانی و ئابووری هیچ جۆرە ناکۆکیەك لەگەڵ بەربەرەکانی ئەمریکادا دروست ناکات"[452].

سەبارەت بە گفتوگۆ لەگەڵ ئەمریکادا بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانی هەردولا، وا دیارە ئەم گروپە دژی ئەوە نییە، بەلام لە حالی حازردا لەبەر ئەوەی رابەری شۆڕش دژی ئەوەیە، ئەم گروپەش دژی دەوەستێتەوە. عەتا ئەڵڵای مهاجرانی لەم بارەیەوە دەڵێت "من باوەڕم وابوو وەکو وڵاتی ڤێتنام کە هاوزەمان لەگەڵ شەڕدا لەگەڵ ئەمریکا، لە جنێف گفتوگۆیان لەگەڵ دەکرد، یان گفتوگۆی ئیمام حسین (س) لەگەڵ فەرماندەی سوپای یەزید، یان گفتوگۆی حەزرەتی عەلی (س) لەگەڵ معاویە، دەتوانین داخوازییەکانمان بڵێین. بەشێوەیەکی گشتی گفتوگۆ لەگەڵ دوژمندا دژی بەهانییە بەلام کاتێك کە مەقامی موعەزەمی رابەری خەتی سووریان فەرموو، من ئیتر رای خۆم دەرنەبڕی"[453].

موحسینی نور بەخشیش کە یەکێکە لە ئەندامە سەرەکیەکانی ئەم گروپە تەئکیدی لە "دروست کردنی پەیوەندی سالم و دۆستانەو بەرفراوان کردۆتەوە لەگەڵ هەموو وڵاتەکاندا بێجگە لە ئەمریکاو ئیسرائیل"[454].

---

[451] روزنامه اخبار، ٧٤/٩/١٤، ص٢، گفتوگۆ با کاظم پور اردبیلی.

[452] هفتەنامه پیام دانشجو، شماره ٤١، ٧٤/٣/٣٠، ص٣.

[453] هفتەنامه صبح، شماره ٤٧، ٧٤/١٢/١٥، ص٤.

[454] روزنامه اطلاعات، ٧٤/١١/٣٠، ص٢.

## کورتەی بۆچوونە سیاسیەکانی گروپی کارگوزارانی سازندەگی ئێران

١-پسپۆڕی جیاکردنەوەی ئەرك و دامەزراوە سیاسیەکان و دروست کردنی بەشێك بۆ ئەم ئەرك و دامەزراوانە.

٢-زیادکردنی بەشداری گشتی لە رەوتی هەڵبژاردنی کاربەدەستان و هەڵبژاردنی هێڵی سیاسی.

٣-سەراپاگیری ململانێی مەعنادارو ئاشتیخوازانە لەنێوان کەس و گروپە رێکخراوەکاندا بۆ سەقامگیرکردنی مەقامی دەوڵەتی لەناو پێکهاتەی سیاسیدا.

٤-بەرگری لە مافی چاپەمەنیو فراوانکردنی بازنەی ئازادییان.

٥-هەوڵدان بۆ خوڵقاندنی کەش و هەوایەکی پڕ چالاکی، پڕ ئەندێشەو یارمەتیدەر بۆ بەشداری هەموو خاوەن بیروڕاکانی وەفادار بە دەستووری کۆماری ئیسلامی ئێران بەرەو ئاراستەکردن و شیکردنەوەی مەسەلەکان دۆزینەوەی رێگە بۆیان.

٦-"هەوڵدان بۆ سەقامگیرکردنی کۆمەڵگایەك کە ئاین تیایدا داوەر بێت و بەشێوەیەك مامەڵە کردن لەگەڵ ئایندا کە رەسەنێتی و دڵسۆزی و بەتوانایی و حسابکردن بۆ پێویستیەکانی رۆژگاری لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبێ"[455].

٧-دوورکەوتنەوە لە گرژی لە پەیوەندی دەرەکیدا.

بۆچوونە ئابوورییەکانیگروپی کارگوزاران

تایبەتمەندی سەرەکی هەڵوێستە ئابوورییەکانی گروپی کارگوزاران دەتوانری بە گەشەکردن و پەرەپێدانی ئابووری خێرا لە قەڵەم بدرێ، هەڵوێستە ئابوورییەکانی ئەم گروپە لە پێناوی هەمان ئامانجدایە، کە لەم میحوەرانەی خوارەوەدا ریزبەندی دەکرێت:

### ١-تایبەتی کردنی یەکە ئابوورییەکان:

گروپی کارگوزاران پشتیوانی "لە تایبەتی کردنی یەکەکانی ئابووری" دەکات و باوەڕی وایە بەم هەنگاوە "کاراییەکان بەرز بۆتەوەو داهێنان و نوێخوازی تیایاندا

---

[455] هفتەنامە بهمن، شمارە ١٦، ٧٥/٢/١، ص٧.

زیاد دەکات" کارگوزاران ئەم وەزعە بە بالادەستی (کەش و هەوای رکابەری بنیات نەر بەسەر ئابووری ولاتدا" وەسف دەکەن کە دەتوانێت "بەرژەوەندی بەکاربەران دابین بکات"[٤٥٦].

٢-بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو:

بە حسابکردن بۆ ئەوەی ئەم گروپە گەشەکردن و پەرەپێدانی خێرای ئابووری کردووە بە ئامانجی خۆی، لە بەرامبەر ئەو بۆچوونەدا کە لە پیشەسازیدا تەئکید لە بەکارهێنانی بەرفراوانی هێزی کاردەکاتەوە، بایەخ بە بەکارهێنانی تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو دەدات. چونکە باوەڕی وایە لە جیهانێکدا کە بەخێرایی بەرەو پێشەوە دەڕوات، بۆ دوانەکەوتن لە کاروانی پێشکەوتن، جگە لە بەکارهێنانی تەکنەلۆجیای مۆدێرن چارەیەکی دیکە نییە. بەم پێیە لەو شوێنەدا کە قسە لەسەر هێزی مرۆیی دەکرێ "چۆنیەتی هێزی مرۆیی" باس دەکات.

بلاوکراوەی بەهمن لە نووسینێکدا دەربارەی "زیادکردنی ماوە درێژی هەل و مەرجی بەرهەم هێنانی کۆمەڵ" تەئکید لە زیادکردنی هەلومەرجی بنیات نراو لەسەر بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو" دەکاتەوە[٤٥٧]. هەروەها مرتەزای ئەلویری کە یەکێک بوو لە کاندیدەکانی کارگوزارانی سازندەگی ئێران لە هەڵبژاردنی خولی پێنجەمی پەرلەماندا تەئکیدی لەو خاڵە کردەوە کە "ئێران بۆ پەرەپێدان پێویستی بە تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو هەیە"[٤٥٨].

٣-گۆڕینی بنەما ئابوورییەکان:

بەپێی هەفتەنامەی بەهمن، کارگوزاران بایەخ بە "گۆڕینی بنەما ئابوورییەکان" دەدات لە بەرامبەر حسابکردن بۆ چارەسەرکردنی کێشە ئابوورییە هەست پێکراوەکان و دەرمان کردنی بە پەلەی" کێشەکاندا.

---

[٤٥٦] هفتەنامە بهمن، شمارە ٥، ٧٤/١١/١٤، ص١-٧.

[٤٥٧] همان، ص٧.

[٤٥٨] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٣٩، ٧٥/٥/٧، ص١٢ بە نقل از روزنامە اطلاعات بین المللی.

ئەم بڵاوکراوەیە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە بواری ڕووبەڕووبوونەوەی کێشە ئابوورییەکانی ئێراندا دوو تیور لە ئارادایە:

"گروپێك زیاتر حساب بۆ کێشە هەست پێکراوەکان دەکەن و داوای چارەسەری بەپەلەی کێشەکان دەکەن وەکو هەڵئاوسان، لە کارکەوتنی هەندێك لە هۆیەکانی بەرهەم هێنان، لاسەنگی تەرازووی پێدانی دەرەکی" گروپی دووەم بایەخ بە کێشە هەست پێنەکراوەکان و کێشە بنچینەییەکانی وەکو نزمی پاشەکەوت و سەرمایەگوزاری تاکەکەس و دوچەندانەیی پاشکەوتنی تەکنەلۆجیایی" دەدەن و بەدوای گۆڕینی ژێرخان و چالاك کردنی بنەما ئابوورییەکانی ئێراندا دەگەڕێن" بەپێی هەفتەنامەی بهمن، گروپی کارگوزارانی سازندەگی ئێران هەڵگری بۆچوونی دووەمەو (بەشوێن چاککردنی بنەما ئابوورییەکان دەگەڕێ"[٤٥٩].

## ٤- پەرەپێدان:

گروپی کارگوزاران پەرەپێدان بە ئامانجی سەرەکی بەرنامەی ئابووری خۆی دەزانێ. غولام حسێنی کەرباسچی کە یەکێکە لە ئەندامانی دامەزرێنەری ئەم گروپە دەڵێت: "ئامانجی سەرەکیمان، پەرەپێدانەو بۆ گەیشتن بەم ئامانجەش ڕەنگە لە هەر قۆناغێکدا تاکتیکێکی تایبەتی بەکاربێ" کەرباسچی درێژەی دەداتێ: "لۆجیکی کارگوزاران ئەوەبوو کە درێژەدان بە بیناکردنەوەی وڵات وەکو سەرەکی ترین ڕێگە بۆ درێژە دان بە بەربەرەکانی وڵات لە بەرامبەر دوژمنانی ناوخۆو دەرەوەدا ئاراستە دەکرێ"[٤٦٠] هەروەها کەرباسچی لە چاوپێکەوتنێکی دیکەدا دەڵێت: "..بەرنامەی ئێمە ئەوەیە کە ڕەوتی پەرەپێدان خێرا بکرێ چونکە ئێمە هەرچەندە لە پێوەرەکانی نێودەوڵەتی نزیکتر ببینەوە دەتوانین سەربەخۆیی وڵات تەئمین بکەین"[٤٦١] کارگوزاران لە بەیاننامەی خۆشیدا "پەرەنەسەندن" بە "مەترسیەك" وەسف دەکات کە هەڕەشە لە شۆڕش و نیزام دەکات[٤٦٢]. لەم ڕووەوە بڵاوکراوەی بهمن لە نووسراوێکیدا بە

---

[٤٥٩] هفتەنامە بهمن، شمارە ٤، ٧٤/١١/٧، ص٧.

[٤٦٠] روزنامە اطلاعات، ٧٤/١٢/١٦، ص١٢.

[٤٦١] همان، ٧٥/١/٢٩، ص٧.

[٤٦٢] اولین بیانیە کارگزاران سازندگی ایران.

بەراوردکردنی "رکابەرانی کۆن خوازو موحافیزەکار" لەگەڵ کارگوزاراندا، کارگوزاران سەر بە "بەرەی پەرەپێدان خوازان" دەزانێت[٤٦٣].

**٥-ئابووری منافەسە :**

گروپی کارگوزاران لە بەرامبەر ئابووری دەوڵەتی‌دا باوەڕی بە ئابووری منافەسە هەیە. بڵاوکراوەی بهمن لەم بارەیەوە دەنووسێت "ئەگەر بەراستی خوازیاری ئابووری رکابەرین بەکارایی و چالاکیەکی بالاوە پێویستە رووبەڕووی هەر جۆرە پاوانکارییەکی ئابووری ببینەوە"[٤٦٤].

**٦-کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی :**

بە حسابکردن بۆ ئەوەی کە ئامانجی گروپی کارگوزاران گەشەپێدان و پەرەپێدانی خێرای ئابوورییە، کەڵك وەگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی بۆ ئێران بەوە دەزانێت کە قابیلی دەست بەردار بوون نی‌یە. بەپێی بڵاوکراوەی بهمن "کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دارایی، ئاسانکاری و سەرمایەگوزارییە دەرەکییەکان لە شێوازە جۆراوجۆرەکانیدا، هەم لەو وڵاتانەدا کە لە گەشەکردندان و هەم لە وڵاتە پیشەسازییەکاندا، مەسەلەیەکی ئاسایی‌یەو کاری پێ دەکرێ. بەتایبەتی لەو ئابوورییانەدا کە لە دروست کردنەوەو پەرەپێدان ئەم کارە نەك تەنها بە لوجیکی ئابووری قابیلی ئاراستەکردنە، بەڵکو لە هەندێ لایەنەوە بە کردەوە قابیلی خۆ لێ لادان نی‌یە" لەگەڵ ئەوەشدا ئەم گروپە "کەڵك وەرگرتن (بەکارهێنان)ی بێ قەیدو شەرت و بێ دیسپلینی دارایی لە قەرزو ئیعتباراتی دەرەکی‌دا مەحکوم بە شکست دەزانێت" و بە گشتی "سەرمایەگوزاری هاوبەشی دەرەکی بە بەراورد لەگەڵ وەرگرتنی متمانە (اعتبار)ی دەرەکی.. بە پەسەندتر" دەزانێت[٤٦٥]. کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی بەلای کارگوزارانەوە هێندە بایەخی هەیە کە مرتەزا ئەلویری کە یەکێك بوو لە کاندیدەکانی ئەم گروپە لە هەڵبژاردنی خولی پێنجەمی ئەنجومەنی

---

[٤٦٣] هفتەنامە بهمن، شمارە ٤، ٧٤/١١/٧، ص٧.

[٤٦٤] همان، شمارە ٥، ٧٤/١١/١٤، ص٧.

[٤٦٥] همان، شمارە ١، ٧٤/١٠/١٦، ص٥.

شورای ئیسلامیدا، هێنانی سەرمایەی ئەو ئێرانیانەی کە باوەڕیان بە نیزامی کۆماری ئیسلامی نییە بۆ سەرمایەگوزاری لە وڵاتدا بەبێ سەرئێشە دەزانێت و باوەڕی وایە کە بە نیسبەت سەرمایەگوزاری دەرەکییەوە باشترە[٤٦٦].

## کورتەی بۆچوونە ئابوورییەکانی کارگوزارانی سازندەگی ئێران:

١-گەشەپێدان و پەرەپێدانی ئابووری، میحوەرو ئامانجی سەرەکییە لە ئابووریداو لە سایەی گەشەپێدان و پەرەپێدانی ئابووریدا توانای سەربەخۆیی و دادپەروەری هەیە.

٢-بۆ ئەوەی بە دادپەروەری کۆمەڵایەتی بگەین، سەرەتا دەبێ گەشەکردنی ئابووری زیاد بکات. بەبێ گەشەکردنی ئابووری، داراییەك لە ئارادا نییە بۆ دابەشکردن. بەڕای ئەم گروپە "پێویستە ئابووری ئێران لە ماوەیەکی کورتدا لەنێوان رەونەقی زیاتر "گەشەپێدانی ئابووری" و جێگیری بەهاکاندا یەکێکیان هەڵبژێرێ"[٤٦٧].

٣-ئەم گروپە باوەڕی بە تایبەتی کردنی یەکەکانی بەرهەم هێنان، ئازادی ئابووری، رێگەگرتن لە دەستێوەردانی دەوڵەت لە کاروباری ئابووری، ئابووری منافەسە هەیە و باوەڕی بە ئابووری دەوڵەت کەمترە.

٤-بایەخ بە کێشە هەست پێنەکراوو ژێرخانیەکانی ئابووری ئێران دەدات و هەوڵی گۆڕینی ژێرخانی ئابووری ئێران دەدات.

٥-گروپی کارگوزاران لە بەرامبەر پیشەسازی بنیات نراو لەسەر هێزی کاردا داکۆکی لەبەرپاکردنی پیشەسازی بنیات نراو لەسەر تەکنەلۆجیای مۆدێرن دەکات.

٦-ئەم گروپە کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی بۆ ئابووری ئێران کە لە ماوەی بیناکردنەوەدایە، بەوە دەزانێت کە ناکرێ خۆی لێ لابدرێ و لەم پێناوەدا دورکەوتنەوە لە گرژی لە پەیوەندی دەرەکیدا گرنگییەکی زۆری هەیە.

---

[٤٦٦] ماهنامه یالثارات الحسین، شماره ٣٠، ٧٥/٥/٧، به نقل از روزنامه اطلاعات بین المللی.

[٤٦٧] هفتەنامه بهمن، شماره ٥، ٧٤/١١/١٤، ص١.

٧-بۆ بەدیهێنانی ئەو گەشەپێدان و پەرەپێدانی ئابوورییە مەبەستی گروپی کارگوزارانە، پەیوەستی بە بازاڕی جیهانی و هاوکاری نزیك لەگەڵ دەزگا ئابوورییە نێودەوڵەتیەکاندا، مەسەلەیەکە کە خۆی لێ لا نادرێ. لە راستیدا ئەم نیزامی ئابوورییەی بەلای ئەم گروپەوە پەسەندە لەگەڵ سیستمی سەرمایەداری جیهانی پەیوەندییەکی ئۆرگانیکی هەیە.

٨-ئەو ستراتیژی پیشەسازییەی بەلای ئەم گروپەوە پەسەندە (پەرەپێدانی هەناردەیە) و وڵاتانی باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا وەکو کوریای باشوور، مالیزیا، ئەندەنوسیاو وڵاتانی ئەمریکای ناوەڕاست و باشوور وەکو مەکسیك، بەرازیل و ئەرجەنتین نموونەی ئابووری پەسەندە بەلای ئەم گروپەوە.

٩-لە نێوان بەشەکانی ئابووریدا بەشی پیشەسازی ئەولەویەتی هەیەو بەشی سەرەکی سەرمایەگوزارییەکان پێویستە لەم بەشەدا ئەنجام بدرێ.

## ٣-٢-بۆچوونە فەرهەنگیەکانی گروپی کارگوزاران

باوەڕی ئەم گروپە بە کرانەوەی مەیدانی فەرهەنگی و پێویستی ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی تایبەتمەندی سەرەکی بۆچوونە فەرهەنگیەکانی کارگوزارانە. دەتوانین ئەو سیاسەتە فەرهەنگیانەی بەلایانەوە پەسەندە لەم میحوەرانەی خوارەوەدا ریزبەندی بکەین:

١-بەکارهێنانی سیاسەتی سانسۆر لەسەر بەرهەمە فەرهەنگیەکان لەدوای بڵاوبوونەوەیان، ئەم گروپە دژی سانسۆری دەوڵەتە لەسەر بەرهەمە فەرهەنگیەکان (بەرهەم هێنانی فیلم، نووسینی کتێب، رۆژنامە، بڵاوکراوە) بەر لە بڵاوبوونەوەیان و ئەو سانسۆرە بە کۆسپێك دەزانێت لەبەردەم چالاکیە فەرهەنگیەکانداو پشتیوانی لە سیاسەتی سانسۆر لەسەر بەرهەمە فەرهەنگیەکان دەکات دوای بڵاوکردنەوەیان. کارگوزاران لە مەسەلەی فەرهەنگیدا باوەڕی بە (رۆڵی رێنمایی و بەرنامەرێژی) دەوڵەت هەیە لە جیاتی "دەرهێنانی مۆڵەت نامە" و (بیروکراسی دەرهێنانی مۆڵەت نامە) بە کۆسپێك دەزانێت کە "توانای هەر جۆرە بەرنامەرێژی و بیرکردنەوەیەکی درێژخایەن لەناو دەبات کە بۆ چالاکی فەرهەنگی پێویستن"[٤٦٨] ئەم گروپە سەبارەت

---

[٤٦٨] همان، شمارە١، ١٦/١٠/٧٤، ص٣.

به چالاکی فەرهەنگی باوەڕیان وایە کە سیاسەتی "هیچ پەیامێکی شایستە نابێ لە گوێزانەوە بێبەش بکرێ" پێویستە بکرێتە بنەمای سیاسەت داڕشتنی فەرهەنگی. ئەم سیاسەتە لە بەرامبەر سیاسەتێکی دیکەدا کە دەڵێ: "هیچ پەیامێکی ناشایستە نابێ بگوێزرێتەوە" دەخرێتەروو.

بە باوەڕی باڵی کارگوزاران پیادەکردنی سیاسەتی "هیچ پەیامێکی ناشایستە نابێ بگوێزرێتەوە" چەند ئەنجامێکی وەکو ئەمانەی لێ دەکەوێتەوە "پەرەسەندنی لێپێچینەوە و کۆنترۆڵی توند لەسەر بەرهەمە فەرهەنگیەکان بەر لە بڵاوبوونەوە"، کەم بوونەوەی بەرهەمی فەرهەنگی لە ئەنجامی درێژەکێشانی ڕەوتە جیاوازەکانی لێپێچینەوە، زیادکردنی دەسەڵاتەکانی کاربەدەستانی ڕەسمی، دروست بوون و فراوانبوونی ڕەوتی فەرهەنگی ڕەسمی، فۆرم خوازی و بەڕووکەش تەماشاکردن" لە کاتێکدا کە پیادەکردنی سیاسەتی "هیچ پەیامێکی شایستە نابێ لە گوێزانەوە مەحروم بکرێ" "کەش و هەوای کراوەتری فەرهەنگی، زۆربوونی بەرهەم، کەم بوونەوەی ڕۆڵی لێپێچینەوەی دەوڵەت لە بواری فەرهەنگ، پەرەسەندن هەمەڕەنگی و هەندێ جار چەند هێندەی فەرهەنگی" لێدەکەوێتەوە[469]. دامەزرێنەرانی گروپی کارگوزاران لە تەکنوکراتەکان و ئەوانەن کە لە خۆرئاوا خوێندنیان تەواوکردووە، هەوڵ دەدەن بۆ ئەوەی لە مامەڵە کردن لەگەڵ گۆڕانە فەرهەنگیەکاندا تێڕوانینێکی واقیعیان هەبێ.

هەفتەنامەی بهمن لە شەرح کردنی ئەو سیاسەتەدا کە بەلایەوە پەسەندە واتە "هیچ پەیامێکی شایستە نابێ لە گوێزانەوە بێبەش بکرێ" دەنووسێت: "یەکەم هەموو وڵاتان بە ناچاری بەرەو کۆمەڵگای زانیاری فراوان مل دەنێن کە دانوستانی ئازاد و زانیاری فراوان بەکەڵك وەرگرتن لە تەواوی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن لە سیفەتەکانی ئەو وڵاتانەیە. لە کاتێکدا کە درەنگ یان زوو کۆمەڵگاکەی ئێمەش چەند پەیامێك ڕووی تێدەکات کە ڕەنگە لەڕووی ناوەڕۆکەوە لەگەڵ ئەو بەهایانەدا کۆك و تەبا نەبێت کە بەلای ئێمەوە پەسەندەو لە ڕاستیدا لێپێچینەوەی ئێمە بۆ پێشگیری لە ناردنی پەیامە ناشایستەکان کارایی خۆی لەدەست دەدات. دووەم/ کۆمەڵگای

---

[469] همان، شماره ۳، ۷٤/۱۰/۳۰، ص۲.

ئەمڕۆی ئێمە کۆمەڵگایەکە کە پێویستیەکانی جۆراوجۆر فراوانن، ئەو پێویستیانەی کەزۆربەیان لەبەر دواییە کۆمەڵایەتی‌یەکان بەیەك شێوەی لەیەك چوو تێرنابن.. بە حسابکردن بۆ طەیفە فراوانەکانی پێویستیە فەرهەنگیەکان، هەر دیدگایەك کە بەرهەمی فەرهەنگی یان هەمەجۆری بەرهەمە فەرهەنگی‌یەکان لە وڵاتدا کەم بکاتەوە لە کۆتایی‌دا دەبێتە هۆی ئەوەی کە توێژە جیاوازەکان بۆ دابین کردنی پێویستیەکانی خۆیان روو لە دەرەوەی سنوورە نیشتمانیەکان بکەن و ئەمەش خەرجیەکی زۆر قورسە. سێیەم/ ئەم مافە بنچینەییانەی کە لە دەستووری ئێمەدا هاتوون پرانسیپ لەسەر خاوێنی دادەمەزرێنێ و ئەمەش لەگەڵ بۆچوونی هیچ پەیامێکی شایستە نابێ لە گوێزانەوە بێبەش بێ گونجاو ترە[470].

ئەم بڵاوکراوەیە بۆ بەکارهێنانی سیاسەتی سانسۆر لەدوای بڵاوبوونەوەی بەرهەمە فەرهەنگیەکان چەند پێشنیازێك بەم شێوەیەی خوارەوە دەخاتەڕوو:

١-رێکخستنی یاسایەکی بڵاوکردنەوەی کتێب پەسەندکردنی لەلایەن پەرلەمانەوە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو خاڵانەی کە لە یاسای چاپەمەنی‌دا هاتوون.

٢-دروست کردنی دەستەیەکی چاودێری و دەستەیەکی داوەری راگەیاندن کە چاپەمەنی، سینەما، کتێب و کەناڵە تایبەتیەکانی رادیو تەلەفزیۆن کۆنترۆڵ بکات (کە دەرکەوتنیان بەم نزیکانە هێندە دوور نی‌یە)

٣-روون کردنەوەی شوێنگەی یاسای بڵاوکردنەوەو نزیکی ناشران لەگەڵ دەوڵەتدا ١٩٨٠.

### ٢-زیادکردنی بەرهەم و هەمەڕەنگی فەرهەنگی

گرووپی کارگوزاران پشتیوانی لە زیادکردنی بەرهەم و هەمەڕەنگی فەرهەنگی دەکات، هەفتەنامەی بهمن لە نووسینێکیدا بە بۆنەی ئامادەبوونی کارگوزارانەوە لە گۆڕەپانی هەڵبژاردنی خولی پێنجەمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی‌دا تەئکیدی لە

---

[470] هفتەنامە بهمن، شمارە ٣، ٧٤/١٠/٣٠، ص٢.

[471] همان، شمارە ٤، ٧٤/١١/١٧، ص٣

پشتیوانی کەسە دیارەکانی کارگوزاران بۆ زیادکردنی بەرهەم و هەمەڕەنگی فەرهەنگی کردەوە لەگەڵ اراستنی ناسنامەی ئێرانی و ئیسلامیدا.[٤٧٢]

### ٣-باوەڕیان بە ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی هەیە:

ئەم گروپە تەئکید لە ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی و کەڵك وەرگرتن لە لایەنە باشەکانی فەرهەنگەکانی دیکە دەکاتەوە. عەتا ئەڵلای مهاجرانی کە لە دامەزرێنەرانی گروپی کارگوزارانە باوەڕی وایە کە (فەرهەنگ بە پشت بەستن بە رسواکردن و دەرکردن دروست نابێت.. ئەگەر لە مەیدانی فەرهەنگدا روانینی ئێمە بە تەواوی لەسەر روخسارەکانی جیاوازی بێ و پێوەرەکانی ئێمە بە تەنها ئەوانە قبول بکات کە لە سەداسەد بەلای ئێمەوە پەسەندن، لەو کەسە دەچین کە لە ئۆقیانووسدا بە ماسیە زینەکان رازی بێت" مهاجرانی بۆ رووبەڕووبوونەوەی هێرشی فەرهەنگی لە بەرامبەر ئەو بۆچوونەدا کە باوەڕی بە (سیاسەتی قەدەغەکردن) هەیە (سیاسەتی بێخەمی) دەخاتە روو. بەرای مهاجرانی لە هەل و مەرجی ئەمرۆی جیهاندا "لە بەرامبەر شەپۆلی بیرو دەنگ و وێنەدا توانای دیوار دروست کردن نییە" لەبەر ئەوە مهاجرانی بۆ رووبەڕووبوونەوەی هێرشی فەرهەنگی پێشنیازی "سەقامگیرکردنی بنەماکانی شۆڕش بە سەقامگیرکردنی بنەما ئاینی- فەرهەنگیەکانی" خەڵك دەکات[٤٧٣].

### ٤-فراوانکردنی دام و دەزگا فەرهەنگیە تازەکان:

ئەم گروپە لە بەرامبەر ئەو بۆچوونەدا کە باوەڕی وایە دەبێ چالاکیە فەرهەنگی‌یەکان لە چوارچێوەی مزگەوت و لەژێر کۆنترۆڵی زانا ئاینییەکاندا بێ. بایەخ بە فراوانکردنی چالاکیە فەرهەنگیەکان لە مەیدانە جیاوازەکان لە قاڵبی دام و دەزگا تازەکاندا دەدات. دروست مەڵبەندە فەرهەنگیەکان لەلایەن شارەوانیی تارانەوە لە پێناوی فراوانکردنی چالاکیە فەرهەنگیەکاندایە کە (شارەوانی تاران لەژێر دەسەڵاتی کارگوزاراندایە).

---

[٤٧٢] همان، ص٧.

[٤٧٣] همان، شماره ١٣، ٧٥/٢/٨، ص٢.

## کورتەی بۆچوونە فەرهەنگیەکانی گروپی کارگوزاران

١-پشتیوانی کردن لە زیادکردنی بەرهەم و هەمەڕەنگی فەرهەنگ لەگەڵ پاراستنی ناسنامەی ئێرانی -ئیسلامی‌دا.

٢-باوەڕیان بە ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی هەیە.

٣-بوار ڕەخساندن بۆ گوێزانەوەی پەیامە شایستەکان.

٤-زیادکردنی زەخیرەی زانیاری، و زیادکردنی گوێزانەوەی و خێرایی ڕەوتی زانیاری.

٥-زیادکردنی توانای بەشداریی لە ژیانی فەرهەنگی‌داو دەست گەیشتن بە فەرهەنگ و شادبوون بە بەرهەمەکانی.

٦-زیادکردنی ڕادەی داهێنان و نوێخوزای فەرهەنگی.

٧-بە عەقڵ مامەڵەکردن لەگەڵ مەسەلە فەرهەنگیەکاندا.

٨-پیادەکردنی سیاسەتی (سانسۆر لە دوای بلاوبوونەوە) لەسەر بەرهەمە فەرهەنگیەکان.

٩-دژایەتی کردنی دروست بوونی فەرهەنگی ڕەسمی و ڕەواج پێدانی.

١٠-بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشی فەرهەنگی لە جیاتی سیاسەتی قەدەغەکردن و تەمێ کردن تەئکید لە خاترجەمی خەڵك دەکاتەوە.

١١-فراوانکردنی چالاکی فەرهەنگی لە چوارچێوەی دام و دەزگا تازەکانداو دژایەتی پاوانکردنی لە دەزگا کۆنەکانی کۆمەڵدا.

# بەشی سێیەم

## بەراوردکردنی هەڵوێستی باڵە سیاسیەکان لە سیستمی کۆماری ئیسلامی ئێراندا

### ١-٣-بەراوردکردنی بۆچوونە سیاسیەکان:

لە بەشی پێشوودا بە جیا هەڵوێستی هەریەکە لە باڵەکان سەبارەت مەسەلە سیاسیو ئابووری و فەرهەنگیەکان روون کرایەوە. لەم بەشەدا ئەم هەڵوێستانە لەگەڵ یەکتری‌دا بەراورد دەکەین.

ئەلف: بۆچوونە سیاسیەکان

### ١-هەڵبژاردنی وەلی فەقیە:

سەبارەت بەوەی کە خەڵك لە دانانی وەلی فەقیهدا چ دەورێکیان هەیە باڵەکان دیدگای جۆراوجۆریان هەیە، هەندێکیان رۆڵێك بۆ خەڵك دانانێن و هەندێکیان دانانی بە مەرجی هەڵبژاردنی خەڵکەوە دەبەستنەوە.

**نەخشەی ژمارە ١ جیاوازی دیدگای باڵەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات:**

**خشتەی ژمارە (١)**

| باڵەکان | دەوری خەڵك لە هەڵبژاردنی وەلی فەقیهدا |
| --- | --- |
| رۆحانیەتی خەباتگێڕ.. | خەڵك دەوریان نی یە[٤٧٤] |
| ئەنجومەنی رۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | خەڵك مەلی دەبژێرن[٤٧٥] |
| کارگوزاران | خەڵك مەلی دەبژێرن[٤٧٦] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | خەڵك دەوریان نی یە. وەلی فەقیە لەلایەن خوداوە دانراوە دەوری خەڵك چالاکی بەخشینە بەوە[٤٧٧] |
| پشتیوانانی حزبوڵڵا | خەڵك دەوریان نی یە[٤٧٨] |
| پــــەیامی خوێندکـــــار | خەڵك مەلی دەبژێرن[٤٧٩] |

---

[٤٧٤] دو هفته نامه عصرما، شماره ٣٠، ٧٤/٩/٢٢، ص٨ سخنان محمد رضا مهدوی کنی.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە دەوری خەڵك لە هەڵبژاردنی وەلی فەقیهدا، دەتوانین لە هێڵکاریەکدا بەم شێوەیەی خوارەوە دایان بنێین[٤٨٠]:

## ٢-دەسەڵاتی وەلی فەقیە :

هەندێ لە باڵەکان دەسەڵاتەکانی وەلی فەقیە لە سنووری ئەوەدا دەبینین کە لە دەستووری کۆماری ئێران داهاتووە، بەڵام هەندێکی تر باوەڕیان وایە کە دەسەڵاتەکانی لە سەروو دەستوورەوەیە.

خشتەی ژمارە (٢) دیدگای هەریەکە لە باڵەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات

خشتەی ژمارە (٢)

| باڵەکان | دەسەڵاتەکانی وەلی فەقیە |
| --- | --- |
| -ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | لە سەروو دەستوورەوەیە[٤٨١] |
| -ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | لە سنووری دەستووردایە[٤٨٢] |
| -کارگوزاران | لەسنووری دەستووردایە[٤٨٣] |
| -کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | لە سەروو دەستوورەوەیە[٤٨٤] |
| پشتیوانانی حزبوڵڵا | لە سەروو دەستوورەوەیە[٤٨٥] |
| پەیامی خوێندکار | لە سنووری دەستووردایە[٤٨٦] |

---

[٤٧٥] همان، شماره ١٣، ٧٤/١/٣٠، ص٢.

[٤٧٦] روزنامه همشهری، ٧٦/٢/١٦، ص١.

[٤٧٧] هفتەنامه ارزشها، شماره ١٢، ٧٦/١/٢٥، ص٥.

[٤٧٨] ماهنامه یالثارات الحسین، شماره ٢٥، ١٢/٢٧/ ٧٦، ص٣.

[٤٧٩] روزنامەهای ٧٥/٩/٦.

[٤٨٠] ئەم هێڵکاریەو هێڵکارییەکانی لاپەڕەکانی داهاتوو لەسەر بنەما هەڵوێستی لەیەك چووی باڵەکان، دابەشکراوە لەم هێڵکاریانەدا دووری یان نزیکی باڵەکان لەگەڵ یەکتریدا، گرنگ نییە.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە دەسەڵاتەکانی وەلی فەقیە، دەتوانین لە هێڵکاریەکدا بەم شێوەیەی خوارەوە دایان بنێین:

## ٣- بەرپرسیاریی وەلی فەقیە لە بەرامبەر خەڵك دا:

هەندێ لە باڵەکان باوەڕیان وایە کە وەلی فەقیە لە بەرامبەر خەڵکدا بەرپرسیارە، لە بەرامبەردا هەندێکی تر لە باڵەکان باوەڕیان وایە کە وەلی فەقیە تەنها لە بەرامبەر خودادا بەرپرسیارە.

**خشتەی ژمارە (٣) دیدگای باڵەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات**

**خشتەی ژمارە (٣)**

| باڵەکان | بەرپرسیاری وەلی فەقیە لە بەرامبەر خەڵکدا |
|---|---|
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | بەرپرسیار نییە[٤٨٧] |
| ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | بەرپرسیارە[٤٨٨] |
| کارگوزاران | بەرپرسیارە[٤٨٩] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | بەرپرسیار نییە[٤٩٠] |
| پشتیوانانی حزبوڵڵا | بەرپرسیار نییە[٤٩١] |
| پەیامی خوێندکار | بەرپرسیارە[٤٩٢] |

---

[٤٨١] ویژەنامە جامعە روحانیت مبارز تهران بە مناسبت مرحلە دوم انتخابات دورە پنجم مجلس شورای اسلامی، ص٣٣.

[٤٨٢] دو هفتەنامە عصرما شمارە ٦٢، ٧٤/١١/٣، ص٤ و ٧. همچنین همشهری، ٧٥/١٠/٩، سخنان اسد الله بیات.

[٤٨٣] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیری های این گروە است.

[٤٨٤] هفتەنامە ارزشها، ویژە انتخابات، ٧٦/٢/٣١، ص٣.

[٤٨٥] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٢٠، ٧٤/٨/١٥، ص٢٠.

[٤٨٦] اظهارات طبرزدی ٧٦/٢/١٦.

[٤٨٧] روزنامە رسالت ٧٤/٤/١١/ ص١.

به سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە مەسئولیەتی وەلی فەقیە لە بەرامبەر خەڵکدا، دەتوانین لە هێڵکارییەکدا بەم شێوەیەی خوارەوە دایان بنێین.

## ٤-تەقدیس کردنی وەلی فەقیە :

هەندێ لە باڵەکان بە جۆرێك لە تەقدیس قایلن بۆ وەلی فەقیەو لە هەڵە بەدووری دەزانن و ڕەخنە لێ گرتنی بە باش نازانن.، لە بەرامبەردا هەندێ باڵی دیکە دژی تەقدیس کردنی وەلی فەقیەن و وەکو بەرپرسەکانی دیکەی کۆماری ئیسلامی تەماشای دەکەن.

خشتەی ژماە (٤) جیاوازی بۆچوونەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات

خشتەی ژمارە (٤)

| باڵەکان | تەقدیس کردنی وەلی فەقیە |
|---|---|
| -ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | ڕازییە[٤٩٣] |
| -ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و | ڕازی نییە[٤٩٤] |
| -کارگوزاران | ڕازی نییە[٤٩٥] |
| -کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | ڕازییە[٤٩٦] |
| پشتیوانانی حزبوڵلا | ڕازییە[٤٩٧] |
| پەیامی خوێندکار | ڕازی نییە[٤٩٨] |

---

[٤٨٨] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ١، ص٧، همچنین روزنامە همشهری ٧٥/١٠/٩، سخنان اسد الله بیات.

[٤٨٩] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیری‌های این گروە است.

[٤٩٠] برداشت نگاندە از مجموعە موضع گیری‌های این گروە است.

[٤٩١] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٢٥، ٧٤/١٢/٢٧، ص٣.

[٤٩٢] مصاحبە حشمت الله طبرزدی بابخش فارسی رادیو بی بی سی ٧٥/١٢/٢٢، برنامە شامگاهی.

[٤٩٣] روزنامە رسالت، ویژەنامە، ٧٤/١١/١٩.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت (بە تەقدیس کردنی وەلی فەقیە*) دەتوانین لە هێڵکارییەکدا بەم شێوەیەی خوارەوە دایان بنێین.

## ٥-مافی فەرمانڕەوایی لە کۆماری ئیسلامیدا:

هەموو باڵەکان مافی فەرمانڕەوایی بە مافی خودا دەزانن، بەڵام هەندێ لە باڵەکان باوەڕیان وایە کە ئەم مافە بە خەڵك سپێردراوە، لە ڕوانگەی ئەم گروپانەوە، ڕای خەڵك لە بڕیارەکاندا دەوری سەرەکی هەیە. لە بەرامبەر ئەمەدا گروپەکانی دیکە هێندە باوەڕیان بەرای خەڵك نییە. خشتەی ژمارە (٥) جیاوازی بۆچوونەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات.

خشتەی ژمارە (٥)

| باڵەکان | مافی فەرمانڕەوایی لە کۆماری ئیسلامیدا |
|---|---|
| -ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | لە خوداوە سەرچاوە دەگرێ[٤٩٩] |
| -ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و | لە خەڵکەوە سەرچاوە دەگرێ[٥٠٠] |
| -کارگوزاران | لە خەڵکەوە سەرچاوە دەگرێ[٥٠١] |
| -کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | لە خوداوە سەرچاوە دەگرێ[٥٠٢] |
| پشتیوانانی حزبوڵڵا | لە خوداوە سەرچاوە دەگرێ[٥٠٣] |
| پەیامی خوێندکار | لە خەڵکەوە سەرچاوە دەگرێ[٥٠٤] |

[٤٩٤] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ١، ٧٣/٧/٢٧، ص٧.

[٤٩٥] برداشت نگارندە از مجموع موضع گیری های این گروە است.

[٤٩٦] هفتەنامە ارزشها، شمارە ١٤، ٧٦/١/٢٥، ص٦.

[٤٩٧] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ١٤، ٧٦/١/٢٥، ص٦.

[٤٩٨] اظهارات طبرزدی ٧٦/٢/١٦.

* لە دەقەکەدا نووسراوە "بەرپرسیاریی وەلی فەقیە لە بەرامبەر خەڵکدا" دیارە هەڵەیە -و-

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە مافی فەرمانڕەوایی کۆماری ئیسلامیدا، دەتوانین لە هێڵکارییەکدا بەم شێوەیەی لای خوارەوە دایان بنێین:



## ٦-بەرپرسیاریی کاربەدەستان لە کۆماری ئیسلامیدا:

هەندێ لە باڵەکان کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی تەنها لە بەرامبەر خودادا بە بەرپرسیار دەزانن و هەندێکی تر سەرەڕای ئەوە لە بەرامبەر خەڵکیشدا بە بەرپرسیارییان دەزانن.

خشتەی ژمارە (٦) جیاوازی بۆچوونەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات

خشتەی ژمارە (٦)

| باڵەکان | بەرپرسیاریی کاربەدەستان |
| --- | --- |
| -ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | لەبەرامبەر خودادایە[٥٠٥] |
| -ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و | لە بەرامبەر خەڵکدایە[٥٠٦] |
| -کارگوزاران | لە بەرامبەر خەڵکدایە[٥٠٧] |
| -کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | لەبەرامبەر خودادایە[٥٠٨] |
| پشتیوانانی حزبوڵلا | لەبەرامبەر خودادایە[٥٠٩] |
| پەیامی خوێندکار | لەبەرامبەر خەڵکدایە[٥١٠] |

---

[٤٩٩] روزنامه رسالت ، ٧٤/٤/١٠، ص١.

[٥٠٠] دوهفتەنامه عصرما، شماره ١٩، ٧٤/٤/٢١، ص٤، همچنین روزنامه سلام، ٧٥/١١/٧.

[٥٠١] روزنامه همشهری، ٧٥/١٢/١٦ن ص١.

[٥٠٢] روزنامه اطلاعات، ٧٥/١٢/٥، ص٢ سخنان محمد محمدی ری شهری.

[٥٠٣] اظهارات حسین الله کرم در ٧٦/١/٣١.

[٥٠٤] دوهفته نامه شلمچه، نیمه اول دی ٧٥، ص٣، مصاحبه طبرزدی با بی‌بی‌سی.

[٥٠٥] هفتەنامه شما، شماره ٧، ٧٦/١/٢١، ص٧ همچنین روزنامه رسالت، ٧٤/٤/١٠، ص١ و روزنامه رسالت ٧٤/٤/١١، ص١.

به سەرنجدان لە بۆچوونی باڵەکان سەبارەت بە بەرپرسیاریی کاربەدەستان لە کۆماری ئیسلامیدا دەتوانین لە هێلکارییەکدا بەم شێوەیەی خوارەوە دایان بنێین.

رۆحانیەتی خەباتگێرو.. | پشتیوانانی حزبوڵڵا | کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی | پەیامی خوێندکار | کارگوزاران | ئەنجومەنی رۆحانیە خەباتگێڕەکان و...

## ٧-چالاکی حزب:

هەندێ لە باڵەکان تەئکید لە پێویستی چالاکی حزب دەکەنەوە لە نیزامی سیاسیدا و هەندێکی دیکە باوەڕیان بە دەوری حزب نییە.

**خشتەی ژمارە (٧) جیاوازی بۆچوونەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات**

**خشتەی ژمارە (٧)**

| باڵەکان | چالاکی حزب |
|---|---|
| -رۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | رازی لە چوارچێوەی وەلی فەقیهدا[٥١١] |
| -رۆحانیە خەباتگێڕەکان و | رازییە[٥١٢] |
| -کارگوزاران | رازییە[٥١٣] |
| -کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | رازی لە چوارچێوەی حزبوڵڵادا[٥١٤] |
| پشتیوانانی حزبوڵلا | رازی نییە[٥١٥] |
| پەیامی خوێندکار | رازییە[٥١٦] |

---

[٥٠٦] دو هفتە نامە عصرما، شمارە ١٩، ٧٤/٤/٢١، ص٤.

[٥٠٧] روزنامە همشهری، ٧٦/٢/١٦، ص١.

[٥٠٨] روزنامە اطلاعات، ٧٥/١٢/٥، ص٢، اظهارات ری شهری.

[٥٠٩] اظهارات حسین اللە کرم در ٧٦/١/٣٠.

[٥١٠] اظهارات طبرزدی در ٧٥/٩/٦.

[٥١١] ویژەنامە جامعە روحانیت مبارز تهران ٧٥/١/٢٤، ص٢٨.

[٥١٢] دو هفتەنامە عصرما، شمارە ١، ٧٣/٧/٢٧ ص٣، همچنین هفتەنامە صبح، شمارە ٣٦، ٧٤/٩/٢٨، ص٢ سخنان کرویی.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە چالاکی حزب لە نیزامی سیاسی‌دا، دەتوانین لە هێڵکارییەکدا بەم شێوەیەی لای خوارەوە دایان بنێین:

| رۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | پشتیوانانی حزبوڵلا | کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی | پەیامی خوێندکار | کارگوزاران | ئەنجومەنی رۆحانیە خەباتگێڕەکان و... |
|---|---|---|---|---|---|

## ٨-حکومەتی ئیسلامی و دیموکراسی:

هەندێ لە باڵەکان لە نێوان حکومەتی ئیسلامی و دیموکراسی‌دا ناتەبایی نابینن. هەندێکی دیکە لە باڵەکان باوەڕیان بە سیفەتی تایبەتی و تایبەتمەندی حکومەتی ئیسلامی هەیەو حکومەتی ئیسلامی و دیموکراسی بە ناتەبا دەزانن.

خشتەی ژمارە (٨) جیاوازی بۆچوونەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات

خشتەی ژمارە (٨)

| باڵەکان | حکومەتی ئیسلامی دیموکراسی |
|---|---|
| -رۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | ناتەبایە[٥١٧] |
| -رۆحانیە خەباتگێڕەکان و | تەبایە[٥١٨] |
| -کارگوزاران | تەبایە[٥١٩] |
| -کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | ناتەبایە[٥٢٠] |
| پشتیوانانی حزبوڵلا | ناتەبایە[٥٢١] |
| پەیامی خوێندکار | تەبایە[٥٢٢] |

---

[٥١٣] روزنامه ابرار، ٧٥/٩/١٣، ص٢، سخنان عطاء الله مهاجرانی.

[٥١٤] روزنامه اطلاعات، ٧٤/١٢/٣، ص١٢، سخنان ری شهری.

[٥١٥] هفتەنامه صبح، شماره ٤٢، ٧٤/١١/١٠، ص١٤.

[٥١٦] هفتەنامه پیام دانشجو، شماره ٤٨، ٧٤/١٢/١٥، ص٣.

[٥١٧] برداشت نگارنده از مجموعه موضع گیری های این جناح است.

[٥١٨] دوهفتەنامه عصرما، شماره ٢٣، ٧٤/٦/١٥، ص٣.

[٥١٩] برداشت نگارنده از مجهموعه موضع گیری‌های این جناح است.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە حکومەتی ئیسلامی و دیموکراسی، دەتوانین لە هێلکارییەکدا بەم شێوەیەی لای خوارەوە دایان بنێین:

**٩-تێڕوانین سەبارەت بە باڵەکانی دیکە:**

هەندێ لە باڵەکان تێڕوانینێکی ڕەهایان هەیەو باڵەکان بۆ ئسوڵی و نائسوڵی دابەش دەکەن، هەندێ لە باڵەکانیش تەواوی باڵەکانیان لەناو نیزامدا قبوڵە.

خشتەی ژمارە (٩) جیاوازی دیدگاکان لەم بارەیەوە نیشان دەدا

**خشتەی ژمارە (٩)**

| باڵەکان | تێڕوانین سەبارەت بە باڵەکانی دیکە |
| --- | --- |
| -ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | باڵەکانی دیکەیان قبوڵ نییە[٥٢٣] |
| -ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | باڵەکانی دیکەیان قبوڵە[٥٢٤] |
| -کارگوزاران | باڵەکانی دیکەیان قبوڵە[٥٢٥] |
| -کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | باڵەکانی دیکەیان قبوڵ نییە[٥٢٦] |
| پشتیوانانی حزبوڵلا | باڵەکانی دیکەیان قبوڵ نییە[٥٢٧] |
| پەیامی خوێندکار | باڵەکانی دیکەیان قبوڵە[٥٢٨] |

---

[٥٢٠] روزنامه اطلاعات، ٧٥/١٢/٥، ص٢ سغنان ری شهری.

[٥٢١] برداشت نگارنده از مجموعه موضع گیری‌های این جناح است.

[٥٢٢] مصاحبه نگارنده باحشمت الله طبرزدی، ٧٦/٤/١٥.

[٥٢٣] بولتن جامعه روحانیت مبارز، شماره ٢١.

[٥٢٤] دوهفته‌نامه عصرما، شماره ٧٤/٦/١٥/٢٣، ص٤.

[٥٢٥] برداشت نگارنده از مجموعه موضع گیری های این جناح است.

[٥٢٦] روزنامه اطلاعات، ٧٤/١٢/٣، ص١٣.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە بەتەواوی باڵەکان، دەتوانین لە هێڵکارییەکدا بەم شێوەیەی لای خوارەوە دایان بنێین:

## ١٠-جۆری حکومەت:

هەندێ لە باڵەکان باوەڕیان بە کۆماری ئیسلامی هەیە، لە بەرامبەردا هەندێکی دیکەیان چەند جۆرێکی تایبەتی دیکەیان لە حکومەت قبوڵە.

خشتەی (١٠) جیاوازی دیدگاکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات

خشتەی ژمارە (١٠)

| باڵەکان | جۆری حکومەت |
| --- | --- |
| -ڕۆحانیەتی خەباتگێرو.. | حکومەتی عەدلی ئیسلامی بنیات نراو لەسەر حکومەتی ساڵحان (ڕۆحانیەکان)[٥٢٩] |
| -ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و | کۆماری ئیسلامی[٥٣٠] |
| -کارگوزاران | کۆماری ئیسلامی[٥٣١] |
| -کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | کۆماری ئیسلامی لەگەڵ قایل بوونێکی سنووردار بەڕای خەڵك[٥٣٢] |
| پشتیوانانی حزبوڵلا | تاکەکەسی (وەلی فەقیە ڕۆڵی سەرەکی هەیە)[٥٣٣] |
| پەیامی خوێندکار | کۆماری ئیسلامی[٥٣٤] |

---

[٥٢٧] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٢٩، ٧٥/٤/٧، ص٦، سخنان الله کرم.

[٥٢٨] مصاحبە نگارندە باحشمت الله طبرزدی، ٧٦/٤/١٥.

[٥٢٩] هفتەنامە شما، شمارە ٧، ٧٦/١/٢١، ص٧.

[٥٣٠] دو هفتەنامە عصرما، شمارە ١٢، ٧٤/١/١٦، ص١ همچنین روزنامە سلام ٧٥/١١/٧.

[٥٣١] روزنامە همشهری ٧٦/٢/١٦، ص١.

[٥٣٢] روزنامە اطلاعات ٧٥/١٢/٥، ص٢، سخنان ری شهری.

[٥٣٣] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٢٣، ٧٤/١١/١١، ص٧ و شمارە ٢٤، ٧٤/١٢/١٠، ص٥.

بە سەرنجدان لە دیدگای هەریەك لە باڵەكان سەبارەت بە جۆری حكومەت، دەتوانین لە هێڵكارییەكدا بەم شێوەیەی لای خوارەوە دایان بنێین:

| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | پشتیوانانی حزبوڵلا | كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكانی شۆڕشی ئیسلامی | پەیامی خوێندكار | كارگوزاران | ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەكان و... |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |

## ١١-ئامانج گەرایی:

هەندێ لە باڵەكان ئامانج گەران و لە بەرامبەر ئەمەشدا هەندێكی دیكە باوەڕیان بە شتی عەمەلی هەیە. (واتە حساب بۆ ئێستا دەكەن).

**خشتەی ژمارە (١١) دیدگای هەریەكە لە باڵەكان لەم بارەیەوە نیشان دەدات**

**خشتەی ژمارە (١١)**

| باڵەكان | ئامانج گەرا یان عەمەلی |
| --- | --- |
| -ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | ئامانج گەرا[٥٣٥] |
| -ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەكان و.. | ئامانج گەرا[٥٣٦] |
| -كارگوزاران | عەمەلی[٥٣٧] |
| -كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان | ئامانج گەرا[٥٣٨] |
| پشتیوانانی حزبوڵلا | ئامانج گەرا[٥٣٩] |
| پەیامی خوێندكار | عەمەلی[٥٤٠] |

---

[٥٣٤] اظهارات طبرزدی در ٧٥/٩/٦.

[٥٣٥] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیری های این جناح است.

[٥٣٦] دو هفتەنامە عصرما، شمارە ٦٦، ٧٦/١/٢٣، ص١٣، سخنان كروبی، همچنین هفتەنامە مبین، شمارە ٢٣١، ٧٥/٣/١٣، ص١.

[٥٣٧] براشت نگارندە از مجموعە موضع گیری های این جناح است.

[٥٣٨] روزنامە اطلاعات، ٧٥/١٠/١٦، ص١٢، سخنان روح الله حسێنیان، همچنین هفتە نامە ارزشها، شمارە ١٩، ٧٦/٢/٢٩، سخنان احمد پورنجاتی.

به سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە ئامانج گەرایی- عەمەلی، دەتوانین لە هێڵکارییەکدا بەم شێوەیەی لای خوارەوە دایان بنێین:

## ١٢-ئازادی:

سەبارەت بە ئازادی دو دیدگا هەیە هەندێك وەکو (مافێکی خودایی و سروشتی) خەڵك تەماشای دەکەن. گروپێکی دیکە ئازادی بە (ئیمتیازێك دەزانن کە حکومەت بە خەڵکی دەدات.

خشتەی ژمارە (١٢) جۆری تێڕوانینی باڵەکان سەبارەت بەم بابەتە نیشان دەدات

خشتەی ژمارە (١٢)

| باڵەکان | ڕوانین بۆ ئازادی |
|---|---|
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | ئیمتیازە[٥٤١] |
| ئەنجومەنیڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | مافە[٥٤٢] |
| کارگوزاران | مافە[٥٤٣] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | مافە[٥٤٤] |
| پشتیوانانی حزبوڵڵا | ئیمتیازە[٥٤٥] |
| پەیامی خوێندکار | مافە[٥٤٦] |

---

[٥٣٩] هفتەنامە صبح، شمارە ٤٢، ٧٤/١١/١٠، ص٢.

[٥٤٠] مصاحبە نگارندە باحشمت الله طبرزدی، ٧٦/٤/١٥.

[٥٤١] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیری های این جناح است.

[٥٤٢] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ١٨، ٧٤/٤/٧، ص٦.

[٥٤٣] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیری های این جناح است.

[٥٤٤] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیری های این جناح است.

[٥٤٥] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیری های این جناح است.

به سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە ئازادی، دەتوانین لە هێڵکارییەکدا بەم شێوەیەی لای خوارەوە دایان بنێین:

**١٣-بەشداری سیاسی:**

هەندێك لە باڵەکان بەشێوەیەکی بنچینەیی و لە چوارچێوەی حزب و ڕێکخراوەکاندا لە بەشداری سیاسی خەڵك دەڕوانن، هەندێکی تر بەشێوەیەکی سەرەکی بەشداری سیاسی خەڵك لە بەشداریی لە ڕێپێوانەکان، نوێژی هەینی و پشتیوانی لەبەرپرسان و ئەو جۆرە شتانەدا دەبیننەوە.

**خشتەی ژمارە (١٣) جۆری تێڕوانینی باڵەکان سەبارەت بە بەشداریی سیاسی نیشان دەدات:**

**خشتەی ژمارە (١٣)**

| باڵەکان | جۆری بەشداریی سیاسی |
|---|---|
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | بنچینەیی‌نی‌یە[٥٤٧] |
| ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | بنچینەنی‌یە[٥٤٨] |
| کارگوزاران | بنچینەیی‌یە[٥٤٩] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | بنچینەیی‌یە[٥٥٠] |
| پشتیوانانی حزبوڵڵا | بنچینەیی‌نی‌یە[٥٥١] |
| پەیامی خوێندکار | بنچینەیی‌یە[٥٥٢] |

[٥٤٦] هفتەنامە پیام دانشجو، شمارە ٥٢، ٧٥/١/٢٨، ص١٢.

[٥٤٧] روزنامە رسالت، ٧٤/١١/١٩، ویژەنامە، سخنان محمد رضا مهدوی کنی.

[٥٤٨] دو هفتەنامە عصرما، شمارە ٨، ٧٣/١١/٥، ص٢.

[٥٤٩] هفتەنامە بهمن، شمارە ٨، ٧٤/١٢/٥، ص٢.

[٥٥٠] هفتەنامە ارزشها، شمارە ١٤، ٧٦/١/٢٥، ص١١.

[٥٥١] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٣٢، ٧٥/٩/١٥، ص١٠.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە شێوەیی بەشداری سیاسی دەتوانین لە هێڵکارییەکدا بەم شێوەیەی خوارەوە دایان بنێین.

## ١٤-ناردنە دەرەوەی شۆڕش:

هەندێك لە باڵەکان پشتیوانی لە ناردنە دەرەوەی شۆڕش دەکەن و لە بەرامبەر ئەمانەدا، ئەو باوەڕە لە ئارادایە کە دەبێ ئێران بایەخ بە ناوخۆ بدات و خۆی بکات بە نموونەیەك و ئەم نموونەیە دەتوانێ بە ناردنە دەرەوەی شۆڕش تەواوبێ.

خشتەی ژمارە (١٤) جۆری تێڕوانینی باڵەکان سەبارەت بە ناردنە دەرەوەی شۆڕش نیشان دەدات.

خشتەی ژمارە (١٤)

| باڵەکان | ناردنە دەرەوەی شۆڕش |
| --- | --- |
| رۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | پشتیوانی لێدەکات[553] |
| رۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | پشتیوانی لێ دەکات[554] |
| کارگوزاران | دژێتی[555] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | پشتیوانی لێدەکات[556] |
| پشتیوانانی حزبوڵڵا | پشتیوانی لێدەکات[557] |
| پەیامی خوێندکار | دژێتی[558] |

[552] هفتەنامە پیام دانشجو، شمارە ٣٧، ٧٤/٣/٢، ص٣.

[553] ماهنامە صبح، ژمارە ٦٤، آذر ٧٥، ص٢٦،

[554] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ٢٦/ ٧٤/٧/٢٦.

[555] هفتەنامە بهمن، شمارە ٩، ٧٤/١٢/١٢، ص٢.

[556] هفتەنامە ارزشها، شمارە ٣/ ٧٥/٩/١٣، ص١.

[557] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٢٥، ٧٤/١٢/٢٧، ص١.

[558] مصاحبە نگارندە باحشمت الله طبرزدی، ٧٦/٤/١٥.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە ناردنە دەرەوەی شۆڕش، دەتوانین لە هێڵکارییەکدا بەم شێوەی خوارەوە دایان بنێین.

| کارگوزاران | پەیامی خوێندکار * | پشتیوانانی حزبوڵلا | کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. |
|---|---|---|---|---|---|

### ١٥-سیاسەتی دەرەوە:

دەتوانین سیاسەتی دەرەوەی باڵەکان بۆ دوو دەستەی لیبراڵ و رادیکاڵ دابەش بکەین.

خشتەی ژمارە (١٥) جۆری تێڕوانینی باڵەکان سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوە نیشان دەدات.

خشتەی ژمارە (١٥)

| باڵەکان | سیاسەتی دەرەوە |
|---|---|
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | لیبراڵ بەڵام بە تێڕوانینێکی کۆنەوە[٥٥٩] |
| ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | رادیکاڵ[٥٦٠] |
| کارگوزاران | لیبراڵ[٥٦١] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | رادیکاڵ[٥٦٢] |
| پشتیوانانی حزبوڵلا | رادیکاڵ[٥٦٣] |
| پەیامی خوێندکار | لیبراڵ[٥٦٤] |

---

* ئەم نیشانە لە ناوەڕاستدا دانرابوو دیارە هەڵەیە چونکە ئەگەر لە ناوەڕاستدا بێت باڵەکان دەبن بە ٣ بەرامبەر ٣ بەڵام وەك لە خشتەکەدا دەبینین ٢ بەرامبەر (٤)ن ـو ـ.

[٥٥٩] روزنامە اخبار، ٧٤/١٠/٣، محمد جواد لاریجانی.

[٥٦٠] برداشت نگارندە از موضع گیری های این جناح است.

[٥٦١] روزنامە اخبار، ٧٤/٩/١٤ سخنان کاظم پور اردبیلی.

[٥٦٢] هفتەنامە ارزشها، شمارە ١٠، ٧٥/١٢/١٣، ص٤.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە سیاسەتی دەرەکی، دەتوانین لە هێڵکارییەکدا بەم شێوەیە دایان بنێین.

## پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا:

هەندێ لە باڵەکان هەر جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ ئەمریکادا ڕەت دەکەنەوە، لە بەرامبەردا دیدگای وا هەن کە باس لە دروست تەماس و پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا دەکەن.

خشتەی ژمارە (١٦) جوری تێڕوانیی باڵەکان سەبارەت بە تەماس و پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا نیشان دەدات.

خشتەی ژمارە (١٦)

| باڵەکان | گفتوگۆ لەگەڵ ئەمریکا |
|---|---|
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | ناڕازییە[٥٦٥] |
| ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | ناڕازییە[٥٦٦] |
| کارگوزاران | ڕازییە[٥٦٧] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | ناڕازییە[٥٦٨] |
| پشتیوانانی حزبوڵلا | ناڕازییە[٥٦٩] |
| پەیامی خوێندکار | ڕازییە[٥٧٠] |

[٥٦٣] روزنامه کیهان، ٧٥/١١/٦، ص٢.

[٥٦٤] مصاحبه نگارنده با حشمت الله طبرزدی، ٧٦/٤/١٥.

[٥٦٥] بولتن جامعه روحانیت مبارز، ویژه انتخابات، ٧٥/١/٢٤، ص٣٦.

[٥٦٦] دوهفتەنامه عصرما، شماره ٣٠ /٧٤/٩/٢٢، ص٦.

[٥٦٧] برداشت نگارنده از مجموعه موضع گیری هات این گروه است.

[٥٦٨] هفتەنامه ارزشها شماره ١٠ ٧٥/١٢/١٢، ص٤.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا، دەتوانین لە هێڵکارییەکدا بەم شێوەیەی خوارەوە دایان بنێین.

**خشتەی خاڵە هاوبەشەکانی باڵەکان لە ١٦ میحوەری سیاسیدا**

**خشتەی ژمارە (١٧)**

| باڵەکان / ناونیشانەکان | هەڵبژاردنی وەلی فەقیھ | دەسەڵاتەکانی وەلی فەقیھ | مافی فەرمانڕەوایی لە کۆماری ئیسلامیدا | بەرپرسیاری کاربەدەستان لە کۆماری ئیسلامیدا | بەرپرسیاری وەلی فەقیھ لە بەرامبەر خەڵکدا | تەقلیدی کردنی وەلی فەقیھ | چالاکی حزب | حکومەتی ئیسلامی و دیموکراسی | ڕوانین سەبارەت بە باڵەکانی دیکە | جۆری حکومەت | ئامانجی گەرایی | ئازادی | بەشداری سیاسی | ناردنە دەرەوەی شۆڕش | سیاسەتی خارجی | پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + |
| ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | − | − | − | − | − | − | − | − | − | − | + | − | − | + | − | + |
| کارگوزاران | − | − | − | − | − | − | − | − | − | − | − | − | − | − | + | − |
| کۆمەڵەی بەرگری لە | + | + | + | + | + | + | + | − | − | − | + | − | − | + | − | + |

---

[٥٦٩] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٢٣، ٧٤/١١/١١.

[٥٧٠] گفتوگۆی طبرزدی بابخش فارسی رادیو بی‌بی سی، ٧٦/٣/١٧، بخش شامگاهی.

| بەهاکان | | | | | | | + | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پشـتیوانانی حزبوڵڵا | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + + | + | + | + | + | − | + |
| پـــەیامی خوێندکار | − | − | − | − | − | − | − | − | − | − | − | − | − | − | + | − |

نیشانە لەیەك چووەكان لە هەر ستوونێكدا نیشاندەری لەیەك چوونی دیدگای باڵەكانە لەو بوارەدا كە ناونیشانەكەی لە سەرەوەی ستونەكە نووسراوە.

خشتەی خاڵە جیاوازەكان لە رووی هەڵوێستە سیاسیەكانەوە

**خشتەی ژمارە (١٨)**

| باڵەکان | خاڵە جیاوازەکان | کۆی میحوەرەکان | خاڵی هاوبەش |
|---|---|---|---|
| رۆحانیەتی خەباتگێڕو.. لەگەڵ رۆحانیە خەباتگێڕەكان و.. | ١٣ | ١٦ | ٣ |
| رۆحانیەتی خەباتگێڕو.. لەگەڵ كارگوزاران | ١٦ | ١٦ | ٠ |
| رۆحانیەتی خەباتگێڕو.. لەگەڵ كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان | ٥ | ١٦ | ١١ |
| رۆحانیەتی خەباتگێرو.. لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵڵا | ٣ | ١٦ | ١٣ |
| رۆحانیەتی خەباتگێڕو.. لەگەڵ پەیامی خوێندكار | ١٦ | ١٦ | ٠ |
| رۆحانیە خەباتگێڕەكان و.. لەگەڵ كارگوزاران | ٤ | ١٦ | ١٢ |
| رۆحانیە خەباتگێڕەكان و.. لەگەڵ كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان | ٨ | ١٦ | ٨ |
| رۆحانیە خەباتگێڕەكان و .. لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵڵا | ١٣ | ١٦ | ٣ |
| رۆحانیە خەباتگێڕەكان و.. لەگەڵ پەیامی خوێندكار | ٤ | ١٦ | ١٢ |
| كارگوزاران لەگەڵ كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان | ١٢ | ١٦ | ٤ |
| كارگوزاران لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵڵا | ٦ | ١٦ | ٠ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| کارگوزاران لەگەڵ پەیامی خوێندکار | ٠ | ١٦ | ١٦ |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵڵا | ٥ | ١٦ | ١١ |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان لەگەڵ پەیامی خوێندکار | ١٢ | ١٦ | ٤ |
| پشتیوانانی حزبوڵڵا لەگەڵ پەیامی خوێندکار | ١٦ | ١٦ | ٠ |

هەرچەندە ژمارەی ستوونە هاوبەشەکان لە ژمارە (١٦) نزیک تر بێ نیشاندەری زیادبوونی خاڵە هاوبەشەکانی دیدگاکانەو هەرچەندە لە ژمارە (١٦) دوورتر بێ نیشاندەری کەم بوونەوەی خاڵە هاوبەشەکانی دیدگا سیاسیەکانی باڵەکانە.

## بەراوردکردنی هەڵوێستی سیاسی باڵەکان

-هەروەکو خشتەی (١٨) نیشانی دەدات گروپی کارگوزاران و پەیامی خوێندکار لە رووی سیاسیەوە زۆرترین خاڵی هاوبەشیان هەیە.

-لە بەرامبەردا دوو باڵی رۆحانیەتی خەباتگێرو پشتیوانانی حزبوڵڵا لەگەڵ گروپی کارگوزاران و پەیامی خوێندکاردا لە رووی هەڵوێستی سیاسیەوە خاڵی هاوبەشیان نی‌یە.

-هەروەها باڵی رۆحانیەتی خەباتگێر لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵڵا بە بوونی ١٣ خاڵی هاوبەش لە کۆی ١٦ میحوەری لێکۆڵراوە، لەرووی سیاسی‌یەوە دیدگایان لە یەکەوە نزیکە.

-دوو باڵی رۆحانیەتی خەباتگێرو رۆحانیە خەباتگێرەکان بەبوونی ٣ خاڵی هاوبەش لە کۆی ١٦ میحوەری لێکۆڵراوە لەرووی سیاسیەوە کەمێك لایەنی هاوبەشیان هەیە.

-باڵی رۆحانیە خەباتگێرەکان لەگەڵ دوو گروپی کارگوزاران و پەیامی خوێندکار لەرووی سیاسیەوە خاڵی هاوبەشی زۆریان هەیە (١٢ خاڵی هاوبەش لە کۆی ١٦ میحوەر لێکۆڵراوە).

-گروپی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان لەرووی سیاسیەوە لە باڵی کۆمەڵەی رۆحانیەتی خەباتگێر نزیك ترە (١١ خاڵی هاوبەش لەکۆی ١٦ میحوەری لێکۆڵراوە) تا لە باڵی رۆحانیە خەباتگێرەکانەوە (٨ خاڵی هاوبەش لەکۆی ١٦ میحوەری لێکۆڵراوە).

-باڵی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵلادا لەرووی سیاسیەوە خاڵی هاوبەشی کەمیان هەیە (٣ خاڵی هاوبەش لە ١٦ میحوەری لیکۆڵراوە).

-گروپی کارگوزاران لەگەڵ کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکاندا لەرووی سیاسیەوە خاڵی هاوبەشی کەمیان هەیە (٤ خاڵی هاوبەش لە کۆی ١٦ میحوەری لێکۆڵراوە)

-گروپی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان لەگەڵ باڵی پشتیوانانی حزبوڵلادا لەرووی هەڵوێستی سیاسیەوە خاڵی هاوبەشی زۆریان هەیە (١١ خاڵی هاوبەش لەکۆی ١٦ میحوەری لێکۆڵراوە)

-گروپی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان لەگەڵ گروپی پەیامی خوێندکاردا لە رووی سیاسی خاڵی هاوبەشی کەمیان هەیە (٤ خاڵی هاوبەش لەکۆی ١٦ میحوەری لێکۆڵراوە).

دووری یان نزیکی هەڵوێستی سیاسی باڵەکان لەم هێڵکاریانەی خوارەوە نیشان دراوە:

## ٢-٣-بەراوردکردنی دیدگا ئابوورییەکان

### ١-بەتایبەتی کردن:

هەندێ لە باڵەکان پشتیوانی لە بەتایبەتی کردنی ئابووری دەکەن، لە بەرامبەردا گروپێکی دیکە دژی ئەوەن.

خشتەی ژمارە (١٩) جیاوازی بۆ چوونەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات.

**خشتەی ژمارە (١٩)**

| باڵەکان | بەتایبەتی کردن |
| --- | --- |
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | ڕازیی‌یە[٥٧١] |
| ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | ناڕازیی‌یە[٥٧٢] |
| کارگوزاران | ڕازیی‌یە[٥٧٣] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | ڕازیی‌یە بەڵام بە بەشداری خەڵك بە گشتی[٥٧٤] |
| پشتیوانانی حزبوڵڵا | ناڕازیی‌یە[٥٧٥] |
| پەیامی خوێندکار | ناڕازیی‌یە[٥٧٦] |

[٥٧١] روزنامه کاروکارگر، ٧٥/٨/٢٣، محمد جواد لاریجانی.

[٥٧٢] دوهفته نامه عصرما، شماره ٩٥، ٧٥/١٢/١٦، ص٨.

[٥٧٣] هفتەنامه بهمن، شماره ٥، ٧٤/١١/١٤، ص١.

[٥٧٤] روزنامه اطلاعات، ٧٥/١٠/١٢، ص٣، سخنان احمد پورنجاتی.

[٥٧٥] ماهنامه يالثارات الحسين، شماره ٢٢، ص٣.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە تایبەتی کردن، دەتوانین لە هێڵکارییەکدا بەم شێوەیەی خوارەوە دایان بنێین.

**٢-گەشە پێدانی ئابووری:**

هەندێ لە باڵەکان باوەڕیان وایە کە گەشەپێدانی ئابووری ئەولەویەتی یەکەم نییە. لە بەرامبەردا دیدگایەك هەیە کە گەشەپێدانی ئابووری بە ئەولەویەت دەزانێت. خشتەی ژمارە (٢٠) جیاوازی بۆچوونی باڵەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدا.

**خشتەی ژمارە (٢٠)**

| باڵەکان | گەشە پێدانی ئابووری ئەولەویەتی یەکەمە |
| --- | --- |
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | ناڕازییە[٥٧٧] |
| ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | ناڕازییە[٥٧٨] |
| کارگوزاران | ڕازییە[٥٧٩] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | ناڕازییە[٥٨٠] |
| پشتیوانانی حزبوڵڵا | ناڕازایییە[٥٨١] |
| پەیامی خوێندکار | ناڕازییە[٥٨٢] |

---

[٥٧٦] هفتەنامە پیام دانشجو، شمارە ٥، ٧٣/٧/٤، ص٣.

[٥٧٧] روزنامە رسالت، ویژەنامە، ٧٤/١١/١٩، ص٥.

[٥٧٨] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ١٢، ٧٤/١/١٦، ص٢.

[٥٧٩] روزنامە اطلاعات، ٧٤/١٢/١٦، ص١٢، سخنان غلا محسين كرباسچى.

[٥٨٠] ماهنامە صبح، شمارە ٤٧، ٧٤/١٢/١٥، ص٨، سخنان رى شهرى.

[٥٨١] ماهنامە يالثارات الحسين، شمارە ٢٣، ٧٤/١١/١١، ص٧.

بەحسابکردن بۆ دیدگای باڵەکان سەبارەت بە پەرەپێدانی ئابووری، دەتوانین لە هێڵکاریەکدا بەم شێوەی لای خوارەوە دایان بنێین.

**٣-دەست وەردانی دەوڵەت لە ئابووری:**

هەندێ لە باڵەکان پشتیوانی لە دەست وەردانی دەوڵەت دەکەن لە بواری ئابووری‌داو بە دەوری زاڵی دەوڵەت قایلن. لە بەرامبەردا گروپێکی دیکە باوەڕیان بە دەستێوەردانی دەوڵەت نی‌یە لە بواری ئابووری‌دا.

**خشتەی ژمارە (٢١) جیاوازی بۆچوونی باڵەکان لەم بوارەدا نیشان دەدات**

**خشتەی ژمارە (٢١)**

| باڵەکان | ڕۆڵی زاڵی دەوڵەت لە ئابووری‌دا |
|---|---|
| ڕۆحانیەتی خەباتگێرو.. | ناڕازی‌یە[583] |
| ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێرەکان و.. | ڕازی‌یە[584] |
| کارگوزاران | ناڕازی‌یە[585] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | ناڕازی‌یە[586] |
| پشتیوانانی حزبوڵڵا | ڕازای‌یە[587] |
| پەیامی خوێندکار | ڕازی‌یە[588] |

[582] هفتەنامە پیام دانشجو، شمارە ٢٠، ٢٠/١٠/٧٤، ص١٠.

[583] ویژەنامە انتخابات جامعە روحانیت مبارز، ٢٤/١/٧٥.

[584] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ٥٦، ٩/٨/٧٥، ص٥.

[585] هفتەنامە بهمن، شمارە ٥، ١٤/١/٧٦، ص١.

[586] روزنامە اطلاعات ٨/١٢/٧٥، ص٢ سخنان ری شهری.

[587] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٣،٢٢/١٠/٧٤، ص٥.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە دەستێوەردانی دەوڵەت لە ئابووریدا، دەتوانین لە هێڵکاریەکدا بەم شێوەیەی خوارەوە دایان بنێین.

**٤-کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی:**

هەندێ لە باڵەکان وەرگرتنی قەرز لە سەرچاوە دەرەکیەکانەوە رەت دەکەنەوە، لە بەرامبەردا، دیدگای دیکە هەن کە باوەڕیان بە کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی هەیە.

**خشتەی ژمارە (٢٢) جیاوازی دیدگای باڵەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات**

**خشتەی ژمارە (٢٢)**

| باڵەکان | وەرگرتنی قەرز لە سەرچاوە دەرەکیەکان |
| --- | --- |
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | ڕازییە[589] |
| ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | ڕازییەو مەرجی هەیە[590] |
| کارگوزاران | ڕازییە[591] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | ڕازییەو مەرجی هەیە[592] |
| پشتیوانانی حزبوڵلا | ناڕازاییە[593] |
| پەیامی خوێندکار | ناڕازییە[594] |

---

[588] هفتەنامە پیام دانشجو، شمارە ٢٦، ٧٤/٢/٢٦، ص٦.

[589] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ١، ٧٣/٧/٢٧، سخنان ناطق نوری.

[590] همان، شمارە ٤٢، ٧٥/١/٢٩، ص٢.

[591] هفتەنامە بهمن، شمارە ١، ٧٤/١٠/١٦، ص٥.

[592] هفتەنامە ارزشها، شمارە ٦، ٧٥/١٠/١٥، ص٣.

[593] براشت نگارندە از مجموعە موضع گیری های این جناح است.

به سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی، دەتوانین لە هێڵکاریەکدا بەم شێوەیە دایان بنێین.



٥-ئابووری بازاڕی ئازاد:

هەندێ لە باڵەکان پشتیوانی لە ئابووری بازاڕی ئازاد دەکەن، لە بەرامبەردا، چەند باڵێك دژی دەوەستنەوە.

خشتەی ژمارە (٢٣) جیاوازی دیدگای باڵەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات.

خشتەی ژمارە (٢٣)

| باڵەکان | ئابووری بازاڕی ئازاد |
| --- | --- |
| ڕۆحانیەتی خەباتگێرو.. | لەگەڵێتی[٥٩٥] |
| ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێرەکان و.. | دژێتی[٥٩٦] |
| کارگوزاران | لەگەڵێتی[٥٩٧] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | دژێتی[٥٩٨] |
| پشتیوانانی حزبوڵڵا | دژێتی[٥٩٩] |
| پەیامی خوێندکار | دژێتی[٦٠٠] |

[٥٩٤] هفتەنامە پیام دانشجو، شمارە ٣٢، ٧٤/١/٢٩، ص٨.

[٥٩٥] خبرگزاری رویتر، ٧٥/١١/٢٤، سخنان محمد جواد لاریجانی.

[٥٩٦] روزنامە کاروکارگر، ٧٥/٩/٢٨، سخنان منتخب نیا، همچنین دوهفتە نامە عصرما شمارە ١، ٧٣/٢/٢٧.

[٥٩٧] هفتەنامە بهمن، شمارە ٥، ٧٤/١١/١٤، ص٧..

[٥٩٨] بیانیە شمارە ١، جمعیت دفاع از ارزشهای انقلاب اسلامی.

[٥٩٩] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٢٢، ٧٤/١٠/٣، ص ٧..

[٦٠٠] اظهارات طبرزدی در ٧٦/٢/١٧.

به سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە ئابووری بازاڕی ئازاد، دەتوانین لە هێڵکارییەکدا بەم شێوەی خوارەوە دایان بنێین.

**٦-داد پەروەری کۆمەڵایەتی:**

هەندێ لە باڵەکان باوەڕیان وایە کە دادپەروەری کۆمەڵایەتی ئەولەویەتی یەکەمە. لە بەرامبەر دیدگای دیکە هەیە کە باوەڕی وایە هەتا گەشەپێدانی ئابووری نەبێ، سەرمایەیەك نییە بۆ ئەوەی دابەش بکرێت.

خشتە ژمارە (٢٤) جیاوازی دیدگای باڵەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات

خشتەی ژمارە (٢٤)

| باڵەکان | داد پەروەری کۆمەڵایەتی ئەولەویەتی یەکەمە |
|---|---|
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | لەگەڵێتی[٦٠١] |
| ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | لەگەڵێتی[٦٠٢] |
| کارگوزاران | دژێتی[٦٠٣] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | لەگەڵێتی[٦٠٤] |
| پشتیوانانی حزبوڵڵا | لەگەڵێتی[٦٠٥] |
| پەیامی خوێندکار | لەگەڵێتی[٦٠٦] |

[٦٠١] ویژنامە روزنامە رسالت، ٧٤/١١/١٩، ص٥، سخنان مهدومی کنی.

[٦٠٢] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ٦٥، ٧٥/١٢/١٦، ص٩، همچنین، شمارە ٦٦، ٧٦/١/٢٣، سخنان کروبی.

[٦٠٣] روزنامە اطلاعات، ٧٤/٢/١٦، ص١٢، سخنان کرباسچی.

[٦٠٤] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیری‌های این جناح است.

[٦٠٥] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٢٣، ٧٤/١١/١١، ص٦.

[٦٠٦] هفتەنامە پیام دانشجو، شمارە ٥٠، ٧٤/١/١٢، ص٤.

به سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت  بە دادپەروەری کۆمەڵایەتی، دەتوانین لە هێڵکاریەکدا بەم شێوەی خوارەوە دایان بنێین.

## ٧- نموونەی ئابووری:

هەندێ لە باڵەکان لەو نموونەی ئابوورییەی بەلایانەوە پەسەندە، تەئکید لە خۆبژێوی (اکتفاء الذاتی) دەکەنەوە، لە بەرامبەردا، باڵەکانی دیکە، پەرەپێدانی هەناردەو پەرەپێدانی لەگەڵ بە سەرەکی دانانی بازرگانی، ئەو نموونانەیە کە بە لایانەوە پەسەندە.

خشتەی ژمارە (٢٥) جیاوازی دیدگای باڵەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات.

خشتەی ژمارە (٢٥)

| باڵەکان | نموونەی ئابووری |
|---|---|
| ڕۆحانیەتی خەباتگێرو.. | پەرەپێدان لەگەڵ بە میحوەر دانانی بازرگانی[٦٠٧] |
| ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | خۆبژێوی[٦٠٨] |
| کارگوزاران | پەرەپێدانی هەناردە[٦٠٩] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | خۆبژێوی[٦١٠] |
| پشتیوانانی حزبوڵلا | خۆبژێوی[٦١١] |
| پەیامی خوێندکار | خۆبژێوی[٦١٢] |

[٦٠٧] ماهنامە صبح، شمارە ٦٦، بهمن ٧٥، ص٥، سخنان باهنر.

[٦٠٨] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ٦٥، ٧٥/١٢/١٦، ص٨.

[٦٠٩] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیری های این جناح است.

[٦١٠] هفتەنامە ارزشها، شمارە ٨، ٧٥/١١/١٥، ص٥.

[٦١١] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٢٢، ٧٤/١٠/٣، ص٧.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە نموونەی ئابووری، دەتوانین لە هێڵکاریەکدا بەم شێوەی لای خوارەوە دایان بنێین.

**خشتەی خاڵە هاوبەشەکانی هەڵوێستی ئابووری باڵەکان لەگەڵ یەکتری‌دا**

**خشتەی ژمارە (٢٦)**

| باڵەکان / ناونیشان | ئایینەتی کردن | گەشە پێدانی ئابووری | دەست وەردانی دەوڵەت لە ئابووری | کەڵک وەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی | ئابووری بازاری ئازاد | دادپەروەری کۆمەڵایەتی | نموونەی ئابووری |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | + | + | + | + | + | + | ++ |
| ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | − | + | − | ++ | − | + | − |
| کارگوزاران | + | − | + | + | + | − | + |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | ++ | + | + | ++ | − | + | − |
| پشتیوانانی حزبوڵلا | − | + | − | − | − | + | − |
| پەیامی خوێندکار | − | + | − | − | − | + | − |

---

[٦١٢] هفته‌نامه پیام دانشجو، شماره ٤٩، ٧٤/١٢/٢٢، ص١٤.

نیشانە لەیەك چووەكان لە هەر ستوونێكدا نیشاندەری لەیەك چوونی دیدگای باڵەكانە سەبارەت بەو ناونیشانەی لە سەرەوەی ستوونەكەوە نووسراوە.

خشتەی خاڵی جیاوازی باڵەكان لە رووی هەڵوێستی ئابوورییانەوە

خشتەی ژمارە ( ٢٧ )

| باڵەكان | خاڵە جیاوازەكان | كۆی ميحوەرەكان | خاڵی هاوبەش |
|---|---|---|---|
| رۆحانیەتی خەباتگێرو.. لەگەڵ رۆحانیە خەباتگێرەكان و | ٥ | ٧ | ٢ |
| رۆحانیەتی خەباتگێرو.. لەگەڵ كارگوزاران | ٣ | ٧ | ٤ |
| رۆحانیەتی خەباتگێرو.. لەگەڵ كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان | ٤ | ٧ | ٣ |
| رۆحانیەتی خەباتگێرو.. لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵلا | ٥ | ٧ | ٢ |
| رۆحانیەتی خەباتگێرو.. لەگەڵ پەیامی خوێندكار | ٥ | ٧ | ٢ |
| رۆحانیە خەباتگێرەكان و.. لەگەڵ كارگوزاران | ٧ | ٧ | ٠ |
| رۆحانیە خەباتگێرەكان و.. لەگەڵ كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان | ٣ | ٧ | ٤ |
| رۆحانیە خەباتگێرەكان و.. لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵلا | ١ | ٧ | ٦ |
| رۆحانیە خەباتگێرەكان و.. لەگەڵ پەیامی خوێندكار | ١ | ٧ | ٦ |
| كارگوزاران لەگەڵ كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان | ٦ | ٧ | ١ |
| كارگوزاران لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵلا | ٧ | ٧ | ٠ |
| كارگوزاران لەگەڵ پەیامی خوێندكار | ٧ | ٧ | ٠ |
| كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵلا | ٣ | ٧ | ٤ |
| كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان لەگەڵ پەیامی خوێندكار | ٣ | ٧ | ٤ |
| پشتیوانانی حزبوڵلا لەگەڵ پەیامی خوێندكار | ٧ | ٧ | ٧ |

هەرچەندە ژمارەی ستوونە هاوبەشەکان لە ژمارە (٧) نزیکتر بێت نیشاندەری زیادبوونی خاڵی هاوبەشی بۆچوونەکانەو هەرچەندە لە ژمارە (٧) دوور بکەوێتەوە نیشاندەری کەم بوونی خاڵی هاوبەشی بۆچوونە ئابوورییەکانە.

**بەراوردکردنی هەڵوێستی ئابووری باڵەکان:**

-هەروەکو خشتەی ژمارە (٢٧) نیشانی دەدات، گروپی کارگوزاران لەگەڵ باڵەکانی رۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. پشتیوانانی حزبوڵلا و پەیامی خوێندکار لە رووی هەڵوێستی ئابوورییەوە خاڵی هاوبەشیان لە نێواندا نییە.

-هەردوو باڵی پشتیوانانی حزبوڵلاو پەیامی خوێندکار لە رووی ئابوورییەوە زۆرترین خاڵی هاوبەشیان لە نێواندایە.

-باڵی رۆحانیەتی خەباتگێڕ لەگەڵ سێ باڵی رۆحانیە خەباتگێڕەکان و پشتیوانانی حزبوڵلا و پەیامی خوێندکار لە رووی ئابوورییەوە خاڵی هاوبەشی کەمیان هەیە. (٢ خاڵی هاوبەش لە کۆی ٧ میحوەری لێکۆڵراوە).

-هەڵوێستە ئابوورییەکانی رۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. لەگەڵ کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان ٤ خاڵی هاوبەشیان هەیە لە کۆی ٧ میحوەری لێکۆڵراوە).

-باڵی رۆحانیە خەباتگێڕەگان لەگەڵ باڵی پشتیوانانی حزبوڵلاو پەیامی خوێندکار لە هەڵوێستە ئابوورییەکاندا خاڵی هاوبەشی زۆریان هەیە (٦ خاڵی هاوبەش لە کۆی ٧ میحوەری لێکۆڵراوە)

-کارگوزاران و کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان لەرووی ئابوورییەوە خاڵی کەمی هاوبەشیان هەیە.

-هەڵویستە ئابوورییەکانی کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵلا و پەیامی خوێندکار بریتییە لە (٤ خاڵی هاوبەش لەکۆی ٧ میحوەری لێکۆڵراوە)

لێرە بەدواوە دووری و نزیکی هەڵوێستی ئابووری باڵەکان بە هێڵکاری نیشان دراوە.

دووری و نزیکی هەڵوێستی ئابووری باڵەکان لەسەر هێڵکاریەکان ئەم هێڵکاریانەی خوارەوە رادەی دووری و نزیکی هەڵوێستی ئابووری باڵەکان لە یەکترییەوە نیشان دەدەن:

٦-پەیامی خوێندکار لەگەڵ هەموو باڵەکاندا.

## ٣-٣-بەراوردکردنی بۆچوونە فەرهەنگیەکان.

### ١-سانسۆر لەسەر چالاکیە فەرهەنگیەکان:

سەبارەت بە سانسۆر لەسەر بەرهەمە فەرهەنگیەکان دوو بۆچون هەیە. ئەو باڵانەی باوەڕیان وایە کە دەبێ سانسۆر لە دوای بلاوبوونەوەی بەرهەمە فەرهەنگیەکان بێت. لە بەرامبەر ئەمەدا گروپێکی تر تەئکید لە سانسۆر دەکەنەوە بەر لە بلاوکردنەوەی بەرهەمەکان.

خشتەی ژمارە ٢٨ لەم بارەیەوە دیدگای باڵەکان نیشان دەدات.

خشتەی ژمارە (٢٨)

| باڵەکان | سانسۆر لەسەر چالاکیە فەرهەنگیەکان |
|---|---|
| ڕۆحانیەتی خەباتگێرو.. | سانسۆر بەر لە بلاوکردنەوە[٦١٣] |
| ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | سانسۆر دوای بلاوکردنەوە[٦١٤] |
| کارگوزاران | سانسۆر دوای بلاوکردنەوە[٦١٥] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | سانسۆر بەر لە بلاوکردنەوە[٦١٦] |
| لایەنگرانی حزبوڵلا | سانسۆر بەر لە بلاوکردنەوە[٦١٧] |
| پەیامی خوێندکار | سانسۆر بەر لە بلاوکردنەوە[٦١٨] |

[٦١٣] ویژەنامە جامعە روحانیت مبارز بە مناسبت انتخابات دورە پنجم مجلس، ص٣٣..

[٦١٤] دوهفتەنامە عصرما، شمارە ٤٧، ٧٥/٤/٦، ص٢.

[٦١٥] هفتەنامە بهمن، شمارە ١، ٧٤/١٠/١٦، ص٣..

[٦١٦] هفتەنامە ارزشها، شمارە ٢، آبان ١٣٧٥، ص٩.

[٦١٧] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارة ٢٣/ ٧٤/١١/١١، ص٧.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە سانسۆر لەسەر بەرهەمە فەرهەنگیەکان، دەتوانین لە هێڵکاریەکدا بەم شێوەی خوارەوە دایان بنێین.

| رۆحانیەتی خەباتگێڕو. | کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | لایەنگرانی حزبوڵلا | پەیامی خوێندکار | کارگوزاران | رۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. |
|---|---|---|---|---|---|

## ٢-ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی:

هەندێ لە باڵەکان تەئکید لە کەڵك وەرگرتن لە لایەنە باشەکانی فەرهەنگەکانی دیکە دەکەنەوە، لە بەرامبەردا، گروپێکی دیکە فەرهەنگی خۆماڵی بە دەوڵەمەند دەزانن و لەلایەکی دیکەوە لەبەر ترس لە فەرهەنگی بیانی دژی ئاڵوگۆڕی فەرهەنگین.

خشتەی ژمارە ٢٩ دیدگای باڵەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات:

خشتەی ژمارە (٢٩)

| باڵەکان | ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی |
|---|---|
| ئەنجومەنی رۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | دژێتی[٦١٩] |
| ئەنجومەنی رۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | لەگەڵێتی[٦٢٠] |
| کارگوزاران | لە گەڵێتی[٦٢١] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | دژێتی[٦٢٢] |
| لایەنگرانی حزبوڵلا | دژێتی[٦٢٣] |
| پەیامی خوێندکار | لەگەڵێتی[٦٢٤] |

---

[٦١٨] مصاحبە نگارندە با طبرزدی، ٧٦/٤/١٥..

[٦١٩] مجلس پنجم و مواضع ما، جامعە اسلامی کارگران، ص٢٧.

[٦٢٠] دو هفتەنامە عصرما، شمارە ١٢، ٧٤/١/٣٠، ص٢.

[٦٢١] هفتەنامە بهمن، شمارە ١٧/ ٧٥/٢/٨، ص٢..

[٦٢٢] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیرهای این جناح است.

[٦٢٣] ماهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٢٧، ٧٤/١٢/٢٧، ص٨.

به سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە سانسۆری ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی، دەتوانین لە هێڵکاریەکدا بەم شێوەی لای خوارەوە دایان بنێین.

۳-سیاسەتی فەرهەنگی:

لە بەرامبەر ئەو بۆچوونانەدا کە باوەڕیان بە سیاسەتی فەرهەنگی کراوە هەیە، چەند باڵێك دژی ئەوەن، و تەئکید لە سیاسەتی کۆنترۆڵ دەکەنەوە.

خشتەی ژمارە (۳۰) دیدگای باڵەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات

خشتەی ژمارە (۳۰)

| باڵەکان | ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی |
|---|---|
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | دژێتی[٦٢٥] |
| ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | لەگەڵێتی[٦٢٦] |
| کارگوزاران | لە گەڵێتی[٦٢٧] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | دژێتی[٦٢٨] |
| لایەنگرانی حزبوڵڵا | دژێتی[٦٢٩] |
| پەیامی خوێندکار | لەگەڵێتی[٦٣٠] |

[٦٢٤] مصاحبه نگارنده با طبرزدی، ٧٦/٤/١٥.

[٦٢٥] دو هفتەنامه عصرما، شماره ٣١، ٧٤/١٠/٦، ص٨ به نقل از روزنامه اخبار، سخنان محمد جواد لاریجانی..

[٦٢٦] دو هفتەنامه عصرما، شماره ٣٥، ٧٤/٧/١٢، ص٧.

[٦٢٧] روزنامه ایران ٧٦/٥/١٧، ص٣، سخنان عطاء الله مهاجرانی.

[٦٢٨] برداشت نگارنده از مجموعه موضع گیری های این جناح است.

[٦٢٩] ماهنامه یالثارات الحسین موضع گیری های این جناح است.

[٦٣٠] مصاحبه نگارنده با طبرزدی، ٧٦/٤/١٥.

به سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە سیاسەتی فەرهەنگی، دەتوانین لە هێڵکاریەکدا بەم شێوەی لای خوارەوە دایان بنێین.

## ٤-دەست وەردانی دەوڵەت لە چالاکیە فەرهەنگیەکان:

سەبارەت بە دەست وەردانی دەوڵەت لە چالاکیە فەرهەنگیەکان، هەندێ لە باڵەکان باوەڕیان بە چاودێری و ڕێنمایی دەوڵەت هەیە لە چالاکیە فەرهەنگیەکاندا، لە بەرامبەردا، گروپێکی دیکە پشتیوانی لە کۆنتڕۆڵ کردنی چالاکیە فەرهەنگیەکان دەکەن لەلایەن دەوڵەتەوە.

خشتەی ژمارە (٣١) دیدگای باڵەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات:

خشتەی ژمارە ( ٣١ )

| باڵەکان | دەست وەردانی دەوڵەت لە چالاکیە فەرهەنگیەکان |
|---|---|
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | پشتیوانی لە کۆنتڕۆڵ دەکات[٦٣١] |
| ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | پشتیوانی لە چاودێری دەکات[٦٣٢] |
| کارگوزاران | پشتیوانی لە چاودێری دەکات[٦٣٣] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | پشتیوانی لە کۆنتڕۆڵ دەکات[٦٣٤] |
| لایەنگرانی حزبوڵلا | پشتیوانی لە کۆنتڕۆڵ دەکات[٦٣٥] |
| پەیامی خوێندکار | پشتیوانی لە چاودێری دەکات[٦٣٦] |

[٦٣١] برداشت نگارنده از مجموعه موضع گیری های این جناح است.

[٦٣٢] دو هفتەنامە عصرما، شمارە ٤٧، ٧٥/٤/٦ ص٢..

[٦٣٣] هفتەنامە بهمن، شمارە١، ٧٤/١٠/١٦، ص٣.

[٦٣٤] هفتەنامە ارزشها، شمارە ٢، ابان ١٣٧٥، ص٩.

[٦٣٥] مهنامە یالثارات الحسین، شمارە ٢٣، ٧٤/١١/١١، ص٧.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە دەستێوەردانی دەوڵەت لە چالاکیە فەرهەنگیەکاندا، دەتوانین لە هێڵکارییەکدا بەم شێوەیەی خوارەوە دایان بنێین.

## ٥-سەربەخۆیی فەرهەنگی:

هەندی لە باڵەکان سەبارەت بە سەربەخۆیی فەرهەنگی حەساسیەتیان هەیە، لە بەرامبەردا، باڵەکانی دیکە باوەڕی بە فەرهەنگی گشتی بەشەری هەیەو سەبارەت بە سەربەخۆیی فەرهەنگی هێندە حەساسیەتیان نییە.

**خشتەی ژمارە (٣٢) دیدگای باڵەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات**

**خشتەی ژمارە (٣٢)**

| باڵەکان | سەربەخۆیی فەرهەنگی |
|---|---|
| رۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | سەربەخۆیی فەرهەنگی بە مەفهومی اکتفای زاتی و دژایەتی کردنی چاوپێداخشانەوەی شتە کۆنەکان[٦٣٧] |
| ئەنجومەنی رۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | باوەڕی بەسەربەخۆیی فەرهەنگی هەیە ئارەزووی لە وەرگرتنی فەرهەنگی هەڵبژاردەو کۆنترۆڵکراوی بێگانە هەیە[٦٣٨] |
| کارگوزاران | فەرهەنگ، مەسەلەیەکە پەیوەندی بەسەراپای خەڵکەوە هەیە. هێندە حەساسیەتی سەبارەت بە سەربەخۆیی فەرهەنگی نییە.[٦٣٩] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | بە سەربەخۆیی فەرهەنگیەوە پابەندە بە مەفهومی ئیکتیفای زاتی لەگەڵ حسابکردن بۆ نوێکردنەوەی کۆن[٦٤٠] |
| لایەنگرانی حزبوڵڵا | سەربەخۆیی فەرهەنگی بە مەعنای ئیکتیفای زاتی تەواو و تێڕوانینی سلبی بۆ فەرهەنگی بێگانە[٦٤١] |
| پەیامی خوێندکار | باوەڕی بەسەربەخۆیی فەرهەنگی هەیە، ئارەزووی لە وەرگرتنی فەرهەنگی هەڵبژاردەو کۆنترۆڵکراوی بێگانە هەیە[٦٤٢] |

---

[٦٣٦] مصاحبە نگارندە با طبرزدی، ١٥/٤/٧٦.

[٦٣٧] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیری های این جناح است.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە دەستێوەردانی باڵەکان لە سەربەخۆیی فەرهەنگی، دەتوانین لە هێڵکاریەکدا بەم شێوەیە دایان بنێین.



### ٦-هێرشی فەرهەنگی:

سەبارەت بە هێرشی فەرهەنگی هەندێ لە باڵەکان تەئکید لە سیاسەتی جڵەوگیری دەکەنەوە لە بەرامبەردا، گروپێکی دیکە باوەڕیان بە سیاسەتی دڵنیاکردنەوەی کۆمەڵ یان پێکهاتەیەکی لەو جۆرە هەیە

خشتەی ژمارە (٣٣) دیدگای هەریەکە لە باڵەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات

**خشتەی ژمارە (٣٣)**

| باڵەکان | شێوەی مامەڵە لەگەڵ هێرشی فەرهەنگیدا |
|---|---|
| رۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | سیاسەتی جڵەوگیری[٦٤٣] |
| ئەنجومەنی رۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | تەئکید کردنەوە لەسەر سیاسەتی دڵنیاکردنەوە لەگەڵ حسابکردن بۆ سیاسەتی جڵەوگیری[٦٤٤] |
| کارگوزاران | سیاسەتی دڵنیاکردنەوە[٦٤٥] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | سیاسەتی جڵەگیری + دڵنیاکردنەوە[٦٤٦] |
| لایەنگرانی حزبوڵڵا | سیاسەتی جڵەوگیری[٦٤٧] |
| پەیامی خوێندکار | سیاسەتی دڵنیاکردنەوە[٦٤٨] |

[٦٣٨] دو هفتەنامە عصرما، شمارە ١٢، ٧٤/١٢/١٣.

[٦٣٩] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیری های این جناح است.

[٦٤٠] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیری‌های این جناح است.

[٦٤١] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیری‌های این جناح است.

[٦٤٢] مصاحبە نگارندە با طبرزدی، ٧٦/٤/١٥.

[٦٤٣] ویژەنامە جامعە روحانیت مبارز، ص٢٨.

[٦٤٤] دو هفتەنامە عصرما، شمارە ١، ٧٣/٧/٢٧، ص٦.

[٦٤٥] هفتەنامە بهمن، شمارە ١٧، ٧٥/٢/٨، ص٢.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە هێرشی فەرهەنگی، دەتوانین لە هێڵکاریەکدا بەم شێوەی لای خوارەوە دایان بنێین.

**٧-کۆن و مۆدێرنیزم:**

هەندێ لە باڵەکان باوەڕیان بە شتە کۆنەکان هەیە. لە بەرامبەردا دیدگای تر هەیە کە هێندە دڵی بۆ شتە کۆنەکان لێ نادات و پشتیوانی لە شێوەکانی مۆدێرنیزم دەکات.

**خشتەی ژمارە (٣٥) دیدگای هەریەکە لە باڵەکان لەم بارەیەوە نیشان دەدات**

**خشتەی ژمارە (٣٥)**

| باڵەکان | تێڕوانین بۆ کۆن و مۆدێرنیزم |
|---|---|
| ڕۆحانیەتی خەباتکێڕو.. | بە پاراستنی کۆن و وەزعی ئێستاوە پابەندەو دژی مودێرنیزم و دیمەنەکانێتی[٦٤٩] |
| ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتکێڕەکان و.. | باوەڕی بە پێویستی چاوپێداخشانەوەو ژیانەوەو کاراکردنی کۆن و وەرگرتنی لایەنە هەڵبژاردنەکانی مۆدێرنیزم هەیە[٦٥٠] |
| کارگوزاران | پشتیوانی لە مۆدێرنیزم دەکات و سەبارەت بە کۆن حەساسیەتی نی‌یە[٦٥١] |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان<br>لایەنگرانی حزبوڵلا | بە پاراستنی کۆنەوە پابەندە لەگەڵ چاوپێداخشانەوەی و دژی مۆدێرنیزمە[٦٥٢]<br>مۆدێرنیزم بە پیلانی خۆرئاوا دەزانێت و پابەندە بە کۆنەوە[٦٥٣] |
| پەیامی خوێندکار | باوەڕی بە پێویستی چاوپێداخشانەوەو ژیانەوەو کارایی کردنی کۆن و وەرگرتنی لایەنە هەڵبژاردەکانی مۆدێرنیزم هەیە[٦٥٤] |

[٦٤٦] برداشت نگارنده از مجموعه موضع گیری های این جناح است.

[٦٤٧] ماهنامه یالثارات الحسین، شماره ٢٣، ٧٤/١١/١١، ص٧.

[٦٤٨] مصاحبه نگارنده با طبرزدی، ٧٤/٤/١٥.

[٦٤٩] برداشت نگارنده از مجموعه موضع گیری های این جناح است.

بە سەرنجدان لە دیدگای باڵەکان سەبارەت بە کۆن و مۆدێرنیزم، دەتوانین لە هێڵکاریەکدا بەم شێوەیەی خوارەوە دایان بنێین.

خشتەی خاڵە هاوبەشە فەرهەنگیەکانی باڵەکان لەگەڵ یەکتریدا

خشتەی ژمارە ( ٣٦ )

| ناونیشان / باڵەکان | سانسۆر لەسەر بەرهەمی فەرهەنگی | ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی | سیاسەتی فەرهەنگی | دەست وەردانی دەوڵەت لە چالاکیە فەرهەنگیەکان | سەربەخۆیی فەرهەنگی | هێرشی فەرهەنگی | کۆن و مۆدێرنیزم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. | + | + | + | + | ++ | + | ++ |
| ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. | − | − | − | − | − | − | − |
| کارگوزاران | − | − | − | − | + | ++ | − |
| کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان | + | + | + | + | * | − | * |
| لایەنگرانی حزبوڵڵا | + | + | + | + | ** | + | ** |
| پەیامی خوێندکار | − | − | − | − | − | ++ | − |

---

[٦٥٠] دو هفتەنامە عصرما، شمارە ١٤، ٧٤/٣/١٢، ص٦.

[٦٥١] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیری‌های این جناح است

[٦٥٢] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیری های این جناح است.

[٦٥٣] برداشت نگارندە از مجموعە موضع گیری های این جناح است.

[٦٥٤] مصاحبە نگارندە با طبرزدی، ٧٦/٤/١٥.

نیشانه لەیەك چووەكان لەهەر ستوونێك نیشاندەری لە یەك چوونی دیدگای باڵەكانە لە بارەی ئەو ناونیشانەوە كە لەسەرەوە نووسراوە.

### خشتەی (٣٧)

### خشتەی خاڵی جیاوازی باڵەكان لە رووی هەڵوێستە فەرهەنگیەكانیانەوە

| باڵەكان | خاڵە جیاوازەكان | كۆی میحوەرەكان | خاڵی هاوبەش |
|---|---|---|---|
| رۆحانیەتی خەباتگێرو.. لەگەڵ رۆحانیە خەباتگێرەكان و | ٧ | ٧ | ٠ |
| رۆحانیەتی خەباتگێرو.. لەگەڵ كارگوزاران | ٧ | ٧ | ٠ |
| رۆحانیەتی خەباتگێرو.. لەگەڵ كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان | ٣ | ٧ | ٤ |
| رۆحانیەتی خەباتگێرو.. پشتیوانانی حزبوڵلا | ٢ | ٧ | ٥ |
| رۆحانیەتی خەباتگێرو.. پەیامی خوێندكار | ٧ | ٧ | ٠ |
| رۆحانیە خەباتگێرەكان و.. لەگەڵ كارگوزاران | ٣ | ٧ | ٤ |
| رۆحانیە خەباتگێرەكان و.. لەگەڵ كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان | ٦ | ٧ | ١ |
| رۆحانیە خەباتگێرەكان و .. لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵلا | ٧ | ٧ | ٠ |
| رۆحانیە خەباتگێرەكان و.. لەگەڵ پەیامی خوێندكار | ١ | ٧ | ٦ |
| كارگوزاران لەگەڵ كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان | ٧ | ٧ | ٠ |
| كارگوزاران لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵلا | ٧ | ٧ | ٠ |
| كارگوزاران لەگەڵ پەیامی خوێندكار | ٢ | ٧ | ٥ |
| كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵلا | ٣ | ٧ | ٤ |
| كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان لەگەڵ پەیامی خوێندكار | ٧ | ٧ | ٠ |
| لایەنگرانی حزبوڵلا لەگەڵ پەیامی خوێندكار | ٧ | ٧ | ٠ |

هەرچەندە ژمارەی ناو ستوونی هاوبەش لە ژمارە (٧)ەوە نزیكتر بێ نیشاندەری زیاتربوونی خاڵی هاوبەشی دیدگا فەرهەنگیەكانە و هەرچەندە لە ژمارە (٧) دوورتر بێ نیشاندەری كەم بوونەوەی خاڵی هاوبەشە لەو بوارەدا.

## بەراوردکردنی هەڵوێستی فەرهەنگی باڵەکان

-باڵی ڕۆحانیەتی خەباتگێڕ لەگەڵ باڵی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و گروپەکانی کارگوزاران و پەیامی خوێندکار لە ڕووی فەرهەنگیەوە خاڵی هاوبەشیان لەنێواندا نییە.

-باڵی ڕۆحانیەتی خەباتگێڕ لەگەڵ کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامیدا لە (٧) میحوەری لێکۆڵراوە ٤ خاڵی هاوبەشیان هەیە.

-باڵەکانی ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو پشتیوانانی حزبوڵلا لە هەڵوێستە فەرهەنگیەکاندا بە بەراورد لەگەڵ هەموو باڵەکاندا لە یەکتریەوە نزیک ترن ((٥) خاڵی هاوبەش لە ٧ میحوەری لێکۆڵراوە).

-باڵی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و پشتیوانانی حزبوڵلا لە ڕووی هەڵوێستی فەرهەنگیەوە خاڵی هاوبەشیان لە نێواندا نییە.

-باڵی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و پەیامی خوێندکار لە هەڵوێستی فەرهەنگیدا بە بەراورد لەگەڵ تەواوی باڵەکاندا لە یەکتریەوە نزیک ترن (٦) خاڵی هاوبەش لە ٧ میحوەری لێکۆڵراوە).

-باڵی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و کارگوزاران و لە ٧ میحوەری لێکۆڵراوە ٤ خاڵی هاوبەشیان هەیە

-هەڵوێستە فەرهەنگیەکانی کارگوزاران و پەیامی خوێندکاران بە (٥) خاڵی هاوبەش لە ٧ میحوەری لێکۆڵراوە لە یەکتریەوە نزیکن.

-گروپەکانی کۆمەڵەی بەرگری و پەیامی خوێندکار لە ڕووی هەڵوێستی فەرهەنگییەوە خاڵی هاوبەشیان نییە.

-کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان و پشتیوانانی حزبوڵلا لە ٧ میحوەری لێکۆڵراوە (٤) خاڵی هاوبەشیان هەیە.

-لایەنگرانی حزبوڵلاو پەیامی خوێندکار لە هەڵوێستی فەرهەنگیدا خاڵی هاوبەشیان نییە. نزیکی و دووری هەڵوێستی باڵەکان لەو هێڵکاریانەدا کە لاپەڕەکانی دواییدا دین نیشان دراوە.

دووری و نزیکی هەڵوێستی فەرهەنگی باڵەکان لە هێڵکارییەکاندا:

ئەم هێڵکاریانەی خوارەوە رادەی دووری و نزیکی هەڵوێستی فەرهەنگی باڵەکان لە یەکتریی‌یەوە نیشان دەدات.

## خشتەی خاڵی هاوبەش و جیاوازی باڵەکان لە بوارەکانی سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی

### خشتەی ژمارە ( ٣٨ )

| باڵەکان | خاڵی هاوبەشی سیاسی | زۆرترین خاڵی هاوبەش | خاڵی هاوبەشی ئابووری بە ڕێژەی سەدی | خاڵی هاوبەشی ئابووری | زۆرترین خاڵی هاوبەش | خاڵی هاوبەشی ئابووری بە ڕێژەی سەدی | خاڵی هاوبەشی فەرهەنگی | زۆرترین خاڵی هاوبەش | خاڵی هاوبەشی فەرهەنگی بە ڕێژەی سەدی | هاوبەش لە هەرسێ | کۆی خاڵە هاوبەشەکان لە سێ بەشدا | جیاوازی |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕ لەگەڵ ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان | ٣ | ١٦ | ١٨/٧٥ | ٢ | ٧ | ٢٥/٥٧ | ٠ | ٧ | ٠ | ٣٠ | ٥ | ٢٥ |
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕ لەگەڵ کارگوزاران | ٠ | ١٦ | ٠ | ٤ | ٧ | ٥٧/١٤ | ٠ | ٧ | ٠ | ٣٠ | ٥ | ٢٦ |
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕ لەگەڵ کۆمەڵەی بەهاکان | ١١ | ١٦ | ٦٨/٧٥ | ٣ | ٧ | ٤٢/٨٥ | ٤ | ٧ | ٥٧/١٤ | ٣٠ | ١٨ | ١٢ |
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕ لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵڵا | ١٣ | ١٦ | ٨١/٢٥ | ٢ | ٧ | ٢٨/٥٧ | ٥ | ٧ | ٧١/٤٢ | ٣٠ | ٢٠ | ١ |
| ڕۆحانیەتی خەباتگێڕ لەگەڵ پەیامی خوێندکار | ٠ | ١٦ | ٠ | ٢ | ٧ | ٢٨/٥٧ | ٠ | ٧ | ٠ | ٣٠ | ٢ | ٢٨ |
| ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان لەگەڵ کارگوزاران | ١٢ | ١٦ | ٧٥ | ٠ | ٧ | ٠ | ٤ | ٧ | ٥٧/١٤ | ٣٠ | ١٦ | ١٤ |
| ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان | ٨ | ١٦ | ٥٠ | ٤ | ٧ | ٥٧/١٤ | ١ | ٧ | ١٤/٢٨ | ٣٠ | ١٣ | ١٧ |

| لەگەڵ کۆمەڵەی بەرگری | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| رۆحانییە خەباتگێڕەکان لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵڵا | ٣ | ١٦ | ١٨/٧٥ | ٦ | ٧ | ٨٥/٧١ | ٠ | ٧ | ٠ | ٣٠ | ٩ | ٢١ |
| رۆحانییە خەباتگێڕەکان لەگەڵ پەیامی خوێندکار | ١٢ | ١٦ | ٧٥ | ٦ | ٧ | ٨٥/٧١ | ٦ | ٧ | ٨٥/٧١ | ٣٠ | ٢٤ | ٦ |
| کارگوزاران لەگەڵ کۆمەڵەی بەرگری | ٤ | ١٦ | ٢٥ | ١ | ١٠ | ١٤/٢٨ | ٠ | ٧ | ٠ | ٣٠ | ٥ | ٢٥ |
| کارگوزاران لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵلا | ٠ | ١٦ | ٠ | ٠ | ٧ | ٠ | ٠ | ٧ | ٠ | ٣٠ | ٠ | ٣٠ |
| کارگوزاران لەگەڵ پەیامی خوێندکار | ١٦ | ١٦ | ١٠٠ | ٠ | ٧ | ٠ | ٥ | ٧ | ٧١/٤٢ | ٣٠ | ٢١ | ٩ |
| کۆمەڵەی بەرگری لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵڵا | ١١ | ١٦ | ٦٨/٧٥ | ٤ | ٧ | ٥٧/١٤ | ٤ | ٧ | ٥٧/١٤ | ٣٠ | ١٩ | ١١ |
| کۆمەڵەی بەرگری لەگەڵ پەیامی خوێندکار | ٤ | ١٦ | ٢٥ | ٤ | ٧ | ٥٧/١٤ | ٠ | ٧ | ٠ | ٣٠ | ٨ | ٢٢ |
| لایەنگرانی حزبوڵڵا لەگەڵ پەیامی خوێندکار | ٠ | ١٦ | ٠ | ٧ | ٧ | ١٠٠ | ٠ | ٧ | ٠ | ٣٠ | ٧ | ٢٣ |

## چەند روون کردنەوەیەك

١-ژمارەکـــانی ســـتوونی خـــاڵی هاوبەشـــی سیاســـی لـــە خشـــتەی ژمارە (١٨) دەرهێنراون
ژمارەکـانی ئـەم ستوونە هـەتا لـە ژمـارە ١٦ نزیـك بێتـەوە، نیشـاندەری خـاڵی هاوبەشـی زیـاتری هـەردوو باڵەکەیەو لـە بواری دیدگای سیاسی‌داو بە پێچەوانـەوە، زۆرتریـن خـاڵی هاوبەشـی ئـەم بەشـە یـەعنی ژمـارە ١٦ نیشـاندەری ١٦ میحـوەری لێکۆڵراوەیە لەم بەشەدا.
٢-ژمارەکانی ستوونی هاوبەشی ئابووری لە خشتەی ژمارە (٢٧) دەرهێنراون
ژمارەکانی ئەم ستوونە هەتا لە ژمارە ٧ نزیك بێتەوە، نیشاندەری خاڵی هاوبەشی زیاتری هەردوو باڵەکەیە لە بواری دیدگای ئابووری‌داو بەپێچەوانەوە، زۆرترین خاڵی هاوبەشی ئەم بەشە یەعنی ژمارە ٧ نیشاندەری ٧ میحوەری لێکۆڵراوەیە لەم بەشەدا.
٣-ژمارەکـانی سـتوونی خـاڵی هاوبەشـی فەرهـەنگی لـە خشـتەی ژمـارە ٣٧ وەرگیراون.
ژمارەکانی ئەم ستوونە هەتا لە ژمارە ٧ نزیك بێتەوە، نیشاندەری خاڵی هاوبەشی زیاتر هەردوو باڵەکەیە لە بواری دیدگای فەرهەنگی‌داو بە پێچەوانەوە، زۆرترین خاڵی هاوبەشی ئەم بەشە یەعنی ٧ نیشاندەری ٧ میحوەری لێکۆڵراوەیە لەم بەشەدا.
٤-ستوونی خاڵێ جیاواز: هـەتا ژمارەی ئـەم ستوونە لـە ٣٠ (زۆرتریـن ژمـارەی خاڵێ هاوبەشی مومکن لـە ٣ بەشـەکەدا) نزیـك تـر بێتـەوە نیشـاندەری بەرزبوونـەوەی خاڵی جیاوازی باڵەکەیە.

* * *

خشـتەی ژمـارە ٣٨ ئـەوە نیشـان دەدات کـە گروپـی کـارگوزاران و پشـتیوانانی حزبوڵـلا لـە بـواری مەسـەلە سیاسـی و ئـابووری‌و فەرهەنگیـەکاندا هیـچ خـاڵێکی هاوبەشـیان نی‌یـە. بـەپێی خشـتەی ژمـارە ٣٨ بـاڵی ئەنجومـەنی رۆحانیـە خـەباتگێڕەکان‌و.. گروپـی پـەیامی خوێندکـار بـە بـەراورد لەگـەڵ باڵـەکانی دیکـەدا

زۆرترین خاڵیّ هاوبەشیان هەیە کە لە خشتەی لاپەڕەکانی دوایی‌دا بەشێوەیی نیشاندەرو هیستوگرام وێنەیان کێشراوە.

نیشاندەرەکانی بەراوردکردنی هەڵوێستی باڵەکان لەگەڵ یەکتری‌دا لە هەرسیّ بەشی سیاسی، ئابووری‌و فەرهەنگی‌دا.

١-(نیشاندەر)ی بەراوردکردنی باڵی کۆمەڵەی رۆحانیەتی خەباتگێڕو.. لەگەڵ باڵی ئەنجومەنی رۆحانیە خەباتگێڕەکان لە بواری سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی‌دا بە رێژەی سەدی

هەروەکو نیشاندەرە کە نیشانی دەدات دوباڵی کۆمەڵەی رۆحانیەتی خەباتگێڕو.. ئەنجومەنی رۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. زۆرترین خاڵی هاوبەشیان لە رووی هەڵوێستی ئابوورییەوەیە. (٢٨٪) ئەم دوو باڵە لە رووی فەرهەنگی‌یەوە خاڵی هاوبەشیان نی‌یەو خاڵی هاوبەشیان لە رووی سیاسیشەوە لە ئاستێکی نزمدایە واتە (١٨٪)یە.

٢-نیشاندەری بەراوردکردنی هەڵوێستەکانی باڵی کۆمەڵەی رۆحانیەتی خەباتگێڕو.. لەگەڵ گروپی کارگوزاراندا لە بواری سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی‌دا بە رێژەی سەدی.

هـەروەکو نیشـاندەرە کـە نیشـانی دەدات، کۆمەڵـەی ڕۆحانیـەتی خـەباتگیرو.. و کارگوزاران لە هەڵویستی سیاسی و فەرهـەنگیدا خالی هاوبەشیان نییەو لـە ڕووی ئابوورییەوە هەڵویستی هاوبەشیان بریتییە لە (٥٧٪).

٣-نیشاندەری بەراوردکردنی هەڵویستەکانی باڵی کۆمەڵەی ڕۆحانیەتی خەباتگیر لەگەڵ کۆمەڵـەی بـەرگری لـە بەهاکان لـە بـواری سیاسـی، ئابووری و فەرهـەنگیدا بـە ڕێژەی سەدی.

هەروەکو نیشاندەرەکە نیشانی دەدات کۆمەڵەی ڕۆحانیەتی خەباتگیرو کۆمەڵـەی بەرگری لە بەهاکان لـە ڕووی سیاسیەوە زۆرترین خالی هاوبەشـیان هەیـە (٦٨٪) و هەڵویستی هاوبەشیان لە ڕووی فەرهەنگیەوە بریتییە لە (٥٧٪). کۆمەڵەی بەرگری و کۆمەڵەی ڕۆحانیەتی خەباتگیر لـە ڕووی هەڵویسـتی ئابووری‌یـەوە بە بەراورد لەگـەڵ دو محیوەرەکەی دیکەدا خالی هاوبەشیان کەمترە (٤٢٪).

٤-نیشـاندەری بەراوردکردنی هەڵویسـتەکانی کۆمەڵـەی ڕۆحانیـەتی خـەباتگیرو.. لەگـەڵ بـاڵی پشـتیوانانی حزبولـلا لـە بـواری سیاسـی، ئـابووری و فەرهـەنگیدا بەڕێژەی سەدی.

هەروەکو لە نیشاندرەکەدا دەبینرێت باڵەکانی کۆمەڵەی رۆحانیەتی خەباتگێرو..و پشتیوانانی حزبوڵلا زۆرترین خاڵی هاوبەشیان لە هەڵوێستی سیاسی‌دا هەیە (٨١٪)و خاڵی هاوبەشیان لە بواری فەرهەنگیشدا بەرزە (٧١٪). بەڵام لە بواری ئابووری‌دا خاڵی هاوبەشیان کەمە (٢٨٪).

٥-نیشاندەری بەراوردکردنی هەڵوێستەکانی کۆمەڵەی رۆحانیەتی خەباتگێرو.. لەگەڵ پەیامی خوێندکار لە بواری سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی‌دا بە رێژەی سەدی.

هەروەکو نیشاندەرەکە نیشانی دەدات ئەم دوو باڵە لە رووی سیاسی و فەرهەنگی‌یەوە خاڵی هاوبەشیان لە نێواندا نی‌یەو لە رووی هەڵوێستی ئابووریشەوە خاڵی هاوبەشی نێوانیان لە ئاستێکی نزمدایە (٢٨٪).

٦-نیشاندەری بەراوردکردنی هەڵوێستەکانی رۆحانیە خەباتگێڕەکان لەگەڵ کارگوزاران لە بواری سیاسی ئابووری و فەرهەنگی‌دا بەرێژەی سەدی.

هەروەکو لە نیشاندەرکەدا دەبینرێ کارگوزاران و ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان لە دیدگای سیاسی و فەرهەنگیەکاندا خاڵی هاوبەشی زۆریان هەیە. لە رووی سیاسیەوە (٧٥٪) و لە رووی فەرهەنگیەوە (٥٧٪) خاڵی هاوبەشیان هەیە. بەلام لە رووی هەڵوێستی ئابوورییەوە خاڵی هاوبەشیان نییە.

٧-نیشاندەری بەراوردکردنی هەڵوێستەکانی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. لەگەڵ کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان لە بواری سیاسی، ئابووری و فەرهەنگیدا بە ڕێژەی سەدی.

بە هەمان شێوە کە نیشاندەرەکە نیشانی دەدات ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان لە رووی هەڵوێستە ئابوورییەکانی بە (٥٧٪) زۆرترین خاڵی هاوبەشیان هەیەو خاڵی هاوبەشی سیاسی نێوانیان لە ئاستی (٥٠٪)یە. بەلام لە رووی فەرهەنگییەوە خاڵی هاوبەشی نێوانیان کەمە (١٤٪).

٨-نیشاندەری بەراوردکردنی هەڵوێستەکانی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵلا لە بواری سیاسی، ئابووری و فەرهەنگیدا بە ڕێژەی سەدی.

هـەروەکو لـە نیشـاندەرەکەدا دەبیـنرێ هـەردوو باڵەکـە لـە رووی هەڵوێسـتی ئابوورییـەوە خـاڵی هاوبەشـی زۆریـان هەیـە (٨٥٪) بـەڵام لـە رووی فەرهەنگی‌یـەوە خـاڵی هاوبەشـیان نی‌یـە. هەڵوێسـتی هاوبەشـی سیاسـی دو باڵەکـەش لـە ئاستێکی نزمدایە (١٨٪)یە.

٩-نیشاندەری بەراوردکردنی هەڵوێستەکانی رۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. لەگەڵ پەیامی خوێندکار لە بواری، سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی‌دا بە رێژەی سەدی.

هـەروەکو نیشـاندەرەکە نیشـانی دەدات، هـەر دوو گروپەکـە بـە گشـتی خـاڵی هاوبەشیان زۆرە. کە لە رووی فەرهەنگی‌و ئابوورییەوە بریتی‌یە لە (٨٥٪)، بەرزترین خـاڵی هاوبەشـیان هەیـە. لـە رووی هەڵوێسـتی سیاسیشـەوە خـاڵی هاوبەشـیان بریتی‌یە لە (٧٥٪).

١٠-نیشاندەری بەراوردکردن هەڵوێستەکانی کارگوزاران لەگەڵ کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکاندا لە بواری سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی‌دا بە رێژی سەدی.

هەروەکو نیشاندەرەکە نیشانی دەدات دوو گروپەکە بە گشتی خاڵی هاوبەشی نێوانیان نزمە. بەرزترین خاڵی هاوبەشی نێوانیان لە هەڵوێستی سیاسی‌یەدایە کە ئەویش لە ئاستێکی نزمدایە (٢٥٪). هەروەکو لە رووی ئابووریشەوە لە ئاستێکی نزمدایە (١٤٪) و لە رووی فەرهەنگی‌یەوە خاڵێ هاوبەشیان نی‌یە.

١١-نیشاندەری بەراوردکردنی هەڵوێستەکانی کارگوزاران لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵڵا لە بواری سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی‌دا بەرێژەی سەدی.

هەروەکو نیشاندەرەکە نیشانی دەدات گروپی کارگوزاران و باڵی پشتیوانانی حزبوڵڵا لە بواری سیاسی و ئابووری و فەرهەنگیەکاندا خاڵی هاوبەشیان نی‌یە.

١٢-نیشاندەری بەراوردکردنی هەڵوێستەکانی کارگوزاران لەگەڵ پەیامی‌خوێندکار لە بواری سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی‌دا بەرێژەی سەدی.

هەروەکو نیشاندەرەکە نیشانی دەدات هەردوو گروپەکە لە رووی سیاسی‌یەوە بە تەواوی یەك هەڵوێستیان هەیەو لە رووی فەرهەنگیشەوە خاڵی هاوبەشی نێوانیان لە ئاستێکی باڵادایە (٧١٪) لە کاتێکدا لە رووی ئابوورییەوە خاڵی هاوبەشیان نی‌یە.

١٣-نیشاندەری بەراوردکردنی هەڵوێستەکانی کۆمەڵەی بەرگری لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵڵا لە بواری سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی‌دا بە ڕێژەی سەدی.

هەروەکو نیشاندەرەکە نیشانی دەدات کۆمەڵەی بەرگری و پشتیوانانی حزبوڵڵا لە رووی سیاسیەوە بە (٦٨٪) زۆرترین خاڵی هاوبەشیان لە نێواندایەو خاڵی هاوبەشی نێوانیان لە رووی ئابووری‌و فەرهەنگیشەوە بریتی‌یە (٥٧٪).

١٤-نیشاندەری بەراوردکردنی هەڵوێستەکانی کۆمەڵەی بەرگری لەگەڵ پەیامی خوێندکار لە بواری سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی‌دا بەڕێژەی سەدی.

هـەروەکو نیشـاندەرەکە نیشـانی دەدات هـەردو گروپەکـە لـە بـواری هەڵوێسـتی ئـابووری زۆرتریـن خـاڵی هاوبەشیان هەیە (٥٧٪). بـەڵام لـە رووی سیاسـیەوە خـاڵی هاوبەشـی نێوانیـان لـە ئاسـتێکی نزمدایـە (٢٥٪) و لـەرووی فەرهەنگیـەوە خـاڵی هاوبەشیان نی‌یە.

نیشاندەری بەراوردکردنی پشتیوانانی حزبوڵلا لەگەڵ پەیامی خوێندکار لە بواری سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی‌دا بەرێژەی سەدی.

هـەروەکو نیشـاندەرەکە نیشـانی دەدات پشـتیوانانی حزبولـلا پـەیامی خوێندکـار دیدگای هاوبەشیان هەیە. بەڵام لە رووی سیاسی و فەرهەنگی‌یەوە خاڵی هاوبەشیان نی‌یە.

## نیشاندانی گرافیکی خاڵە هاوبەشەکانی باڵە سیاسیەکان:

لەم بەشەدا خاڵی هاوبەشی باڵە سیاسیەکان بەپێی دیدگا سیاسـی و ئـابووری و فەرهەنگیەکان بە هیستۆگرام نیشان دەدرێ.

١-هیسـتوگرامی خاڵـە هاوبەشـەکانی کۆمەڵـەی رۆحانیـەتی خـەباتگێرو.. لەگـەڵ هەموو باڵەکاندا.

هـەروەکو لـە هیسـتـۆگرامەکەدا بـەدی دەکـرێ، پشـتـیوانانی حزبوڵـڵا بـە بـەراورد لەگـەڵ هـەموو باڵـەکاندا بـەرزترین خـاڵی هاوبەشـی لەگـەڵ کۆمەڵـەی ڕۆحانیـەتی خـەباتگێڕو.. دا هەیە (٢٠ ئیمتیاز لـە کۆی ٣٠ ئیمتیـان) و پاش ئـەویش، کۆمەڵـەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشی ئیسلامی (١٨ ئیمتیازی) هەیە. پەیامی خوێندکار بە (٣) ئیمتیاز لەکۆی ٣٠ ئیمتیاز کەمترین خاڵی هاوبەشی لەگەڵ کۆمەڵەی ڕۆحانیەتی خەباتگێڕ هەیە. کارگوزاران و ڕۆحانیـە خـەباتگێڕەکانیش بـە (٤،٥) ئیمتیـاز خـاڵی هاوبەشی کەمیان لەگەڵ کۆمەڵەی ڕۆحانیەتی خەباتگێڕدا هەیە.

٢-هیستوگرامی خاڵە هاوبەشەکانی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. لەگەڵ هەموو باڵەکاندا.

هـەروەکو هیستوگرامەکە نیشانی دەدات. پـەیامی خوێندکار بـە بـەراورد لەگـەڵ هەموو باڵەکاندا زۆرترین خاڵی هاوبەشی لەگەڵ ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکاندا هەیە. واتە (٢٤) ئیمتیاز. گرووپی کارگوزارانیش بە (١٦) ئیمتیاز لەکۆی (٣٠) ئیمتیاز لـەدوای پەیامی خوێندکـار بـە پلـەی دووەم دێـت. کۆمەڵـەی بـەرگری لـە بـەهاکان و پشـتـیوانانی حزبوڵـڵاش پلـەی سـێیەم و چوارمیـان هەیـە (٩،١٣) ئیمتیـاز، بـەڵام کۆمەڵـەی ڕۆحانیـەتی خـەباتگێڕ بە (٥) ئیمتیاز، بـە بـەراورد لەگـەڵ هـەمو باڵـەکاندا کەمترین خاڵی هاوبەشی لەگەڵ ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکاندا هەیە.

٣-هیستوگرامی خاڵە هاوبەشەکانی کارگوزاران لەگەڵ هەموو باڵەکاندا.

هەروەکو هیستوگرامەکە نیشانی دەدات، پەیامی خوێندکار بە بەراورد لەگەڵ هەموو باڵەکاندا، بەرزترین خاڵی هاوبەشی لەگەڵ کارگوزاراندا هەیە (٢١ ئیمتیان). ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکانیش بە (١٦) ئیمتیاز لەکۆی (٣٠) ئیمتیاز لە خاڵی هاوبەشدا بە پلەی دووەم دێن. بەلام کۆمەڵەی ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو.. و کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکان بە (٥،٤) ئیمتیاز لەگەڵ کارگوزاراندا خاڵی هاوبەشی کەمیان هەیەو پشتیوانانی حزبوڵلا بەبێ ئیمتیاز لەگەڵ کارگوزاراندا هیچ خاڵێکی هاوبەشیان نیيە.

٤-هیستوگرامی خاڵی هاوبەشی کۆمەڵەی بەرگری لەگەڵ هەموو باڵەکاندا.

هەروەکو هیستۆگرامەکە نیشانی دەدات پشتیوانانی حزبوڵلا بە بەراورد لەگەڵ هەموو باڵەکانی دیکەدا زۆرترین خاڵی هاوبەشی لەگەڵ کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکاندا هەیە (١٩) ئیمتیاز. کۆمەڵەی ڕۆحانیەتی خەباتگێڕ بە ئیمتیازێك کەمتر لە دوای پشتیوانانی حزبوڵلا بە پلەی دووەم دێت.

ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و پەیامی خوێندکار بە (٨،١٣) ئیمتیاز لە کۆی ٣٠ ئیمتیاز بە پلەی سێیەم و چوارەم دێن. کارگوزارانیش بە بەراورد لەگەڵ هەموو باڵەکاندا کەمترین خاڵی هاوبەشی لەگەڵ کۆمەڵەی بەرگری هەیەو بە (٥) ئیمتیاز بە دوا پلە دێت.

٥-هیستوگرامی خاڵە هاوبەشەکانی پشتیوانانی حزبوڵلا لەگەڵ هەموو باڵەکاندا.

هەروەكو هستۆگرامەكە نیشانی دەدات، كۆمەڵەی رۆحانیەتی خەباتگێڕ بە (٢٠) ئیمتیاز بە بەراورد لەگەڵ هەموو باڵەكاندا زۆرترین خاڵی هاوبەشی لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵلادا هەیە. كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكانیش بە ئیمتیازێك كەمتر، لەم رووەوە لە پلەی دووەمدایە (١٩) ئیمتیاز. بەڵام ئەنجومەنی رۆحانیە خەباتگێڕكان و.. بە (٩) ئیمیتاز و پەیامی خوێندكار بە (٧) ئیمتیاز لەكۆی (٣٠) ئیمتیاز خاڵی هاوبەشی كەمیان لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵلادا هەیە. گرووپی كارگوزارانیش هیچ خاڵێكی هاوبەشی لەگەڵ پشتیوانانی حزبوڵلادا نییە.

٦-هیستوگرامی خاڵە هاوبەشەكانی پەیامی خوێندكار لەگەڵ هەموو باڵەكاندا:

هەروەكو هیستوگرامەكە نیشانی دەدات ئەنجومەنی رۆحانیە خەباتگێڕەكان و.. بە (٢٤) ئیمتیاز بە بەراورد لەگەڵ هەموو باڵەكاندا، زۆرترین خاڵی هاوبەشی لەگەڵ پەیامی خوێندكاردا هەیە. لەدوای ئەو كارگوزاران بە (٣) ئمیتیاز كەمتر (٢١) ئیمتیاز بە پلەی دووەم دێت. كۆمەڵەی بەرگری لە بەهاكان و پشتیوانانی حزبوڵلا یەك لەدوای یەك بە (٨،٧) ئیمتیاز خاڵێ هاوبەشی كەمیان لەگەڵ پەیامی خوێندكاردا هەیەو رۆحانیەتی خەباتگێڕ بە ٣ ئیمتیاز كەمترین خاڵی هاوبەشی لەگەڵ پەیامی خوێندكاردا هەیە.

## ئه نجام گیری

بوارەکانی ئابووری و فەرهەنگ و سیاسەتی کۆمەڵگا گۆتەی لەیەك جیاو بە یەکتری نامۆنین. هەر نموونەیەکی ئابووری پێویستی بە نموونەی هاوچەشنی خۆی هەیە لە بواری فەرهەنگی و سیاسیدا. ناتوانین لە بواری ئابووریدا باوەڕمان بە لیبرالیزم هەبێ بەڵام لە بواری فەرهەنگ و سیاسەتدا لایەنگری سیستمی داخراو بین. بەم پێیە هەروەکو لە پێشدا ئاماژەی بۆ کرا. پرسیاری سەرەکی لێکۆڵینەوە کە ئەوەیە کە ئایا هەڵوێستی ئابووری و فەرهەنگی باڵەکان لە نیزامی کۆماری ئیسلامی ئیران لە ڕەوتی چالاکی سیاسی و سەبارەت بە ڕادەی کار لێکردنی لە گۆڕانکارییە سیاسیەکان لە نیزامی کۆماری ئیراندا لە ڕەوتی چالاکی سیاسی و سەبارەت بە ڕادەی کار لێکردن لەسەر گۆڕانکارییە سیاسیەکان پەیڕەوی یەك ڕێباز ناکەن. ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە ئەوە دەردەخات کە گریمانەکە سەبارەت بە هەندێ لە باڵەکان تەئید دەکرێت و سەبارەت بە هەندێکی دیکەیان ڕەت دەکرێتەوە.

باڵی کۆمەڵەی ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو ڕێکخراوە هاو ئاراستەکانی لە ڕووی سیاسیەوە باوەڕی بە سیستمی داخراو هەیە، بەڵام لە ڕووی ئابوورییەوە باوەڕی بە سیستمی بازاڕی ئازادو لە ڕووی فەرهەنگییەوە باوەڕی بە سیسمی داخراو هەیە. بەم پێیە گریمانەکە سەبارەت بەم باڵە ڕاست دەردەچێ.

باڵی ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و گروپە وابەستەکانی لە ڕووی سیاسیەوە باوەڕی بە سیستمێکی تاڕادەیەك کراوە هەیە، لە ڕووی ئابوورییەوە پشتیوانی لە سیستمی داخراو و کۆنترۆڵ کراو دەکات و لە ڕووی فەرهەنگیەوە باوەڕی بە سیستمی کراوە هەیە. گریمانەکە سەبارەت بەم گروپەش ڕاست دەردەچێت.

گروپی کارگوزان لە ڕووی سیاسیەوە باوەڕی بە سیستمی کراوە هەیەو لە ڕووی ئابوورییەوە پشتیوانی لە سیستمی بازاڕی ئازاد دەکات و لە ڕووی فەرهەنگیشەوە

بـاوەڕی بـە سیسـتمی کـراوە هەیـە. بـەم پێـیـە گریمانەکـە سـەبارەت بـەم گروپە راست دەرناچێ.

کۆمەڵـەی بـەرگری لـە بـەهاکان لـە رووی سیاسـیەوە بـاوەڕی بـە سیسـتمێکی تاڕادەیـەك داخـراو هەیـەو لـە رووی ئابووریـیـەوە دژی سیسـتمی بـازاڕی ئـازادەو تاڕادەیـەك پشـتیوانی لـە دەسـت وەردانـی دەوڵـەت لـە ئـابوری دەکـات و لـە رووی فەرهەنگیەوە باوەڕی بە سیستمی داخراو هەیـە. گریمانەکـە سـەبارەت بـەم باڵـەش راست دەرناچێ.

باڵی پشتیوانانی حزبوڵلا لە رووی سیاسیەوە باوەڕی بە سیستمی داخراو هەیە، لە رووی ئابوورییەوە پشتیوانی لە دەست وەردانی دەوڵەت لە ئابووری دەکات و لە رووی فەرهەنگیەوە باوەڕی بە سیستمی داخراو هەیە. بەم پێیە گریمانەکە سەبارەت بەم باڵەش راست دەرناچێ.

گروپی پـەیامی خوێندکار لـە رووی سیاسـیەوە پشـتیوانی لـە سیسـتمی کـراوە دەکات، لە رووی ئابوورییەوە باوەڕی بەدەست وەردانـی دەوڵـەت هەیـە لـە ئـابووری و لەرووی فەرهەنگیەوە پشتیوانی لە سیستمی کراوە دەکات. گریمانەکە سەبارەت بە باڵە راست دەردەچێت.

هـەروەکو شـەرح کـرا گریمانـەی لێکۆڵینەوەکـە سـەبارەت بـە سـێ بـاڵ راسـت دەردەچێت. راست دەرچوونی گریمانەکە سەبارەت بە چەند باڵێك لە نیزامی کۆماری ئیسلامی ئێراندا گوزارشت لەوە دەکات کە لە ئێراندا سەبارەت بە چالاکی سیاسی هەل و مەرجێکی تایبەتی لە ئارادایە. دەشێ دو باڵ لە دوو بواردا هیچ جۆرە خاڵێکی هاوبەشیان لە نێواندا نەبێت، بەڵام لە بوارێکدا بە تەواوی دیدگایـان لەیـەك بچـێ، هـەروەکو ئـەوەی کـە هـەر دوو گروپـی کـارگوزاران و پـەیامی خوێندکـار لـە رووی سیاسیەوە دیدگایان بە تەواوی لە یەك دەچێ، بەڵام لە رووی ئابوورییەوە هیچ جۆرە خاڵێکی هاوبەشیان لە نێواندا نییە. باڵی پشتیوانانی حزبوڵلاو پەیامی خوێندکار لە رووی سیاسی و فەرهەنگیەوە هیچ جۆرە خاڵێکی هاوبەشیان لە نێواندا نییە بەڵام

هەڵوێستی ئابوورییان بە تەواوی لەیەك دەچێ. باڵی ڕۆحانیەتی خەباتگێڕو کارگوزاران لە ڕووی هەڵوێستی سیاسی و فەرهەنگیەوە خاڵی هاوبەشیان لە نێواندا نیی‌یە. بەڵام لە ڕووی ئابوورییەوە زیاتر (٥٧٪) خاڵێ هاوبەشیان لە نێواندایە.

ئەم بارە بە بەراوردکردنی تەواوی باڵەکانیش لەگەڵ یەکتری‌دا بەدی دەکرێ. (بگەڕێرەوە بۆ خشتەی ژمار ٣٨) ئەم بارە ئەوە نیشان دەدات کە زۆر لە باڵەکان لە بواری سیاسی و ئابووری و فەرهەنگی‌دا پەیڕەوی یەك سیاسەت ناکەن. کە تا ئەم ڕادەیە سنووروو خاڵی هاوبەش و جیاواز لە هەڵوێستەکانیاندا بەدی دەکرێ. ئەنجامی بارێکی لەو جۆرە ئەوەیە کە لە گۆڕەپانی چالاکیە سیاسی‌یەکانی ئێراندا، ئەگەری ئیئتلاف یان هاوکاری هەمەلایەنەی باڵەکان لەگەڵ یەکتری‌دا کەمە. تەنها لەیەك حاڵەتدا (ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان و.. پەیامی خوێندکار) ئەوە بەدی دەکرێ کە دوو گروپ لە ٣ بواری سیاسی و ئابووری و فەرهەنگی‌دا زیاتر (٧٥٪) خاڵێ هاوبەشیان لە نێواندایە. ئەمەش لە کاتێکدا کە بە بەراوردکردنی هەموو باڵەکان لەگەڵ یەکتری‌دا بارێکی لەو جۆرە بەدی ناکرێ. بەم پێ‌یە وا دێتە بەرچاو ئەگەر باڵەکان لە ماوەیەکدا هاوکاری لەگەڵ یەکتری‌دا بکەن، ئەم هاوکارییە پایەدار و درێژخایەن نابێت و لەگەڵ نەمانی پێویستی‌دا، هاوکاری باڵەکان لەگەڵ یەکتری‌دا دەوەستێ.

تایبەتمەندی‌یەك کە لە لێکۆڵینەوەی باڵە سیاسیەکان لە نیزامی کۆماری ئیسلامی‌دا بەدی دەکرێ، ئەوەیە کە زیاتر لەوەی چەند هەڵوێستێکی دیاری‌کراو بووبێتە هۆی فۆرمەڵەبوونی باڵەکان، کەسایەتیەکان لە فۆرمەڵەبوونی باڵەکان یان سیاسەتەکانیان ڕۆڵی سەرەکیان هەیە. لە کۆمەڵەی ڕۆحانیەتی خەباتگێڕدا مەهدەوی کنی، لە ئەنجومەنی ڕۆحانیە خەباتگێڕەکان کەڕوبی و خوییینیەکان، لە کارگوزاراندا هاشمی ڕەفسنجانی لە کۆمەڵەی بەرگری لە بەهاکانی شۆڕشدا ری شەهری، لە پشتیوانانی حزبوڵڵا ئەڵلاکەرەم و لە پەیامی خوێندکاردا طبرزدی، دەوری سەرەکیان لە سیاسەتی باڵ یان گروپەکەی خۆیاندا هەیە. وەزعێکی لەو جۆرە دەبێتە هۆی ئەوەی کە سیاسەتی باڵ و گروپەکان لە سەرەوە دابڕژێرێ و کەمتر بواری گفتوگۆ لە ئاستەکانی خوارەوەدا بڕەخسێ بۆ هەڵوێست وەرگرتن و هەتا ئەگەر گفتوگۆیەکی لەو جۆرە دروستیش ببێ، ئەوانە لەژێر کاریگەری هەڵوێستی ڕابەرانی گروپ و

باڵەکانی خۆیاندا دەبن. و هەتا وەزعێکی لەم جۆرە بەردەوام بێت ئەگەری ئەوە کەمە کە لە کۆماری ئیسلامیدا چالاکی سیاسی لە وەزعی باڵەوە بگۆڕێ بۆ حزبی. هەتا لەکاتی دامەزراندنی حزبیشدا، پێکهاتەی ئەو حزبانە لەوکاتە دەچێت کە لە ژێر ناونیشانی باڵدا چالاکیان دەنواند. لەلایەکی دیکەوە ئەم بارودۆخە ئەگەری پایەداری هەڵوێستی باڵەکان بە درێژایی کات کەم دەکاتەوە. هەروەکو لە بەشی دووەمدا ئاماژەی بۆ کرا، هەڵوێستەکانی پەیامی خوێندکار لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا، بەشێوەیەکی بەرفراوان گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

پێدەچێت ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی دیکە لە بواری لێکۆڵینەوەی ڕێکخراو و باڵە سیاسییەکانی ئێراندا بتوانێت تا رادەیەك ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە کە لە بواری خوێندنەوەی کۆمەڵناسی سیاسیدا هەیە لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا. لەم بارەیەوە پێشنیازی ئەم بوارانەی خوارەوە دەکەم بۆ لێکۆڵینەوە.

١-لێکۆڵینەوەی جیاوازی دیدگای کەسانی وابەستە بەیەك باڵ لەگەڵ هەڵوێستی گشتی ئەو باڵەدا.

٢-لێکۆڵینەوەی هەڵوێستی باڵەکان لە بواری سیاسی و ئابووری و فەرهەنگیدا بە درێژایی مێژووی ژیانیان.

٣-بەراوردکردنی کردەوەی باڵەکان لە سەردەمانێکدا کە لە دەسەڵاتدا بوون لەگەڵ ئەو ئامانج و دیدگایانەی تەرحیان کردووە لە کاتێکدا کە لە دەرەوەی دەسەڵاتدا بوون.

٤-بەراوردکردنی دیدگاکانی چەپی کۆن و چەپی نوێ.

٥-بەراوردکردنی دیدگاکانی کارگوزاران و ئەو کەسانەی کە خۆیان بە "میانەڕەوی مودێرن" دەزانن.

## زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

## سالّی ٢٠٠١

| زنجیرە | ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێڕ |
|---|---|---|---|
| ٩٤ | خەونە ترسناکەکانی یوسف | بەرزان فەرەج | |
| ٩٥ | سەرەتاکانی سۆسیۆلۆژیا | | شوان ئەحمەد |
| ٩٦ | عێلی جاوان | د. مستەفا جەواد | م. جمیل ڕۆژ بەیانی |
| ٩٧ | هێماگەریەتی | | پێشڕەو حسێن |
| ٩٨ | دەروازە | | هەڵکەوت عەبدولا |
| ٩٩ | زۆربا | نیکۆس کازانتزاکیس | ڕەووف بێگەرد |
| ١٠٠ | بینای هونەری چیرۆکی کوردی | پەرێز سابیر محەمەد | |
| ١٠١ | دەڕۆم پێکەنینی دەریا ببینم | سەلاّح گوڵ ئەندامی | |
| ١٠٢ | بزوتنەوەی ڕوانگەو شیعری نوێی کوردی | شادمان قادر حەسەن | |
| ١٠٣ | چیرۆکی وڵاتە دوورەکان | | حەمە ڕەشید |
| ١٠٤ | زمان و زانستی زمان | | د.محەمەد مەحویی |
| ١٠٥ | چەند شانۆنامەیەك بۆ منالاّن | | فاروق هۆمەر |
| ١٠٦ | شانۆگەریەکانی سلێمانی لە سالاّنی (١٩٢٦-١٩٦١)دا | یاسین قادر بەرزنجی | |
| ١٠٧ | گۆڤاری (دیاری کوردستان) | ئا: ڕەفیق سالّح | |
| ١٠٨ | وا بەهار هات | حاجی جوندی | جەلال دەباغ |
| ١٠٩ | لەگەڵ ئەقڵی خۆرئاوادا | | ئازاد بەرزنجی |
| ١١٠ | زەردەشت وای گوت | فردریك نیتشە | ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی |
| ١١١ | پیاوە سپییەکە | | خەبات عارف |
| ١١٢ | دەفتەری شیعر | لەیلان سەعدەدین | مەهاباد صالّح |
| ١١٣ | بنەماکانی فسیۆلۆژی مرۆڤ | ئەکرەم قەرەداغی | |
| ١١٤ | وانەی ئەم سەدەیە | کارل پۆپەر | شۆڕش جوانڕۆیی |
| ١١٥ | کوردەکان | حەسەن ئەرفەع | سەردار محەمەد |

نرخی (٣٠) دینارە